ENDÊSE

ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

پرۆژەی نامە ئاکادیمییەکان

# دوالیزمی دژیەك لە هۆنراوە لیریکییەکانی مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزیدا

لهۆن قادر عەبدولڕەحمان

ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: دانا مەلا حەسەن
بەڕێوەبەری هونەری: باسم ڕەسام

ناوی کتێب: دوالیزمی دژیەک لە هۆنراوە لیریکییەکانی
مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزیدا
ناوی نووسەر: لەیلا قادر عەبدولڕەحمان
بابەت: لێکۆڵینەوە
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٤
چاپخانە: رجایی/ تاران
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (٨٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٥٤٨)ـی ساڵی (٢٠١٤)ـی پێدراوە.

ISBN: 978-1-63068-989-6

ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم
www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com
http//www.facebook.com/Andeshacenter
07501026400

## پێشکەشە بە

ڕۆحـــی ســـەرجەم ئەو عـــارفە گەورانەی بە ســـووتانی خۆیـــان ژیانیـــان ڕاڤەکرد، لە دڵی تاریکییدا چرای ڕووناکییان هەڵکـرد... پێشکەشـە بە ڕۆحـــی مەولانـــا ، مەولەوی و هەمـــوو ئەو بەڕێـــزانەی وەک مامۆســـتا قەرزاریـــانم، بەتـــایبەتی مامۆســـتا و سەرپەرشـــتیاری ئەم نـــامەی ماسـتەرەم، زۆر بەڕێـز (د. ئەنـوەر قـادر) کە بەڕاسـتی بـۆ مـن بـووە دەروازەی ژیانێـکی نوێ.

## سوپاس و پێزانین

○ سوپاس و ڕێزی تایبەتیم بۆ بەڕێز پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.ئەنوەر قادر محەمەد، کە ئەرکی سەرپەرشتی ئەم نامەیەی گرتە ئەستۆو لەگەڵم ماندوو بوو.

○ سوپاس و پێزانینم بۆ بەڕێز پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.دڵشاد عەلی محەمەد، سەرۆکی لیژنەی خوێندنی باڵا.

○ سوپاس و ئەمەك و پێزانینی زۆرم بۆ سەرۆکی بەشی کوردی و هەموو ئەو مامۆستا بەڕێزانەی، کە لە بەکالۆریۆس و ماستەریش دا وانەیان پێگوتووم و ماندووبوون لەگەڵم.

○ سوپاس و پێزانینی زۆرم بۆ کارمەندانی کتێبخانەی ناوەندی زانکۆو کتێبخانەی کۆلیژی زمان‌و کتێبخانەی گشتی سلێمانی، کە دڵسۆزانە یارمەتیدەرم بوون.

○ سوپاس بۆ هەموو ئەوانەی بەشێوەیەك لە شێوەکان یارمەتیدەرم بوون.

○ ڕێزو پێزانینم بۆ خانەوادەکەم، کە بەگشتی هاندەرو هاوکارم بوون.

# پێڕست

# پێشەکی

لێکۆڵینــەوەی لایــەنێکی شــیعری لیریکیــی دوو شــاعیری دیــاری ڕۆژهــەڵات کارێکی ئاسان نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەبـەر ڕۆشـنایی چـەمکی "دوالیزمـی دژیەک"دا ئێمە ئەم هەوڵەمان داوە.

مــەولانا جەلالــەدین ڕۆمــی (١٢٠٧ – ١٢٧٣ز) عــارف و شــاعیری گــەورەی ئێران، کـە بەگشـتی خـاوەنی پـتر لـە (٦٥) هـەزار بەیتـە شـیعرە لـە (مثنـوی و معنوی) و (دیـوان شمس)ەکەیـدا، نـەك تـەنها بووەتـە مایـەی دەوڵەمەنـدکردنی ئەدەبی عیرفانی و ئەدەبیات لە ئێـران و دواتـریش لـە تورکیـادا، بـەڵکو هـەموو سـنوورەکانی جیـاوازی زمـانو ئـایینو کولتـووری بڕیـوە. دەتـوانین بڵـێین: مەولانای ڕۆمی، ئەمڕۆ شاعیرێکی دێرینی نـوێی جیهـانی مرۆڤایەتیـە بـەجۆرێك، کـە هۆنراوەکـانی چـەندینجار بـە زمانـەکانی ئینگلیـزی، ئـەڵمانی، فەرەنسـی، عـەرەبیو... هتـد، چـاپ کراونەتـەوە. چـەندین بیریـاری ناوچـەییو جیهـانیی سـەرقاڵی لێکۆڵینـەوەن لـە مـەولانا و مـەولانای ڕۆمـی بووەتـە ڕێچـکە و ڕۆشـنکەرەوەی چـەندین گرێکـوێرەی فیکـری و لاهوتیانـە، بـەجۆرێك، کـە لـە سەدەی نۆزدەیەمـەوە کاریگـەری لەسـەر تیـولۆجیـای ڕۆژئاواییـە و لـە بـواری لێکۆڵینـەوەی ئەدەبیشـدا، دەیـان نووسـەری وەك (نیکلسـون) و (ئـارتۆر جـان ئـاربێری) و (ولیـام چیتیك) و (ئانـێ مـاری شمیـل) و (ئا.ف.ئەکیموشـکین) و

(شفیعی کدکنی) و (فروزانفر) و...هتد، بە لێکۆڵینەوەکانیان لەسەر مەولانا بوونەتە کەسایەتیەکی دیاری بواری لێکۆڵینەوەی ئەدەبی.

سەبارەت بە مەولەوی تاوەگۆزی (١٨٠٦ – ١٨٨٢ن) عارف و شاعیری گەورەی کورد، کە بەگشتی خاوەنی پتر لە هەشت هەزار بەیتە شیعرە بە زمانەکانی کوردی، فارسی، عەرەبی، ئەگەر چی مەولەوی وێڕای سوتانی زۆرێك لە بەرهەمەکانی و نەبوونی هەلومەرجێکی لەبار، لە شێوەی مەولانای ڕۆمی، کە ئەویش ماف و پێگەی شیاوی خۆی پێبدرێت لە ئەدەبیاتی ناوچەیی و جیهانیدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو بناغە بەهێز و زەمینە بەپیتەیە، کە بەردەوام سەرچاوەی چەندین لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی و بەڵگەی، یاخود ئاماژەی تایبەتمەندییەکانی لیریکی ئاسایی و سۆفی و ئەدەبیاتی عیرفانی کوردییە. ئەمە جگە لەوەی، بەردەوام بە پێوەر و بەها ڕەخنەییەکانی ڕابردوو و مۆدێرنیش، هۆنراوەکانی مەولەوی هەردەم سەرچاوەی دۆزینەوە و پەیبردنن بە چەندین شێوازی هونەری باڵای دەربڕین.

ئەم دوو شاعیرە زانا و عارفە، هەموو زەمەنەکانیان بڕیوە و نەك تەنها لەڕووی بابەتەوە کاریگەریان هەیە لەسەر ئەدەبیاتی نوێ، بەڵکو لەڕووی هونەری دەربڕین و چێژ و زەوقیشەوە، لەم سەردەمە نوێیەشدا، پێشەنگن.

## ئەرکی ئەم لێکۆڵینەوەیە:

ئەم دوو شاعیرە مەزنە بەو گیانە سۆفیو هیومانیستیەی، کە هەیانە، بوونەتە زەمینەی پراکتیکی بۆ لێکۆڵینەوە لە هونەرێکی دەربڕین، کە ئەویش (دوالیزمی دژیەك)ە، کە چەمکێکە وێڕای ڕەسەنایەتی و بوونی ڕەگوڕیشەی لە ڕەوانبێژی و جیهانبینی عیرفانیدا، ئەمڕۆ وەك ستایلێکی دەربڕین و تەنانەت

وەك شێوازێکی ڕاڤە و شیکاری و بەها بەخشین بە دەق، لە ئەدەبی مۆدێرنی ڕۆژئاواییدا بووە و بایەخی هەیە. بۆیە ئەرکی ئەم لێکۆڵینەوەیە، جگە لە ئاشنایەتیمان بە چییەتی (دوالیزمی دژیەك) لە سەرجەم بوارەکانی مەعریفەدا، بەشێوەیەکی پراکتیکی کردوومانەتە هۆی ڕاڤەکاری و تێگەیشتن بۆ زۆر لە مانای هۆنراوەکانی مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزی.

## سەرچاوە بنەڕەتی و تیۆرییەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە:

(دیوانی کبیر)، یاخود (کلیات شمس)ی مەولانای ڕۆمی، کە بە چوارینەکانیەوە پتر لە (٤٠,٢٣٦) بەیت هۆنراوەیەو دیوانی مەولەوی تاوەگۆزی، کە لە کۆکراوەکەی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسدا (٢٤٢٦) بەیت هۆنراوەیە، سەرچاوەی بنەڕەتی بەدواداچوون و لێکۆڵینەوەی پراکتیکیمان بووە و سەبارەت بە بەشە تیۆرییەکەی بابەتی (دوالیزمی دژیەك)یش، بەشێوەیەکی گشتی پشت ئەستوور بووین بە چەندین کتێب و سەرچاوە و لێکۆڵینەوەی جیاواز بەتایبەتی لە زمانی فارسیدا، چونکە جگە لەوەی بە زمانی کوردی لێکۆڵینەوەی لەوجۆرەمان بەرچاو نەکەوت و لە عەرەبیشدا تەنها لە بوارە زمانەوانیەکەیەوە هەندێ لێکۆڵینەوەمان پەیدا کردووە و بە زمانی ئینگلیزیش، بەو هێندە سوودمان لە بەرهەمە وەرگێڕدراوەکان وەرگرتووە، کە پەیوەستبوو بە بابەتی دوالیزمی دژیەك و ئەدەبی مۆدێرنەوە، چونکە زەمینەی مەعریفی ئەم دوو شاعیرە عیرفان بوو، کە تایبەتمەندی ترادسیۆن و ئەدەبی کلاسیکی ئەم ناوچەیەیە.

## میتۆدی لێکۆڵینەوەکە:

میتۆدی لێکۆڵینەوەکەی ئێمە، کە تا ئاستێکی باش ناساندنی (دوالیزمی دژیەک)ە، وەک زاراوەیەکی فەلسەفی و ئەدەبی عیرفانی، هاوکات بەشێوەیەکی پراکتیکی و زانستی سودی لێ وەرگیراوە بۆ توێژینەوەی دەق، هەروەها چەمکێکی بنەڕەتیی بونیادگەرییە بەگشتی، بۆیە دەشێ بە میتۆدێکی بونیادگەرانەی کراوە و تەواوکارانە لە قەڵەمی بدەین.

## بایەخی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەڕووی تیۆری و پراکتیکەوە بۆ ئەدەبناسیی کوردی:

لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئەدەبناسی کوردی ئاشنایەتیەکی نوێی بۆ دروست دەبێت بە (دوالیزمی دژیەک)، کە پێشتر تەنها وەک دژیەک (طباق) و بابەتێکی ڕووکەشی نێو ڕەوانبێژی کۆن ناسیویەتی، ئاشنایەتیەک، کە پەیبردنە بە ستایلێکی نوێی دەربڕین و بەهای نوێی نرخاندنی دەق، پەیبردنە بە عیرفان، نەک تەنها وەک زەمینەیەکی جیهانبینی، بەڵکو وەک بنەڕەتێکیش بۆ ئەفراندنێکی هونەری.

دەرخستنی دیوێکی دیکەی تایبەتمەندی ئیستاتیکیی ئەدەبیاتی کوردییە، کە تەنانەت لە سەردەمی هاوچەرخیشدا هەڵگری بەهاکانی هونەر و ئیستاتیکایە.

دواجار لەم لێکۆڵینەوەیەدا، ئەدەبناسی کوردی کێبڕکێ و بەراوردی نێوان شاعیرێکی کوردی وەک مەولەوی دەبینێت لەگەڵ شاعیرێکی گەورەی وەک مەولانای فارس دا، کە بێگومان لەڕووی هونەرەکانی دەربڕین، ناوەڕۆک و

بابەتەوە، زیاتر پەی بە گەورەیی مەولەوی تاوەگۆزی دەبەین. بەو هیوایەی توانیبێتمان مشتێك بخەینە سەر مەلۆی توێژینەوەی زانستیی ئەدەبیاتی کوردی.

## پێکهاتەی لێکۆڵینەوەکە:

ئەم لێکۆڵینەوەیە لە پێشەکی و سێ بەش و ئەنجام پێکهاتووە و لە کۆتاییشدا ئاماژەمان بەو سەرچاوانە داوە، کە بۆ پشتڕاستکردنەوەی بۆچوونەکانمان وەك بەڵگە بەکارمان هێناون، جگە لە ئەنجام و پوختەیەکی لێکۆڵینەوەکە، کە بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی نووسراوە:

### بەشی یەکەم:

وێڕای پێناساندنێکی کورتی زمانەوانی و فەرهەنگی (دوالیزمی دژیەك) و بەراوردی نێوان جۆرەکان، باسی ڕەگ و ڕیشە و تایبەتمەندی دوالیزمی دژیەك کراوە لە سەرجەم بابەتەکانی مەعریفەدا، کە بەدرێژایی مێژوو تیۆلۆجیا و هەمووئایینەکانی زەمینی و ئاسمانیان باسکردووە. پاشان کێومالێکی ئەم بابەتەمان کردووە لە فەلسەفەی کلاسیك و مۆدێرندا: لە کۆتایی ئەم بەشەدا باسی بەهای ئەدەبی دوالیزمی دژیەکمان کردووە لە ئەدەبیاتی کلاسیك، هاوچەرخ، عیرفانی و تەسەوفدا.

### بەشی دووەم:

لەم بەشەدا بەشێوەیەکی پراکتیکی و بە سوودوەرگرتن لە هەندێ بابەتی ڕەوانبێژی، سەرەتا دوالیزمی دژیەکمان دابەشکردووە بۆ (واتایی) و (ڕۆنانی)، دواتر هەرکامیان دابەشکراون بۆ جۆرەکانی ناوەڕۆکی و ڕووخساری

ئیستاتیکی، یاخود جوانناسی، پاشان جۆری دووەمیشیان بۆ هونەرەکانی دەربڕین و جوانکاری و دواجار هەرکام لەوانیش بۆ چەند جۆرێك، کە بێگومان هەموو ئەو جۆرانەش دابەشبوون بۆ دوو چەشن، کە لە یەکێکیاندا وشە دوالیزمەکان ئاشکران و لەوی دیکەیاندا شاراوەیە. بۆ هەموو ئەم جۆرانە (١١٣) بەیت شیعری مەولانا و مەولەویمان وەکو بەڵگە هێناوەتەوە و لەسەر بنەمای دوالیزمی دژیەك شیکاری و ڕاڤەمان بۆ کردوون.

**بەشی سێهەم:**

لەم بەشەی کۆتاییدا لە ڕوانگەی ئیستاتیکییەوە باسمان لە دوالیزمی دژیەك کردووە. سەرەتا لە پێناسە و سروشتی ئیستاتیکا و چۆنیەتی جوانی هونەری دوالیزمی دژیەك لە شیعردا و کاریگەری خەیاڵ وەك کەرەسەیەکی ئیستاتیکیی لە دەربڕینی دوالیزمی دژیەکدا دواوین، پاشان بە جەختکردنەوەیەکی زیاترەوە لە ئیستاتیکای پارادۆکس و میوزیکی شیعری وەك ڕەهەندێکی ئیستاتیکیی دوالیزمی دژیەك نووسیومانە. لە کۆتاییدا هۆکارەکانی ڕەنگدانەوەی دوالیزمی دژیەکمان لە هۆنراوەکانی مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزی دا خستووەتەڕوو، کە بۆ ئەم بەشەش (١١٠) بەیت شیعری ئەو دوو شاعیرەمان وەك بەڵگە هێناوەتەوە و ڕاڤەیەکی ئیستاتیکییانەمان بۆ کردووە.

لە کۆتاییشدا ئەو ئەنجامانەی، کە لەکاتی توێژینەوەکەدا پێی گەیشتوون بە پوختی و کورتی خراونەتەڕوو.

## ١/ دوالیزمی دژیەك لە بابەتە جیاوازەكانی مەعریفەدا

### ١-١/ ناساندنێكی زمانەوانی و فەرهەنگی دوالیزمی دژیەك:

كۆی ئەو بابەت و لێكۆڵینەوانەی، كە وەك سەرچاوە، لەم لێكۆڵینەوەماندا بەرچاومان كەوتوون، خوێنەری لەبەردەم چەند چەمك و زاراوەیەكی هاوشێوەو لەهەمانكاتدا جیاوازدا بەجێهێشتووە، كە بەكارهێنانی هەموویان پێكەوە وەك هاوواتا زانستیانە نین و لەهەمانكاتدا جۆرێك لە پەیوەندیش پێكەوە دەیانبەستێتەوە. ئێمە لەم لێكۆڵینەوەدا ئەگەرچی زاراوەی (دوالیزمی دژیەك)مان بەكارهێناوە، كە وەرگێڕانی دەستەواژەی ئینگلیزی ( Binary opposition)ە، بەڵام خاڵی نییە لە واتاو ئەركی زاراوەكانی تر و بەگشتی پەیوەند و پەیوەستن پێكەوە، كە هەندێك لەو زاراوانەی دیكە بریتین لە: (تضاد، تناقض، پارادۆكس، تقابل، تقابل تضایف).

سەرەتا هەریەك لەو زاراوانە، هێندەی پەیوەست بێت بە بابەتەكەمانەوە، ڕووندەكەینەوە و پاشان ئاماژە بە پەیوەندی و جیاوازیان دەدەین و دواجار باس لە دوالیزمی دژیەك دەكەین پەیوەست بەو زاراوانە و هۆی هەڵبژاردنی زاراوەی (دوالیزمی دژیەك) بۆ لێكۆڵینەوەكەمان دەخەینەڕوو.

١) تقابل: ئەمە وشەیەكی عەرەبییە، بەواتای بەرامبەر یەكبوونی دوانەیەك، یاخود لەبەرامبەر دانانو وەستانی دوانەیەك، ئەمە وشەیەكی گشتییە، كە

دەتوانین بیخەینە مەرەتای وشەکانی دیکەش بۆ نموونە (تقابل تضاد)، یاخود (تقابل تناقض) واتە بەرامبەربوونی دوودژ، یاخود بەرامبەربوونی دوو ناکۆك.

٢) تضاد: دەتوانین لە کوردیدا بە (دژیەك)بوون ناوزەدی بکەین، (عەبدولکەریم سروش) لە پێناسەی دژیەکدا دەڵێت: "هەرکات دوو ئاوەڵناومان هەبێت، کە نەگونجێن، لەیەك پێکهاتەدا کۆیان بکەینەوە، بەڵام گونجاوبێت هەردووکیان ڕەتکەینەوە، واتە نەگونجێت پێکەوەبن لەیەك کات و شوێندا، بەڵام گونجاو بێت هەردووکیان لادەین، لەم حاڵەتەدا دەڵێین ئەو دوو سیفەتە (تقابل) لەبەرامبەر یەکدان و لە جۆری (دژیەك)ن. بۆنموونە هەردوو ڕەنگی ڕەش و سپی، ناگونجێت لە تێڕوانین و گۆشەنیگای یەك کەس و لەیەك کات و شوێندا، دیوارێك سپی بێت و ڕەشیش بێت، بەڵام دەگونجێت هیچکامیان نەبێت"[1].

٣) تناقض: دەگونجێت (ناکۆك)ی بۆ بەکاربهێنین، "واتە دوو ئاوەڵناومان بۆ یەك بابەت هەبێت، کە نە کۆکردنەوەیان گونجاو بێت و نە وەلانان و ڕەتکردنەوەشیان، واتە نە بگونجێت ئەم دوو سیفەتە هەردووکیان لەیەك بابەتدا هەبن و نە گونجاویش بێت هیچکامیان نەبن، بەڵکو بەردەوام دەبێت یەکێکیان لەو بابەتەدا هەبن، ئەمەیە واتای – (النقیضان لا یجتمعان و لا یرتفعان) واتە دوو پێچەوانە هەردووکیان کۆنابنەوە و هەردووکیشیان پێکەوە و لەیەك کاتدا وەلا ناخرێن – نە دەکرێت هەردووکیان ببن و نە دەشکرێت هیچکامیان نەبن. هەموو جۆرەکانی (تناقض) لە ڕاستیدا و لە بنەڕەتدا لە

---

[1] عبدالکریم سروش، نقدی و در آمدی بر تضاد دیالکتیکي، انتشارات حکمت، چاپ اول، خرداد، ١٣٥٧ هـ.ش. ل١٢.

(بوون) و (نەبوون)ەوە سەرچاوەیان گرتووە. بۆنموونە (مرۆڤ) وەك بوونەوەرێك یان هەیە، یاخود نییە، ناگونجێت هەشبێت و نەشبێت، ناگونجێت هیچکامیشیان نەبێت، بەڵکو دەبێت یان هەبێت، یان نەبێت"[٢].

٤) پارادوکس (Paradox): کە لە وشەی لاتینی (Paradoxos) وەرگیراوە و لە بنەڕەتیشدا زاراوەیەکی یۆنانییە (Paradoxos)، کە پێکهاتووە لە (Para) بەواتای (بەرامبەر)، یاخود (تناقض) و (doxa)یش بەواتای بیروڕا، یاخود بیروباوەڕ دێت"[٣]. وەك سەعید سەبزیان لە فەرهەنگەکەیدا ئاماژەی پێدەکات: "گوتەیەکە، کە دوو ڕەهەندی هەیە و هەردووکیشی بە ڕووکەش دروستە، بەڵام، کە بەرامبەر یەك دادەنرێن هەڵبژاردنی یەکێکیان پێویستی بە نکوڵییە لەوەی دیکە"[٤].

بەکورتی ئاشتکردنەوەو کۆکردنەوەی دوو چەمکی ناکۆك، پێی دەوترێت پارادۆکس[٥]، لە فەرهەنگی ( dictionary of literary terms and literary theory)دا لە یەکێك لە پێناسەکاندا دەڵێت: "گوتە و باوەڕێکە پێچەوانەی باوەڕ و بیرکردنەوەی باوی پەسەندکراو"[٦].

---

[٢] عبدالكريم سروش، نقدى و در آمدى بر تضاد ديالكتيكى، ل١٢.

[3] J.A.Cuddon., The penguin dictionary of literary terms and literary theory, penguin books – London, six, p.205.

[٤] سعيد سبزيان مراد آبادى. فرهنگ نظريه و نقد ادبى، واژگان ادبيات و حوزەهاى وابستە، انتشارات مُرواريد، چاپ اول، ١٣٨٨، هـ.ش. ل٣٦٨.

[٥] رضا رشيدى، پارادوكس، سايتى هم انديشى زبان و ادبيات فارسى.

[6] J.A.Cuddon., p.205.

بەگشتی دەتوانین بڵێین، ئەگەر دوو چەمکی (تضاد) بدەینە پاڵ یەك، یاخود پێکەوە کۆیانبکەینەوە، ئەوا (تناقض) پێکدێت، بەلام ئەگەر بتوانین دوو (متناقض) پێکەوە کۆبکەینەوە ئەوا پارادۆکس پێکدێت[٧].

٥) تقابل تضایُف (بەرامبەرێکی پەیوەست بە یەك): واتە دوو سیفەت، کە ئەمانیش نەتوانرێت لەیەك بابەتدا پێکەوە کۆبکرێنەوە، بەلام لەهەمانکاتدا وەك چەمك و واتا پێکەوە پەیوەست بن، واتە بوونی ئەم پەیوەست بێت بە بوونی ئەوی دیکە. بۆنموونە واتای باوکبوون و کوڕبوون کەسێك ناتوانێت لەیەك کاتدا کوڕی کەسێك بێت و باوکیشی بێت، بەلام هەر ئەوکەسە دەتوانێت باوکی کەسێك بێتو کوڕی کەسێکی دیکە بێت، هەروەها خوشك و برایی، سەر و خوار، (علت) و (معلول)...هتد[٨].

٦) دوالیزمی دژیەك (Binary opposition): لە دوو پێناسەی (ئینسایکلۆپیدیا)دا بەم جۆرە هاتووە:

"دوالیزمی دژیەك، بریتیە لە جیاوازی نێوان دژەکان، یاخود دوو شت، کە لە پێکهێنانیاندا جیاوازی دژبەیەکتر دروست دەکەن"[٩]. هەروەها لەهەمان سایتدا هاتووە، کە: "دوالیزمی دژیەك، سیستمێکی زمانەوانی و فیکریە، زادەی دژیەك بوونە بەشێوەیەکی تیۆری و ئامانج لێی دەرخستن و ڕوونکردنەوەی دژیەکێکە بەرامبەر دژەکەی"[١٠].

---

[٧] رضا رشیدی، پارادوکس، سایت هم اندیشی زبان و ادبیات فارسی.

[٨] عبدالکریم سروش، نقدی و در آمدی بر تضاد دیالکتیکی، بڕوانە ل١٥.

[٩] ئەنسایکلۆپیدیا، ئەنتەرنێت.

[١٠] ئەنسایکلۆپیدیا، ئەنتەرنێت.

لە فەرهەنگی (نظریە و نقد ادبی)دا هاتووە کە: "پەیوەندی نێوان دوو شت، یاخود دوو چەمکە، کە لەسەر بنەمای بەرامبەر یەکبوونە وەك چاك و خراپ، ڕاستی و درۆ..."[11].

لە فەرهەنگی فەلسەفیدا هاتووە کە: "دوالیزم بوونی هەموو ئەو شتانەی لە دووبەش پێکدێن دوالیزم بوونیش وەك ئەو ڕایە وایە، کە تێڕوانینی (دوانەی جووت)ی هەیە بۆ ژیان و بوون..."[12].

پاش خستنەڕووی ئەو پێناسە گشتی و فەرهەنگییانەی، کە بۆ هەریەك لەو زاراوانە کرا، بەپێویستی دەزانم زۆر بەکورتی پەیوەندی نێوان هەریەك لەوانە ڕوونبکەمەوە.

ئێمە لە هەر مەودایەکدا باسی (تضاد و تناقض و دوالیزم) بکەین لەو کارە بەدەر نییە، کە پێی دەوترێت (تقابل) بەرامبەرکردن، یاخود بەرامبەر یەکدانان، بۆیە ئەم زاراوەیە خودی کارەکەیە، بەڵام ناوەڕۆکی واتایی لە زاراوەکانی دیکەدایە.

## ١-١-١/ پەیوەندی نێوان (تضاد) و (تناقض):

(تضاد) جۆرە ڕێکخستنێکە، کە ئاماژەیە بە جۆرێك لە پەیوەندی نێوان دیاردەکانی، کە لە ڕووگەی دژبەیەك وەستاون و وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا پێکەوە کۆکردنەوەیان نەگونجاوە، بەڵام وەلانانی هەردووکیان گونجاوە[13].

---

[11] سعید سبزیان، فرهنگ نظریە و نقد ادبی، ل٦٩.

[12] جمیل صلیبا. المعجم الفلسفی. دار الکتب اللبنانی، بیروت، الطبعة الأولی، ١٩٧١م. ل٢٨٥.

سەبارەت بە پەیوەندی و جیاوازی لەگەڵ (تناقض)دا (ابوالحسن بنی صدر) دەنووسێت: "ئەگەر دوو گروپ، دوو شێواز، دوو بابەت، دوو فرمان، دوو دیاردە، هەردوو شتێك، کە تۆ وێنای بکەیت، هەبن، بەڵام دژی یەکتری بن، ئەوا پێیان دەڵێن (تضاد) دژیەك و پێیان ناڵێن (تناقض)، بەڵام ئەگەر یەکێکیان بوونی هەبێت و هەبوونی گریمانەکراوبێت، بەڵام پێچەوانەی دژەکەی نەبێت، ئەوا پێی دەڵێن (متناقض)"[١٤].

سەبارەت بە (پارادوکس) وەکو پێشتر بەکورتی ئاماژەمان پێدا، کۆکردنەوە و ئاشتکردنەوەی دوو شتی پێچەوانە و دژیەکە. پارادۆکس "هیچ نییە جگە لە دەربڕینی چەمك و ڕوونکردنەوەی بیروڕاکان بە شێوازێکی ناباو و خوو پێوەگرتوو، بەجۆرێك، کە زەین و بیری گوێگر دەخاتە بیرکردنەوەی قووڵ و تێڕامان و پرسیاری بنەڕەتیانە، زەینێك، کە دەگاتە ئەم قۆناغە، ئەوا بێگومان بە یەکێك لە بالاترین قۆناغەکانی گەشەکردن و داهێنان گەیشتووە"[١٥].

لە پەیوەندی دژیەك و پارادۆکسدا دەتوانین بڵێین: "(تضاد)، یاخود (طباق) بەو واتایە دێت، کە نووسەر، یاخود گوتاربێژ چەند زاراوەیەك بهێنێت، کە لە واتادا پێکەوە دژن و ناگونجێن. بۆنموونە، کاتێك دەڵێین: (هەندێ لە منالەکان خەوتوون و هەندێکیان بەخەبەرن)، ئەمە واتە (خەوتن) و (بەخەبەربوون) دژیەکن، بەڵام پارادۆکس واتە کۆکردنەوەی ئەو دوو دژیەکە

---

[١٣] پریسا رضایی، بررسی تضاد و متناقض نما در اشعار احمد شاملو، پایان نامه کارشناسی ارشد رشته زبان و ادبیات فارسی، دانشگاه کردستان، سال ١٣٨٧ هـ.ش. ل٢٨.

[١٤] ابوالحسن بنی صدر، تضاد و تناقض، نوفل لوشاتو، چاپ دوم، کتابخانه جمهوری اسلامی، ل٧٥.

[١٥] هوشنگ اشرافیان، زبان پارادوکس، سایتی www.literature-dept.talif.ir

لەیەك بابەتدا. بۆ نموونە ئەگەر هەر لەو نموونەی پێشوو پارادۆکس دروستبکەین دەڵێین: (خەوتووی بەخەبەر، یاخود بەئاگا) یان (بەخەبەری خەوتوو، یاخود بێ ئاگا)، بەگشتی پارادۆکس باشترین و هونەریترین جۆری دژیەکە"[16].

"بەکورتی لە دژیەکدا، دوو دژیەك دراونەتە پاڵ دوو بابەتی جیاواز، بەڵام لە پارادۆکسدا دراونەتە پاڵ یەك بابەت"[17].

هەروەها سەبارەت بە پەیوەندی نێوان (متناقض) و (پارادۆکس) و جیاوازیان، ئەگەرچی پارادۆکس هێنان و کۆکردنەوەی دوو سیفەتی ناکۆکە و دەدرێنە پاڵ بابەتێك، بەڵام "مەرجە دەبێت کۆکردنەوەی ئەو دوو ناکۆکە جوانی دروست بکات لە دەربڕین و مەرجیش نییە لە پارادۆکسدا هەمیشە دوو وشەی دژیەکمان هەبێت، بەڵکو زۆرجار لە واتادا ماناکانیان یەك نایەتەوە، یاخود لەگەڵ واقیع و لۆژیکی باودا ناگونجێت. پێویستە ئاماژە بەوەش بدەین، هەر دەربڕینێك، کە ناکۆك بوو ئەگەر ڕاڤەکردن و شیکاری و (تأویل)ی گرتەخۆی ئەوا (پارادۆکس)ە، بەڵام ئەگەر ڕوون بوو و هیچ ڕاڤەکردنێکی نەگرتە خۆی ئەوا (متناقض)ە، چونکە پارادۆکس پاش تێڕامان واتا بنەڕەتیەکەی تێدا نییە و ڕووکەشە"[18].

---

[16] رضا رشیدی، پارادوکس، سایت هم اندیشی زبان و ادبیات فارسی.

[17] وحیدیان کامیار، متناقض نما در ادب، مجله دانشکده ادبیات و علوم انسانی مشهد، ژماره ٣-٤.

[18] مهدی صالحی. تضاد یا متناقض نما، مجلهٔ فارسی، دورهٔ ٢٣، شمارهٔ ٤٦. www.ensani.ir

لە دەرئەنجامدا بۆمان دەردەکەوێت، کە زاراوەی (دوالیزمی دژیەك) وەك پێناسەو چییەتی و بەکارهێنان، فراوانترە لە هەموو جۆرەکانی دیکە، بەڵکوو، هەموو ئەوانی تریش لەخۆدەگرێت.

(د.مکی نومان مظلوم) و (د.گۆران صلاح الدین شکر) لە لێکۆڵینەوەیەکیاندا لەوبارەوە دەڵێن: "سەبارەت بە پەیوەندی نێوان دژیەك و دوالیزمی دژیەك ئەوەی، کە جەختی لەسەر دەکرێتەوە لەسەر پەیوەندی نێوان ئەو دوو زاراوەیە و هەموو ئەو چەمك و زاراوانەی تریش، کە ڕەوانبێژان و ڕەخنەگرانی عەرەب بەکاریانهێناوە بۆ دژیەکبوون، کە بە زاراوەی فرەجۆر گوزارشتی لێکراوە، بەڵام هەموو ئەوانە هەرچەند جیاوازیش بن، بەڵام بەگشتی لەسەر بنەمای پرنسیپی دوانەیی دانراون"[١٩].

هەروەك ئەدەبناسێك دەڵێت: "دوالیزم کارێکی ڕەگوڕیشەدارە لە داهێنانی شیعریدا، چونکە لە ناوەڕۆکی خۆیدا ڕەگەزەکانی دژیەکبوونی هەڵگرتووە، کە دەتوانێت (دڵەڕاوکێ) و (جیاوازی) بخولقێنێ، بەجۆرێك، کە تێکستەکە لە داهێنانێکی نەگەتیڤ تێدەپەڕێنێت، کە هەندێ بابەتی ڕووکەش بڕیاری لەسەر بدات، بەڵکو دەیکاتە تێکستێکی چالاکی زیندووی نوێ، تێکستێك، کە ڕاچەنین دروست دەکات و قووڵی بیر و خەونمان بۆ بەدیدەهێنێت، پێدەچێت هەر ئەم ڕەگەزە بنەڕەتیەش بێت، کە ڕۆڵی نەمری دەداتە زۆر تێکستی داهێنەرانە"[٢٠].

---

[١٩] مکی نومان مظلوم و گۆران صلاح الدین شکر، ثنائیات الأضداد في شعر المتـنبي، گۆڤـاری زانکۆی کۆیە، ژمارە ١١، ل٣٠٨.

[٢٠] سراتە البشیر، الخطاب الشعري والثنائیات الضدیە*، ینایر ٢٠١١، ئەنتەرنێت.

تا ئێرە ڕانانێکی خێرای زمانەوانی و پێناسەی فەرهەنگی دوالیزم و جۆرەکانی بوو، بەڵام نابێت ئەو ڕاستیەمان لەبیربچێت، کە دوالیزمی دژیەك و هەموو جۆرەکانی لە سەرجەم مەودا جیاوازەکانی مەعریفەدا لەوانە (تیـۆلۆجیا، عیرفان، فەلسەفە و لۆجیك، ئەدەب) تایبەتمەندی بەکارهێنان و مێژووی خۆی هەیە، کە بەپێویستی دەزانین بۆ زیاتر ئاشکراکردنی ڕەهەندە جیاوازەکانی (دوالیزمی دژیەك) هێندەی پێویست بکات لە مەودا جیاوازەکانی مەعریفەدا ئاماژەی پێبدەین، بۆئەوەی لە گەردوونیبوونی ئەم چەمکە و دەرکەوتنی وەك تایبەتمەندییەکی بوون و ژیان، ڕوونبکرێتەوە.

## ١-٢/ دوالیزمی دژیەك و تیـۆلۆجیا

دوالیزم و دوالیزمی دژیەك، یەکێکە لە گەورەترین چەمك و ڕەگەز و ڕەهەندی پەیبردن بە شوناس و چییەتی خودی مرۆڤ و ژیان و بوون، چونکە بنەمای جیهان لەسەر دوانەیی و دژیەکبوون دامەزراوە و جیهان و مرۆڤ لە سەر بنەمای هێزە دژەکان خولقێنراون. وەك مەولانای ڕۆمی دەڵێت:

زندگانی آشتی ضدهاست

مرگ آن کاندر جانش جنگ خاست[٢١]

واتە: ژیان پێکهاتووە لە ئاشتکردنەوەو پێکەوە هەڵکردنی دژەکان، مەرگی هەرکەسیش، ئەوەیە، کە لە ناخیدا شەڕخواز بێت. پسپۆڕێکی دیکەی ئەم بوارە دەربارەیەدەڵێت:

---

[٢١] مولانا رومی، جلال الدین محمد بلخی. مثنوی معنوی، انتشارات الهام – تهران، چـاپ اول، ١٣٨٦هـ.ش. ل١٢٩٦، ج١.

"دوانەیی گەردوون، جیهانبینی و بیروباوەڕێکە، کە پەیوەست لەگەڵ باوەڕی یەکتاپەرستیدا گەشەی کردووە، بەتایبەتی لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و لەنێوان سەرەتاکانی هەزارەی پێش زایین و ناوەڕاستی هەزارەی دوای زایین. باوەڕی یەکتاپەرستی زادەی یەکتاپەرستیە لە پەرستش و عیبادەتدا، کە لەسەر بنەمای باوەڕبوون بە خوای تاك و تەنها دامەزراوە، هەروەها یەکتاپەرستی لە عیبادەت و پەرستشدا، زادەی، یاخود کاردانەوەی باوەڕی فرە خواییە.."[٢٢].

هەر ئەم توێژەرە بەردەوام دەبێ و دەڵێ: "دەگونجێت بەوجۆرە پێناسەی دوانەیی گەردوونی بکەین، کە بیروباوەڕێکە باوەڕی بە دوو دەسپێك و ڕەگەز و بنەڕەتی سەرەکی و جیاواز و دژبەیەك لەپشت بوون و جوڵەی ژیان و کات و مێژووەوە هەیە. گرنگترین تایبەتمەندی ئەم دوو ڕەگەزەش، ململانێیە لەپێناو ڕەتکردنەوەی یەکێکیان لەوی دیکەوە. ململانێی نێوانیشیان جووڵانەوەی کات و مێژوو و ژیانی مرۆڤایەتی بەرەو کۆتاییەکی بێگومان دەبات بەپێی سێ قۆناغ: قۆناغی یەکەم، کە بە سەردەمی (زێڕین)ی دروستکراوەکان ناودەبرێت و لەو قۆناغەدا هێشتا (خراپە) ململانێ و جەنگی لەگەڵ (چاکە)دا بەرپا نەکردووە؛ قۆناغی دووەم، قۆناغی تێکەڵبوونی چاکە و خراپەیە؛ قۆناغی سێیەم، کە دواقۆناغە، قۆناغی جیابوونەوەیە لەنێوان چاکە و خراپەدا و

---

[٢٢] فراس السواح، الرحمن والشیطان، دار علاءالدین للنشر – سوریة، دمشق، الطبعة الثالثة، ٢٠٠٤م، ل١١.

بەتەواوی لەناوبردنی هێزی (خراپە)یە، تا جیهان وەك جاران باش و خاوێن ببێتەوە"[٢٣].

بابەتی دوالیزم و دوالیزمی دژیەك، لەگەڵ دەسپێكی بوون و ژیاندا هەیە، چونكە هەر لە سەرەتاوە مرۆڤ عەودالّی وەلامی چەندین پرسیاری سەرمەدییە، لەوانەش چییەتی چاكە و خراپەیە.

دكتۆر عەلی شەریعەتی، لە كتێبەكەیدا "فرهنگ لغات" لەبارەی چەمكی (دوالیزم) و چۆنیەتی كەوتنەوەی لە دنیای ئایینناسیدا دەڵێت: "دوانەیی بەواتای باوەڕبوونە بە دوو كەس، یاخود پێكهاتە، جیهان لە دوو كەس و هێز و هۆكار پێكهاتووە، كە یەكەم، هیچ لێكچوونێكیان لەنێواندا نییە، هەردووكیان دەسپێكن و (قدیم) و دژیەكیشن، دووەم، دژایەتی لەنێوانیاندا هەیە و سێهەم دابەشبوون بۆ دوو جەمسەری خراپ و چاكە و ناشیرین و جوان. كاتێك دەڵێین هەموو هەبوون لە دوو هێز و هۆكار پێكهاتووە، واتە دوو سیمبوڵ و دروستكەری هەیە، كە خودایە. باوەڕ بە دوانەیی، جۆرە جیهانبینییەكە، كە دواتر دەگۆڕێت بۆ باوەڕ بە دوو خوایی، كە خۆی ئێستا وەكو مەزهەبێك هەیە"[٢٤].

بەشێوەیەكی گشتی دەتوانین، ئەو بیروباوەڕانەی، كە لەسەر بنەمای دوانەیی دامەزراون، لەڕووی ڕووخسار و ناوەڕۆكەوە، بۆ سێ جۆر پۆلێنیان بكەین:

١. دوانەیی ڕەها.
٢. دوانەیی بنەڕەتی.
٣. دوانەیی میانەڕەو.

---

[٢٣] فراس السواح، الرحمن والشيطان، ل١١.

[٢٤] علی شريعتی، فرهنگ لغات، شركت انتشارات قلم، چاپ چهارم، ١٣٨٣ هـ.ش، ل١٤٨.

دوانەیی ڕەها، باوەڕی بە بوونی دوو بنەڕەتی، یاخود دوو ڕەگەزی (ئەزەلی) هەمیشەیی و سەربەخۆ و دژبەیەك هەیە، کە هەریەکەیان دنیابینی و دەسەلاتێکی ڕەهای خۆی هەیە بەسەر جیهانەوە. جیهانێك بۆ گیان و ڕووناکی هەتاهەتایی، هەروەها جیهانێك بۆ مادده و تاریکی هەتاهەتایی. ئەم دوو جیهانە نەچوونە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆوە لەگەڵ یەکتر تا ئەوکاتەی تاریکی هێرشی کردە سەر ڕووناکی و چووە پێکهاتەکەیەوە، هەربۆیە پێویستبوو، کە جارێکیتر لەیەکتری جیابکرێنەوە، ئەمەش بیروباوەڕی (مانویە).

سەبارەت بە (دوانەیی بنەڕەتی)یش، باوەڕی بە دوو دەسپێکی یەکسان هەیە لەڕووی بەهای ڕێژەییەوە و لەڕووی پەیوەندیان بە بوونەوە، بەلام ئەم دوو بوونەوەرە دەسپێك و بنەڕەتی (ئەزەلی) هەمیشەیی نین، بەڵکو (حادث)ن و هەردووکیان زادەی یەك خوای هەمیشەیی (ئەزەلی) و (قدیم)ن، کە پاش بوونیان بەردەوام لە ململانێدان، ئەمەش بیروباوەڕی زەردەشتییە.

جۆری سێهەمی دوانەیی، کە دوانەیی میانەڕەوە، باوەڕی بە یەك دەسپێك و بنەڕەت و تەنهایەکی (قدیم) و (ئەزەلی) هەیە کە هەر ئەوەش خوای ڕووناکییەکانی بالآیە. پاشان ئەم خوایەی بالآ خوایەکی بچووکتر لە خۆی دروستکردووە، کە ئەو خوایەی جیهانی خوارەوە، جیهانی ماددەی دروستکردووە، چونکە مادده بە سروشتی خۆی خراپە. هەربۆیە ناگونجێت خوای تاقانەی چاکە، خراپەی دروستکردبێت، یاخود لە بوونی بەرپرسیار بێت، ئەمەش بنەما و بنەڕەتی بیروباوەڕی (غنوسی)یەکانە بە هەموو ڕێچکەکانیەوە[٢٥].

---

[٢٥] فراس السواح، الرحمن والشیطان، بڕوانە ل١٢.

ئەو پۆلێنکردنەی سەرەوە بەگشتی پۆلێنکردنی ئەو ئایینانە بوو، کە باوەڕیان بە دوانەیی گەردوونی هەیە، لە ڕوانگەی خودی دوانەیی‌و دوالیزمی دژیەکەوە، بۆیە پێویستە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی چەمکی (دوالیزمی دژیەك)، بەخێرایی چاوێك بە ناوەڕۆکی هەندێك لە ئایینەکاندا بخشێنینەوە، تا بزانین لە فەلسەفەی بوونی ئەو ئایینانەدا بابەتی دوالیزمی دژیەك چ جۆرە ئامادەییەکی هەیە، بەڵام لێرەدا و لەپێناوی ئەوەی چەمکی دوالیزممان زیاتر بۆ ڕوونببێتەوە، پێویستە جیاوازیی نێوان (دوانەیی) و (دوو جەمسەری) بکەین.

## ١-٢-١/ دوانەیی و دووجەمسەری، بیروباوەڕی (تاو) وەك نموونە

دووجەمسەری هێندەی مانا و واتای هاوکاری و یەکتر کامڵکردن دەگرێتە خۆی، هێندە واتای دژبوون و ململانێ ناگرێتە خۆی.

دووجەمسەری بیروباوەڕێکە، کە باوەڕی بە دوانەیی بنچینەیی هەیە و پێکهێنەرەکەی دووجەمسەری جیاواز و دژبەیەکن لە هەموو شتێکدا، بەڵام لەهەمانکاتدا هاوکارن و یەکێکیان بەبێ ئەوەی دیکە نابێت. لەئەنجامی ئەم جیاوازی و هاوکاریەی نێوانیان، دیاردەی ژیان سەرچاوەی گرتووە و هەر بەوهۆیەشەوە ژیان بەردەوامە.

باشترین نموونە سەبارەت بە دوانەیی دووجەمسەری، بیروباوەڕی (تاو)ی چینیە، کە بنەما فیکرییەکانی ئەم بیروباوەڕە لەلایەن مامۆستا (لاو – تسو)وە دانراوە لە سەدەی شەشەمی پێش زاییندا.

لاو – تسو، لە کتێبە تاقانەکەیدا، کە دراوەتە پاڵ ئەو، دەڵێت: "دەسپێکێکی (ئەزەلی) و (قدیم) هەیە، کە پێیدەگوترێ (تاو). ئەم (تاو)ەش کەسایەتێکی خوایی نییە، بەڵکوو ئەو سەرچاوەی هەموو بوونە و ڕاستیەکی

ڕەهایە، کە هەموو بوونەکانی تر، کە ڕێژەیین لەوەوە هێز وەردەگرن. لەم دەسپێکە گشتییەوە دوو هێزی سەربەخۆ هاتوونەتە بوون، کە ئەوانیش هێزی (یانغ) واتە (موجب) و هێزی (ین) واتە (سالب)ە، بە خولانەوەی ئەم دوو هێزە بە دەوری یەکتردا هەزاران جۆر دروستکراوی تر هاتوونەتە بوون. هێزی (یانغ) لە ڕەنگی سپیدا خۆی دەنوێنێ، کە ئاماژەیە بۆ ڕووناکی، هەروەها هێزی (ین) لە ڕەنگی ڕەشدا خۆی دەنوێنێ، کە ئاماژەیە بۆ تاریکی"[٢٦].

بەڵام لێرەدا ڕووناکی و تاریکی هیچ ئاماژەیەکی بەهایی و ڕەوشتی لەگەڵ خۆیان هەڵناگرن و هیچ کامیان چاکتر نییە لەوی تریان و هەروەها هیچ کامیان لە هەوڵی ئەوەدا نییە سەرکەوێ بەسەر ئەوی دیکەدا، باشترین نموونە بۆ ئەم دووجەمسەریە، چواندنیەتی بە هێزی دووجەمسەریی موگناتیسە.

لە ئایینەکانی ڕۆژهەڵاتی کۆنیشدا نموونەی لەو جۆرە ئایینانەمان هەیە، کە بنەڕەتەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دووجەمسەری نەك دوانەیی لەگەڵ بوونی ڕەگەزی ململانێی ڕووخساری و دەرەکی لەنێوان دوولایەنی ئەو دوانەدا. لەو نموونانەش دوانەیی لە پەرەستشی (کەنعانی)یەکاندا، کە خۆی لە دوانەی سەوزایی و وشکانیدا دەبینیەوە و وەك دوو کەسایەتی خوایی خۆیان دەردەخست، کە ئەوانیش بریتیبوون لە (بعل) و (موت)، خوای (بعل) ژیان و سەوزایی بەدەست بوو، بەڵام (موت) مردنو وشککردنی بەدەستبوو. ئەم دوو خوایە بەردەوام لە ململانێدا بوون، بەڵام هیچکامیان کۆتایی نییە و نایەت[٢٧].

---

[٢٦] لائودزو دائو. راهی برای تفکر، برگردان و تحقیق، دائوده جینگ، ترجمه: ع.پاشایی، نشر چشمه، چاپ پنجم، ١٣٩٠ هـ.ش، ل٤٤٨.

[٢٧] فراس السواح، الرحمن والشیطان، بڕوانە ل١٤.

چاکە و خراپە و ڕەوشت بەگشتی لە بیروباوەڕەکانی کۆندا پەیوەستبوو بە کۆمەڵەوەو یاسا داخراوەکانی نێو کۆمەڵ ئاراستەی دەکرد و هیچ پەیوەست نەبوو بە ئایینەوە، چونکە چاکە و خراپە لەو فیکرە ڕەسەنانەن، کە ڕەگوڕیشەیان لە سەرەتای بوونی مرۆڤەوە هەیەو چێنراوە لە عەقڵی مرۆڤدا، خواستی مرۆڤیش بۆ ئایین دەرئەنجامی پۆلێنکردنی ژیان و بوونە بۆ چاکە و خراپە. پێویستە ئەوەش بڵێین، کە زۆرجار سروشت و دەرهاویشتەی تێگەیشتنی مرۆڤ لە سروشت، ئەو تێڕوانینە بەرهەمدێنێت، کە ئایا ژیان و خودی سروشت چاکە یان خراپ؟

پاش پەیدابوونی ئایین، چەندین جۆر پەرستش پەیدابوو، بەڵام هەمووی لەژێر کاریگەری هۆکاری چاکە و هۆکاری خراپەدا بوو، بەوجۆرە دوانەی چاکە و خراپە، نەك تەنها بوونە دوانەی ڕەوشتی تاکەکان لە کۆمەڵگادا، بەڵکوو بوونە ڕەگەزی پێکهێنەری ئایینەکانیش، کە بە ئایینی دوانەیی ناسراون[28].

لە باسی ئاییندا پەیوەست بە بابەتە سەرەکیەکەی ئێمەوە، کە دوالیزم و دوالیزمی دژیەکە، تەنها لە ڕەگەزی سەرەکی و پێکهێنەری بنەڕەتی ئەو ئایینە سەرەکیانە دەدوێین، کە دوالیزمی دژیەك بووەتە پێکهێنەری جیهانبینیان و لەوبارەوە تەنها ڕانانێکی خێرای دەکەین، چونکە بابەتەکەی ئێمە لێکۆڵینەوە لە ئایین و خودا نییە و ئەوە جگەلەوەی ئەو بوارە زۆر فراوانە و ئامانجی ئێمە بە بەڵگە هێنانەوەی ئەو کایەیە، نەك ڕاڤەکردنی.

[28] محمد التونجی، الیزیدیون واقعهم و تأریخهم و معتقداتهم، المکتبة الثقافیة، بیروت، الطبعة الأولی، ١٩٩٥م، بڕوانە ل١٢٩.

## ١-٢-٢/ دوالیزمی دژیەك لە دیارترین ئایینەكانی هیند دا

سەرەتا پێویستە ئەو ڕاستیە بلێین، كە مەبەستمان لە (هند) وڵاتی هیندستانی ئەمڕۆ نییە، بەڵكو جوگرافیای فراوانی شێوە كیشوەری هیندە، كە بە (هیندی دێرین)یش دەناسرێت و بە (مۆزەخانەی ئایینەكان)یش ناوزەد دەكرێت، چونكە لانكەی سەدان، بەڵكو هەزاران ئایین و مەزهەبە.

### ١-٢-٢-أ/ ئایینی ڤیدا – Veda:

ڤیدا بەواتای حیكمەت و دانایی دێت:

لە ئایینی (ڤیدا)دا، كە ڕزگاربوونی مرۆڤ خۆی لە فەنابوونی (نەفس)دا دەبینێتەوە، دوو خوا بوونیان هەیە:

یەكەمیان: Indra – ئیندرا، كە خوای سروشت و هەورە بروسكە و لافاو و بارانە و بەگشتی جۆرە خوایەكی شەڕكەرە بە سودی خەڵك و لایەنگرانی خۆی.

دووەمیان: (varouna ڤاراوونا)یە، كە خوای عەقڵ و حیكمەت و داناییە.

ڤاراوونا سەرەتا خوای شەو و ئەستێرە بووە، بەڵام دواتر بووەتە خوای جیهان و ڕەوشت و جوڵێنەری سروشت و ڕێنمایی كاری مرۆڤ[٢٩].

ئەم باوەڕە گەشە دەكات و لە چوارچێوەی ئایینێكی نوێدا گۆڕانكاری گەورە بەخۆیەوە دەبینێت بەتایبەتی باوەڕی دژایەتی نەفس و دووركەوتنەوە لە چێژەكان.

---

[٢٩] مهرداد ایزد پناه، آشنایی با ادیان قدیم هند، انتشارات محور، چاپ اول، ١٣٨١ هـ.ش، بڕوانە ل١٨.

**١-٢-٢-ب/ ئایینی براهما – Brahmanisme:**

ئەم ئایینە بەلایەنی کەمەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەوتەمی پێش زایین. یەکێك لە مەسەلە بنەڕەتییەکانی ئەم ئایینە، باوەڕبوونە بە هەردوو کەسایەتی (براهمن)، یاخود (نەفسی جیهان) و (ئاتمەن) واتە (نەفسی مرۆڤ).

بەواتایەکی تر ئەم ئایینە بڕوای وایە، کە مرۆڤ بە ژیری ناتوانێت لەم جیهانە فراوانە تێبگات و پەی پێبەرێت. لە کاتێکدا خۆی بەشێکی زۆر بچووکە لەم جیهانە گەورەیە و ناتوانێت لە چییەتی بنەڕەتی بگات، بۆیە مرۆڤ پێویستی بە (بصیرت) و هەستێکیتر هەیە جگە لەم عەقڵ و هەستە ئاشکرایانە، کە هەستی (ناهەست)ە و داگیرسانی ڕووناکی ناخە، کە بەو قۆناغە دەوترێت (ئاتمەن)، وەك وتراوە "بە مەعریفە ناتوانین بگەینە ئاتمەن"[٣٠].

ئاتمەن پەیبردنە بە خوای خود، بەڵام "ئەو خوایەی، کە خوای ڕەهایە و سەرچاوەی دەرکەوتنی گەردوون و بوونە (براهما)یە، کە خوای باڵایە و بە ڕێژەنی (فیضی) خۆی بوونی داوەتە دروستکراوەکانیتر و لە بەرزایی زنجیرە چیاکانی (هیمالایا)دا و لەناو ڕووناکی و فریشتە پیرۆزەکاندا نیشتەجێیە[٣١].

لێرەدا ململانێ و دژایەتی لەنێوان (خودی ماددی) و (خودی باڵاتر لە سروشت)دایە، کە بە گەڕانەوەیە بۆ ناخ و وازهێنانە لە چێژی ماددی و دنیایی تا گەیشتن بە (ئاتمەن) و پاشان ئەگەر (گیان) توانی لە ململانێدا بەردەوامبێت

---

[٣٠] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢.

[٣١] صدیق الدملوجی، الیزیدیة، مطبعة الأتحاد، موصل – العراق، ١٩٤٩م، بڕوانە ل١٤١.

و خۆی ڕزگار بکات لە هەموو کۆت و پێوەندە جەستەیی و مادییەکان ئەوا دەبێتە خودی (براهمن)، یاخود (براهما)، چونکە خودی ئەو هیچ نییە، جگە لە بونیادێکی ڕۆحانی و شاراوە و خاڵی لە خود و ماددە[٣٢].

### ١-٢-٢-ج/ ئایینی هیندۆس:

لە سەدەی شەشەمی پێش زایینداـ لەبەرامبەر هەژموونی پیاوانی ئایینی برهمادا و دەرئەنجامی کەوتنەوەی دوو ئایینی دژیەکی (جاین و بودا)دا، ئایینی هیندۆس بە ڕەسمی ناسرا، کە ناسراوترین خواکانیان (شیوا) و (ویشنۆ) بوو، کە لە جەستەی (ڕاما) و (کریشنا)دا دەرکەوتبوون و خۆیان دەنواند.

شیوا: خوای وێرانکاری و بەرهەمهێنان بوو، شتانێکی دروستدەکرد و پاشان خراپ و وێرانی دەکرد، لەم ئایینەدا هێزی وێرانکاری و دروستکردن (واجب الوجود) بوو، ئەم خوایە لەگەڵ خواکانی ستەمکاری و خوێنڕێژی و ڕەشی هاوبەشبوو.

ویشنو: پارێزەری جیهان، چوار بازووی بەهێزی هەبوو، ئەم دوو خوایە بەردەوام لە ململانێ و دژایەتیدا بوون[٣٣].

### ١-٢-٢-د/ ئایینی بودا:

بودا، یاخود گتاما، کە ئایینەکەشی بەناوی خودی کەسەکەوەیە، جەختکردنەوەی لەسەر ململانێی (من) دەروون و سروشت و جیهانی بڕاوەیە (کە

---

[٣٢] مهرداد ایزد پناه، آشنایی با ادیان قدیم هند، ل٤٨.

[٣٣] مهرداد ایزد پناه، آشنایی با ادیان قدیم هند، ل٥٨.

وەك پەردەی نەزانی) ڕێگرە لەبەردەم بینینی ڕاستی و حەقیقەتی بووندا، بەڵام (بودا) حەوت ڕۆژ ئارامی گرت و بە بێدەنگی مایەوە تا لە ئارەزووپەرستیو ئێرەیی بردن پاکبوویەوە و (بەپێی باوەڕی تناسخ) سەرلەنوێ لەدایکبوویەوە، لەم حەوت ڕۆژەدا ململانێ لەنێوان (بودا) و (مارا – Mara)دا بوو، کە سومبولی هێزی خراپەو شەیتانە لە ئایینی بودادا، کە بەردەوام گومان و وەسوەسەی دەخستە دڵی بوداوە، بەڵام بودا، کە لەژێر داری مەعریفەدا بێدەنگ و ئارام بوو، سەرئەنجام سەرکەوت بەسەر مارادا و ڕزگاری بوو[٣٤].

## ١–٢–٣/ دوالیزمی دژیەك لە دیارترین ئایینەکانی ئێران دا:

ناسراوترین ئایین، کە دوانەی چاکە و خراپە و ڕووناکی و تاریکی و ململانێی نێوانیان، بووبێتە شوناس و ئەو دوو ڕەگەزەی وەك دوالیزمی دژیەك تێدا دەرکەوێت، ئایینی (زەردەشت)ییە، بەڵام لێرەدا بەکورتی بەر لە باسکردنی ئایینی زەردەشت باسی ئایینی (میترا)، یاخود میترائیزم دەکەین، چونکە وەك مێژوو و بابەت لەپێشترە و دواتر لەڕووی ڕۆڵ و گرنگییەوە کەمێك زیاتر لە ئایینەکانی تر، بایەخ بە ئایینی زەردەشت دەدەین.

### ١–٢–٣–أ/ ئایینی میترا:

بناغەی مهرپەرستی یا میترائیزم لەسەر ئەو باوەڕەیە، کە مهر (خۆر) خوای گەورەیە، خواکانی دیکە لەو بچووکترن. میترائیزم لەسەر بنچینەی پەرستنی ئاگر و پەرستنی هێزەکانی سروشت و دەستگرتن بەسەر (سحر) جادوودا

---

[٣٤] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٤.

دامەزراوە، جادوو پێویستیەکی پەرستنی هێزەکانی سروشتە و ئەم ئایینە باوەڕی بە ڕۆحی پاك و پیس هەیە، کە لە جیهاندا دەستبەکارن[٣٥].

جادوو، بریتیە لە کۆمەڵێك کردار، کە مرۆڤ بۆ خۆپاراستن لە ڕۆحی خراپە و ڕاکێشانی ڕۆحی چاکە ئەنجامی دەدات.

میترا لە خوا هاوبەشەکانی ئێرانی و هیندی بوو، میترا بە چاودێری جیهان دەزانراو، بڕوادارانی پێیانوابوو میترا لە نەبەردی نێوان مرۆڤ و دێوەکاندا، یاوەری مرۆڤە[٣٦].

### ١-٢-٣-ب/ ئایینی زەردەشت، یاخود زەردەشتی:

ئەگەرچی هەندێك لە زانایانی بواری لێکۆڵینەوە لە ئایینی زەردەشت، جیاوازی دەکەن لەنێوان ئەو ئایینە ڕاستیەی، کە زەردەشت هێناویەتی و لەگەڵ ئەو ئایینە زەردەشتییە، کە جێگرەوەکانی بانگەوازی بۆدەکەن. کرۆکی ئەو جیاوازیەش لە یەکتابوونی و دوانەیی بوونی بیروباوەڕەکەیدایە[٣٧]، بەڵام ئەوە هیچ لەو ڕاستیە کەم ناکاتەوە، کە ئایینی زەردەشت زیاتر لە هەموو ئایینەکانی تر لەسەر بنەمای دوو ڕەگەزی جیاواز و دوانەی دژبەیەك دامەزراوە بەجۆرێك، کە دوانەی دژیەك شوناس و کرۆکی جیهانبینی ئەم ئایینەیە.

---

[٣٥] عەبدوڵڵا موبلغی ئابادانی، مێژووی ئاینی زەردەشت. وەرگێڕانی بۆ کوردی: وریا قانیع، خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی قانیع، چاپی دووەم بڕوانە ل٢٢.

[٣٦] عبدالله موبلغی ئابادانی، مێژووی ئاینی زەردەشت، وەرگێڕانی وریا قانع، بڕوانە ل٢٤.

[٣٧] علی شریعەتی، فرهنگ لغات، ل٢٢١.

هەر لەم بارەیەوە وتراوە: "ئاهورامزدای خوای زەردەشت هەمیشەیی و ئەبەدیە، زەردەشت بە ژیر، بینەر، بەتوانا و زانای دەزانێت. کە ویستی جیهان دروست بکات، لە سەرەتاوە ڕۆحێکی نەمر و ڕەهای بەناوی (وهومن) دروستکرد، یانی (ڕەوشت، زەین، فیکر و ئەندێشەی چاك) لە دواییدا وهومن هەموو دیاردەکانی جیهانی دروستکرد"[٣٨].

زانایەکیتر لە ڕوونکردنەوەی ئەم ئایینەدا پێیوایە، لە بیروباوەڕی زەردەشتدا دوو سیستمی یەزدانی بەناوی بوونەوەری بەد (ئەنگرمئی نو) و بونەوەری چاك (سپنتامئی نو) هەن، یانی بوونەوەری باش و بوونەوەری خراپ، کە هەمیشە لە جەنگدان، هەریەکەشیان چەندین یاوەر و فریشتەیان هەیە[٣٩].

لە گاتاکاندا هۆکاری چەپەڵییە و سەرچاوەی پیرۆزی و پاکی. ئەو دووە هەر لەسەرەتاوە وەك دوو براله و هاوتا هەن، لە (یەسنا٤٥، ٢) هاتووە کە: "من دەمەوێ لەو دوو ڕەگەزە بدوێم، کە لەسەرەتای ژیانەوە هەن — لەوەی، کە یەکە پیرۆزەکەیان بە چەپەڵەکە دەڵێت: هەست، ئامۆژ، هۆش، ئارەزوو، گوفتار و کرداری ڕەوانی ئێمە دوو براله و یەکسان نین" هەروەها لە (یەسنا٣٩، ٤) هاتووە، کە: "ژیان و مردن لە بەیەك گەیشتنی ئەو دوو ڕەگەزە پەیدابوو"[٤٠].

---

[٣٨] علی شریعەتی، تاریخ و شناخت ادیان، ج٢، انتشارات قلم، ١٣٨٣ هـ.ش. ل٢٠٣.

[٣٩] عبدالله موبلغی ئابادانی، مێژووی ئاینی زەردەشت، وەرگێڕانی وریا قانع، بڕوانە ل٤٧.

[٤٠] هاشم رضی، زەردەشت و ئامۆژگارییەکانی. وەرگێڕانی: م. گۆمەیی، چاپخانەی تیشك، سلێمانی ٢٠٠٠ ز. ل٦٦.

ئەم دوو هێزە (سپەنتامینو – ئەنگرەمینو) لە سەرەتای دروستبوونەوە دوو هێزی دژبەیەکترین، یەکەمیان لەگەڵ بیری باش، گفتەی باش و کردەوەی باشدایە و دووەمیان دژیەتی، مرۆڤی دانا لەنێوان باشەکاندایە[٤١].

"لەسەرەتاوە، جگە لە خواوەند – ئاهورامەزدا هیچیکە نەبوو. بوونێکی تەواو گشتگیر و خوایەتییەکی ڕاوەستا و لەسەر خودی خۆی و قایل بە بوونی خۆی، بەڵام ئەم خوایەتییە بڕیاریدا بە دەرچوونی لە سستییەکەی و بە ڕوو خستنی جگە لە خۆی بەرەو بوونەوەر، هەتا ئەوەی یەکەمین دروستکراوی بریتی بوو لە دوو گیانی دوانەیی، کە ئەوانەش (سپەنتامینو و ئەنگرەمینو) بوون. ئەوجا خواوەند تایبەتمەندی ئازادی پێبەخشیون. سپەنتامینو چاکەی هەڵبژاردووە و ناوبراوە بە گیانی پیرۆز، ئەنگرەمینۆش خراپەی هەڵبژاردووە و ناوبراوە بە گیانی بەدی و بەرەنگاری هەموو کردارێکی باش"[٤٢].

زەردەشتایەتی هەموو جیهانی فیزیایی وادەبینێت، کە لە خۆیدا چاکە و هەرچی گەندەڵی هەیە پاشتر لەلایەن (ئەهریمەن)ەوە هێنراوەتە ناوەوە. وەك بینیومانە، جیهانی گیان نموونەی ئەو جیهانەیە، بەڵام لە بنچینەشدا لێی جیاواز نییە، لە دواین ڕۆژدا سەرەنجام هەموو ئەو خراپانە تێکدەشکێنرێن کاتێك (ئەهریمەن) لەناودەبرێت، یان بە تەواوی بێ توانا دەکرێت[٤٣].

---

[٤١] عەبدوڵا قەرەداغی، زەردەشت، چاپخانەی تیشك، چاپی دووەم، سلێمانی ٢٠٠٧ ز، بڕوانە ل١٣٦.

[٤٢] فیراس ئەلسەواح، خواوەند و شەیتان، وەرگێڕانی: بەختیار عەزیز، چاپخانەی ڕۆژهەلات- هەولێر، چاپی یەکەم ٢٠١١ ز. ل٩٦.

[٤٣] ر.س.زێهنەر، پوختەیەك لە بیروباوەڕی زەردەشتی، وەرگێڕانی: ئازاد حەمە شریف، چاپخانەی ماردین– هەولێر ٢٠٠٠ ز. بڕوانە ل٧١.

لەکاتێکدا خەڵکی کۆبوونەتەوە و پرسیاری چاکە و خراپە و ڕووناکی و تاریکیی لە زەردەشت دەپرسن، لە وەڵامیاندا بە چرپینی هۆرەوە دەڵێ:

ئێستا بۆ ئێوە ئەی پەیجوورانی ڕاستی و
ئەی خەڵکانی دانا دەئاخفم..!
لەمەڕ دوو مەزاری گەورەوە، (دوو مەزاری گەورە مەبەست دوو هێزی نەیار و دژبەیەکن)
هەروەهاش شێوەی ستایشی ئەهۆرا و
رامانی پاك و
زانستی چاك و ئایینی ڕاستی،
تا تیشك و ڕۆشنایی ڕاستەقینە بناسن و
بە ڕەسایی و شادومانی بگەن.

گاتا، ها تی ٣٠، سروودی ١

کەوایە،
پەیڤە هەرە باشەکان بەگوێی هۆش ببیسن و
بە رامانی ڕوون بڕوانن،
هەریەك لە ئێوە،
یەکێك لەم دوو ڕێگایە بۆخۆی هەڵبژێرێت و
بەر لە بویەری مەزن
ڕاپەڕن و بە دروستی،
ئەم ئایینە فێر بن و پەرەی پێ بدەن

گاتا، ها تی ٣٠، سروودی ٢

ئەو دوو گەوهەرە لفانە،
هەر لە سەرەتاوە،
لەناو رامان و خەیاڵدا پەیدابوون،
یەکێکیان چاکە دەنوێنێت و ئەوی دیکە خراپە،
لەو دوانە
مرۆڤی ژیر ڕاستی و دروستی هەڵدەبژێرێت،
نەزانیش خراپە و چەوتی
گاتا، ها تی ٣٠، سروودی ٣[٤٤]

لە ئایینی زەردەشتدا ڕەگوورپیشەی دوانەیی، یاخود دوالیزمی لە (گاتا)کاندایە، کە سەبارەت بە چییەتی ڕاڤەی جۆراوجۆر کراوە، کە لە (یسنا٣٠) (بەندی ٣٠)دا باس لە سەرەتای سەرهەڵدانی دوانەیەك دەكات، کە لە بیرو گوفتار و کرداردا ناسازن و یەکێکیان چاك و ئەویتریان خراپە، بەڵام بەسەر هەڵدانی ئەو دوانە ژیان و مردن بەدیدێت. لەمبارەیەوە پەیڕەوانی قوتابخانەی دوانەیی ڕەوشت، دەڵێن: ئەم بەندەی ناو گاتاکان باس لە سیستمێکی بیرکردنەوە دەکات، کە تێیدا چاك و خراپ لە جەنگدان. دوانەیی، دیاردەیەکی فیکری و نموونەیەکی ڕەفتارییە، کە سەرەتا لە زەین و دواتر لە گوفتار و کرداردا ڕەنگدەداتەوە، بەڵام پەیڕەوانی دوالیزمی، یاخود دوانەیی دروستکردن (خولقاندن) لەوباوەڕەدان، کە ئەم بەندە باس لە سیستمێکی

---

[٤٤] بابان سەقزی، زەردەشت هیوای ڕزگاری، بەڕێوەبەرایەتی چاپو بڵاوکردنـەوەی سـلێمانی ٢٠٠٦ ز. ل٢٢٥–٢٢٦.

خولقاندن دەکات، کە تێیدا دوو هێزی (ئەزەلی) چاکە و خراپەیان بەدیهێناوە و شەڕ و ململانێی بەردەوام هەیە لەنێوان دروستکراوەکانیاندا، واتە یەکەمیان باوەڕی بە دوو ڕەفتاری دژ و دووەمیان بە دوو بەدیهێنەری دژ هەیە.

لێرەدا و لە هەردوو گریمانەکەدا، جیهانی دروستکراو، یاخود بینراو، کە جیهانی ڕەها نییە جیهانی دژەکانە، کە تاریکی بێ ڕووناکی و چاکە بەبێ خراپەو...هتد نابێت. دژبوونی ئەو دوو ڕەگەزە پێکهێنەرە سەرەکیەش دژیەکبوونی ئەرکی نییە وەکوو بۆنموونە (ژن و پیاو)، بەڵکوو دژیەکبوونی ماهیەت و چییەتییە وەکوو ڕووناکی و تاریکی"[٤٥].

### ١-٢-٣-ج/ ئایینی دەیەسان (دیصان):

ناوی هەڵگری بانگەوازی دەیەسانە، کە یەکێکە لەو سێ ئایینەی، کە پاش (زەردەشت) باوەڕیان بە دوانەیی هەبووە، "ئەم ئایینە بانگەواز بۆ ئەوە دەکات، کە هەموو چاکەیەك لە ڕووناکییەوەیە و هەموو خراپەیەکیش لە تاریکییەوە، خوای خێر بە سروشتی خۆی چاکە ئەنجام دەدات و خوای شەڕەنگێزیش بە سروشتی خۆی خراپە"[٤٦].

### ١-٢-٣-د/ ئایینی مانی، یاخود مانیزم:

مانی، سی (٣٠) ساڵ پاش دەیەسان سەریهەڵدا و باوەڕی وابوو، کە چاکە و خراپە تێکەڵەیەکن.

---

[٤٥] فرهنگ مهر، فلسفه زردشت، چاپ دیبا، چاپ هشتم، ١٣٨٤ هـ.ش. بڕوانە ل٧٧-٧٩.

[٤٦] محمد التونجي، اليزيديون، ل١٢٩.

(ڕووناکی) لەم ئایینەدا پیرۆزترین و گەورەترینە، بەڵام لەگەڵ باڵادەستیدا لەبەرامبەر "هێزی دووەم، کە (تاریکی)یە نەبۆتە بەهێزترین، بەڵکوو بە بەردەوامی ڕووبەڕووی ململانێی ئەو هێزە بووەتەوە. لێرەشەوە بیری (دوانەپەرستی – Dualism) لەم ئایینەدا دەردەکەوێت لەگەڵ بیری یەکتاپەرستی، کە یەك هێزی بێ سنوور و بێ هاوتایە، جیادەبێتەوە"[٤٧].

مانی پێیوابوو، کە "ڕووناکی پێنج تایبەتمەندی هەیە، کە هێزێکی ئارام و لەسەرخۆ و نهێنیپارێزی وریا و ژیر و لێهاتووە و خۆشەویستی بەندەکانیەتی و جێگای باوەڕ و متمانە و زیرەك و وردبینە. لەبەرامبەر (بێ باوەڕی، بێ وەفایی، کینە، کاولکاری، سوتێنەری و نەزانی) هێزی تاریکی.

ئەم خەسڵەتە باشانە بۆ (ڕووناکی) و خراپانە بۆ (تاریکی) دەرئەنجامی ئەوەبوو، کە یەکەمیان (خودا)ی ڕاستەقینە و شایستەی پەرستن و دووەمیان لە ناچاری خراپی و دڵڕەقی و دەسەڵاتی ستەمکاری، پایەی خودای وەرگرتبوو"[٤٨].

فەلسەفەی دروستبوون لای مانیزم بۆ بنیاتنان و درێژەپێدانی ژیانی بۆ یەکەمین دوو دروستکراو دەگەڕێتەوە، کە یەکێکیان (مرۆڤی کۆن)ە و ئەویتریان (شەیتان)ە، ئەو دوانەش، کە لە دوو ڕەگەزی جیاواز پێکهاتوون بە مەبەستی گواستنەوەی شەڕ و ململانێی هەردوو هێزی (ڕووناکی و تاریکی) بۆ

---

[٤٧] فرهنگ مهر، فلسفه زردشت، بڕوانە ل٧٧–٧٩.

[٤٨] سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٠.

خۆیان، "سەرەتا (تاریکی) دروستکراوێکی بەناوی (شەیتان) دروستکرد تا لە لێدانی هێزی ڕووناکیدا هاوکاری بکات"[٤٩].

باوەڕبوون بە دوانەپەرستی لای مانیزم، تەنها ئەوەندە نەبوو، کە دوو هێز ڕۆڵی خۆیان لە باڵادەستی بوونەوەر و جیهاندا ببینن، بەڵکو وەك یاسایەك بۆ ئاستە جیاوازەکانی خوارەوە لە دروستکراوەکانی دیکەش، دابەزیبوو.

### ١-٢-٣-هـ/ ئایینی مەزدەك:

لە سەردەمی قوبادی ساسانیدا سەریهەڵدا واتە (٤٨٧ی زایینی)، دواتر (نەوشیروان) پاشای ساسانی کوشتی. ئەمیش هەمان تێڕوانینی مانی هەبوو بۆ هەردوو ڕەگەزە سەرەکییەکەی ڕووناکی و تاریکی، کە وەك دوانەیەکی پێکهێنەرو دروستکەر سەیری دەکردن، بەڵام جیاوازی لەوەدابوو، کە (مەزدەك) باوەڕی وابوو، کە ڕووناکی جیهانێکی هەستیارە و تاریکی نەزانێکی کوێر، ڕووناکی هەرکارێك دەکات بە مەبەست و ویستی خۆی دەیکات، بەڵام تاریکی کارەکانی بە ڕێکەوتە[٥٠].

## ١-٢-٤/ دوالیزمی دژیەك لە ئایینی کۆنی میسریدا:

لەبەر زۆریی ئایینەکانی کۆنی میسرییەکان، ناچار یەك نموونە بۆ بابەتەکەمان دەکەینە بەڵگە بۆ ئەو ناوچە جوگرافی و شارستانیەتە قووڵ و مێژووە دوور و درێژە.

---

[٤٩] سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٢.

[٥٠] محمد التونجی، الیزیدیون، بڕوانە ل١٢٩.

**١-٢-٤-أ/ (حورس) و (سیت) دوو خوداوەند لە ئایینی میسری کۆن و سەرهەڵدانی دوانەی گەردوونی:**

لە کۆتایی هەزارەی چوارەمی پێش زایندا، هەندێ نەتەوە کۆچیان کردووە و لەگەڵ نەتەوە ڕەسەنەکانی میسردا، پێکەوە جێگیربوون، ئەم دوو پێکهاتەی دانیشتوان جگە لەوەی بەردەوام لە ململانێدابوون تا دواتر لە قەوارەیەکدا یەکخران، هاوکات بڕوایان وابوو، کە خواکانیشیان لە دژایەتی یەکتریدان.

(سیت)، کە خواوەندی دانیشتووە ڕەسەنەکان بوو لەگەڵ (حورس)دا، دوانەیەکی دژیان لە ناخ و زەینی میسرییەکاندا چاندبوو، کە وەك باوەڕێك و ئایینی میسری بەردەوام بوو، بەجۆرێك، کە میسرییەکان باوەڕیان وابوو، کە خواوەند (حورس) نوێنەری هەموو هێزە چاك و ئەکتیڤەکانە و سەروەری ئاسمان و خۆرە، کە مایەی ژیانە، بەڵام خواوەند (سیت) یەکەمین دوژمنی خۆر و هەموو ڕووناکیەکە بە جۆرە جیاوازەکانییەوە، ئەم وێنە سەرەتاییەی نێگەتیڤ و ئەکتیڤ (کارا و ناکارا) زیاتر دەربڕا لە دوانەی ڕووناکی و تاریکی، یاسا و ئاژاوەدا، بەڵام بەگشتی دوالیزمی دژیەك ڕەگەزی یەکەم و پێکهێنەری بنەڕەتی بوو لەم جیهانبینیەدا[٥١].

**١-٢-٥/ نموونەیەك لە ئایینەکانی کیشوەری ئەمریکا:**

**١-٢-٥-أ/ ئایینی (omeecuhtli) ئۆمیکوهتلی واتە، (خوای دوانەیی):**

ئەم ئایینە بۆ ئەم لێکۆڵینەوە زۆر جێگای سەرنج بوو، بۆیە وەك تەنها نموونەی ئایینەکانی کیشوەری ئەمریکا، ئاماژەمان پێدراوە، ئایینی خوای

---

[٥١] فیراس ئەلسەواح، خواوەند و شەیتان، وەرگێڕانی: بەختیار عەزیز، بڕوانە ل٦٧.

دوانەیی وەك لێکۆڵەرێك ڕوونیکردۆتەوە، دەڵێ: "ئەو بوونە بەرز و بڵندیە لە ئایینی (ئەزیتیك)ی مەکسیکی دا، کە لە دەرەوەی شوێن و کاتە، سەرچاوەی ژیانە، هەندێ لە لێکۆڵەران وایدەبینن، کە مەکسیکییەکان بێگومانن لەوەی، کە هەموو شتێك لەم بوونەدا هەڵگری یەکییەتی و یەکبوونێکە لە پێکهاتە دژ و جیاوازەکان، لە نێر و مێ، لە ڕووناکی و تاریکی، جوڵە و ئارامی، یاسا و بێ یاسایی. ئەم دوالیزمی دژیەکە، پێکهێنەری بنەڕەتی هەموو شتێکە و لە هەمووردا هەیە، هەروەها بڕوایان وایە لەم ڕاستیە بنەڕەتییەوە ژیان هاتووەتە بوون، هەربۆیە ئەم خوایە، کە شاراوەیەکی زۆر نهێنیان بۆ ئاشکرا دەکات (واتە خوای دوالیزمی دژیەك)، بەڵام ناتوانین بیناسین هەربۆیە تەنها خوایە، کە پەرەستگای نییە"[٥٢].

## ١-٢-٦/ دوالیزمی دژیەك لە ئایینی ئێزیدی (الیزیدیة)دا:

پەیڕەوانی ئەم ئایینە، کە کاریگەری ئیسلام و مەسیحی و ئایین و تەوژمی فیکری دیکەیان لەسەرە، بەتایبەتی ئایینی (مانی، یاخود مانیزم) باوەڕیان بە خوا هەیە، بەڵام لە ڕاڤەکردنی ڕۆڵی (إبلیس) شەیتان دا، ڕەنگدانەوەی دوانەیی، یاخود دوالیزمی ئایینی (مانی)یان پێوە دیارە. سەبارەت بە پێگەی (إبلیس) مەلیك تاوس دەڵێن: "ئەو خوایەی، کە سنوورێك نییە بۆ بەخشندەیی لەگەڵ دروستکراوەکانیدا، هیچ زیانێکیان پێناگەیەنێت و خراپەی ناوێت بۆ بەندەکانی، چونکە ئەو چاکە، بەڵام شەیتان شەڕەنگێزە و پەلکێشیان دەکات بۆ خراپەکاری و خۆیشی خراپە، بۆیە ژیری لەوەدایە هەر کەسێك خۆشبەختی

---

[٥٢] ا.امام عبدالفتاح امام، معجم دیانات و أساطیر العالم، ج٣، مکتبة مدبولی، ٢٠٠٨ز، ل٦٢.

دەوێت با پشت بکاتە پەرستشی خوا و هەوڵ بدات ڕەزامەندی شەیتان دەست بخات"[٥٣].

هەروەها باوەڕیان وایە، کە خوا فریشتەکانی تاقیکردەوە، کە داوای لێکردن کڕنوش بەرن بۆ ئادەم، بەڵام (إبلیس) کڕنۆشی نەبرد و بوو بە سەرگەورەی فریشتەکان، هەربۆیە پێویستە، کۆمەك لە هێزی شاراوەی شەیتان وەربگیرێ بۆ دژایەتی چاکە و پشت بە تاریکی ببەسترێ لەبری ڕووناکی، ئا بەمجۆرە خۆ بپارێزرێ لە شەڕ و گێچەڵی شەیتان[٥٤].

هەروەها لە کتێبی (جلوە)دا (کە کتێبی پیرۆزی ئێزیدییەکانە) هاتووە، مەلەك تاووس پێش هەموو دروستکراوەکان، دروستکراوە و ناوێکی دیکەشی هەیە، کە بریتیە لە (کاروبیم) واتە، پاش خوای جیهانیان[٥٥].

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە ئێزیدییەکان باوەڕیان بە دوو هێزی کارا هەیە و هەردووکیان پیرۆز ڕادەگرن، کە ئەویش (خوا)ی دروستکەر و (شەیتان)ی سەرچاوەی خراپە و شەڕەنگێزییە، بەڵام بەردەوام خێر و قوربانی و جەژن بۆ شەیتان دەکەن تا لە شەڕی دووربن و ڕازی بکەن. لێرەدا گرنگ ئەوەیە دوو هێزی بزوێنەری بوون لەم باوەڕەدا هەیە، کە چاکە و خراپە، یاخود تاریکی و ڕووناکییە.

---

[٥٣] مجموعة من المؤلفين، موسوعة العراق الحديث، مكتبة النهضة، ج٢، الطبعة الأولى، ١٩٨٩م. ل١٠٠٥.

[٥٤] محمد التونجي، اليزيديون، ل١٢٥.

[٥٥] سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٦.

## ١-٢-٧/ ئایینەکانی یەکتاپەرستی و دوالیزمی دژیەك:

بێگومان مەبەستمان لە ئایینەکانی یەکتاپەرستی، ئەو ئایینانەیە، کە لە دۆکترین (عقیدە) و جیهانبینیدا باوەڕیان بە خوای (تاك) و هەروەها لە پەرستشدا خوای تاقانە دەپەرستن و باس لە (وەحی) نیگای ئەو خوایە دەکەن بۆ مرۆڤ و هەڵگری چەندین (دۆگما)ن، کە بەشێکی دانەبڕاوە لە بڕواهێنان بە پیرۆزییەکان. لە گرنگترین و دیارترینی ئەو ئایینانە (یەهودی، مەسیحی، یاخود کریستیان و ئیسلامە).

بەر لەوەی تیشك بخەینە سەر بابەتی دوالیزم لای هەریەك لەم ئایینانە، بە پێویستی دەزانم باس لە دوو چەمك، یاخود بابەتی سەرەکی بکەم، کە پەیوەندیەکی تەنگاوتەنگییان هەیە لەگەڵ بابەتەکەی ئێمە، کە دوالیزم و دوالیزمی دژیەکە و لەم سێ ئایینەدا وەك خاڵێکی هاوبەش هەیە، کە ئەگەر وەك یەك نەهاتبێت لە باسکردندا ئەوا بابەتێکی بنەڕەتیە لە هەر سێ ئایینەکەدا و وەك کایە و بەڵگەیە بۆ بایەخ و گەردوونی بوونی مەبەست و بابەتە سەرەکیەکەی ئێمە.

### ١-٢-٧-أ/ ئیبلیس، یاخود شەیتان:

ئیبلیس (Iblis). شەیتان، یاخود سەرکردەی شەیتانەکان، لە بنەڕەتدا فریشتەیەك بووە، کە بە زمانی عیبری پێیدەوترا (Azazil)، هێمای شەڕەنگێزیە و لە هەموو ئایینەکاندا هەیە، بەڵام بە ناو و نازناوی جیاواز، هەندێك لە لێکۆڵەران ڕایانوایە: "کە وشەی (ئیبلیس) دەرئەنجامی شێواندنی وشەیەکی یۆنانی کۆنە (Diabolos) بە واتای شەیتان (Devil)، یاخود وشەی

شەیتان (Satan) بە عیبری. ئیبلیس تەخت و دەسەڵاتەکەی بەسەر (ئاو)ەوە داناوە و لەوێوە شەیتانەکان دەنێرێت بۆ لەخشتەبردنی مرۆڤەکان"[٥٦].

شەڕەنگێز = شەیتان (Devil)، وەرگیراوە لە (Evil) واتە: شەڕ، یاخود خراپە، (Do) واتە (کار)، بەسەریەکەوە (خراپەکار) شەیتان، کە بەرجەستەبووی هێزی خراپە و شەڕەنگێزیە لە جیهاندا، یاخود گیانی شەڕەنگێزی، شەیتانی گەورەش (ئیبلیس)ە، کە وشە عەرەبیەکەی لە (إلا باس)ەوە وەرگیراوە، واتە لەدەستدانی تکاکاری و بێ هیوابوون...[٥٧].

شەیتان لە هەرسێ ئایینەکەدا سەرچاوەی خراپەکارییە و هێزی شەڕەنگێزییە، بەگشتی شەیتان جەنگ و ململانێ و دژایەتی لەگەڵ مرۆڤدایە و لە هەوڵی لەخشتەبردنی مرۆڤدایە، چۆن پێشتر بووە هۆکاری گومڕاکردن و وەدەرنانی (ئادەم و حەوا) لە بەهەشت و جیهانی نەمری. بەکورتی لەم باسەی (شەیتان) لە سێ ئایینەکەدا، پەیوەست بە بابەتی (دوالیزمی دژیەك)، کە ئامانجی ئێمەیە، بەو دەرئەنجامە، مەبەستەکەمان کورت دەکەینەوە، کە (شەیتان) یەکێك لە دوو دانەی (دوالیزمی دژیەك) پێکدەهێنێت لە بەشێك لە جیهانبینی سێ ئایینە ئاسمانیەکەدا، بەڵام سەبارەت بە چییەتی ئەو یەکەی دیکەی بەرامبەر بە (شەیتان) لە هەر ئایینێکیاندا تایبەتمەندی و ڕاڤەی جیاواز هەیە، بێگومان دواتر، کە هاتینە سەر باسی (دوالیزمی دژیەك) لە هەرکام لەو ئایینانەدا بەشێوەیەکی جیاواز و تایبەت ئەو لایەنە ڕووندەکەینەوە و هاوکات چەندین ڕەگەز و بابەتی دوانەیی دیکەش لەهەرکام لەو ئایینانەدا دەخەینەڕوو.

---

[٥٦] ا.امام عبدالفتاح امام، معجم دیانات وأساطیر العالم، ج٢، ٢٠٠٨ز، ل١٧٣.

[٥٧] سەرچاوەی پێشوو، ج١، ل٢٩٦.

**١-٢-٧-ب/ چاكە و خراپە، نموونەيەكی هاوبەش لە دواليزمی دژيەك:**

مرۆڤ لەسەرەتای بوونييەوە لەم جيهان و ژيانەدا ڕووبەڕووی دوو جۆر شەڕ و خراپەكاری بووەتەوە، كە يەكەميان خراپە و وێرانكاری سروشتی و دياردەی ناوخودی سروشت بووە و دووەميان، چاكە و خراپەی ڕەفتاری نێو تاكەكانی كۆمەڵگا بووە.

جۆری يەكەميان، دياردەيەكی دەرهاويشتەی ناوخودی سروشت بووە وەكو بومەلەرزە، بوركان، لافاو و...هتد، بەڵام جۆری دووەميان دەرهاويشتەی ڕەفتاری خۆويستانەی مرۆڤی خاوەن ژيرييە، كاتێك، كە لادەدات لەو بنەما و ياسا هاوبەش و بەڵێن لەسەرردراوانەی، كە لەناو كۆمەڵگايەكدا كۆدەنگی لەسەرە و وەك بەهای هاوبەش سەير دەكرێت، وەكو دزی، ستەم، دەستدرێژی و..هتد.

لە سەرەتای ژيانی مرۆڤەوە جۆری يەكەميان دوو خوای هێزی چاكە و هێزی خراپەی پێكهێنا، بەڵام جۆری دووەميان لە ئاستی ڕەفتاری تاكەكەسيدا مايەوە و چاكە و خراپە وەكو شوناس و ڕەفتاری دوو جۆر لە كەسايەتی ناو كۆمەڵگا دەردەكەوت نەك وەك جۆری يەكەم، بەكورتی دوانەيی و دوو جەمسەری شۆڕنەبوويەوە بۆ ناو پەيوەندييە كۆمەڵايەتييەكان.

زانايەكی تر لايەنەكانی ئەم بابەتە ڕووندەكاتەوە و پێيوايە، كە دواتر ڕەوشت پەيوەستكراوەتەوە بە ئايينەوە، ئەوكاتەی، كە جيهانبينی مرۆڤ وەك يەكەيەكی پێكەوە پەيوەست و كامڵ سەيری بوونەوەری دەكرد و لەم جۆرە بيركردنەوەدا بڕوای وايە، كە ژيان و جيهان و بوونەوەر ياسايەكی وردی هاوسەنگ هەموو بەش و كايەكان پەيوەست دەكات و دەيانبات بەڕێوە،

بەجۆرێك بڕوای وایە، کە لەپشت ئەم بوونەوەرەوە هێزێکی خوایی تاك و تەنها هەیە، کە دابەش نابێت. ئەم جیهانبینییەش بەڕوونی و ئاشکرا کاتێك دەرکەوت، کە بیروباوەڕی یەکتاپەرستی سەریهەڵدا، کە بەوپێیە جگە لە (خوا) هیچ بوونێکیتر نابینێت و هەموو (خێر) و چاکەیش دەگێڕێتەوە تەنها بۆ ئەو، خودا ئەو چاکەیە، کە هەموو چاکەیەك لەوەوەیە. لێرەوە چەمکی شەیتانی گەردوونی سەریهەڵدا، کە نوێنەرایەتی خراپە دەکات لە هەموو ئاست و کایەکاندا و هەموو خراپەیەکی بوونەوەر و دەروون و ڕەفتاری مرۆڤەکانیش دەدرێتە پاڵ ئەو. بیرۆکەی شەیتان لە بیروباوەڕی ئایینیدا بووە هۆی پێکهاتنی، یاخود دروستبوونی چەمکی دینامیکیی بۆ مێژوو، چونکە شەیتان هەڵەیە، هەڵەش دەبێت ڕاست و چاك بکرێت بەبێ ڕێگەگرتن لە پرەنسیپی ئازادی و ئازادبوونی مرۆڤ، ئەم ڕاستکردنەوەیەش لەچوارچێوەی جەدەلێکی مێژوویدا دەبێت، کە لەسەر بنەمای ململانێی چاکە و خراپە دانراوە و بە سەرکەوتنی چاکە و تێکشکانی خراپە کۆتایی دێت. بە نەمانی شەیتان مێژوویش کۆتایی دێت، چونکە مێژوو بەبێ ململانێ و دژایەتی نێوان جیاواز و دژەکان، بوونی نییە[٥٨].

### ١-٢-٧-ج/ دوالیزمی دژیەك لە ئایینی یەهودی دا:

ئەگەرچی ئایینی یەکتاپەرستی بەواتای پەرستنی یەك خودا دێت لە جیهانبینی (عقیدە) و پەرستش، بەڵام بە سەربوردێکی ئایینی یەهودی ڕووبەڕووی کێشەی یەکتاپەرستی دەبینەوە لە بواری بەشی جیهانبینی

---

[٥٨] سوود وەرگیراوە لە فراس السّواح، الرحمن و الشیطان، ل٥٤.

(عقیده)دا. له پەرستیشدا تەنها کڕنۆش بۆ خوای تاقانەی نادیار دەبرێت و قوربانی بۆ دەکرێت. (وەك له تەورات له (سفر التكوين، ١٧)) هاتووە، خوایەك بەناوی (یهوه) پەیمان و بەڵێننامەیەکی لەنێوان نەوەکانی (ئیسرائیل)دا بەستووە، کە ئەگەر ئەوان ئەو خوا تاقانەیە بپەرستن ئەوا ئەویش لە بەرامبەردا زەوی (کەنعان) فەلەستینیان بە موڵکی پێدەبەخشێت.

ئەو کێشەی، کە مەبەستمانە لە بواری جیهانبینیدا، سەرەتا لە واتای هەندێك لە ئایەتەکانی (تەورات) وێنەی دوو، یاخود چەند خوایی دروست دەبێت لە زەینی خوێنەردا ". زۆرجار (یهوه) وا وەسف دەکرێت، کە گەورەترین خوایە لەنێو خواکاندا. بۆ نموونە لە (الخروج١٥: ١١)دا دەڵێ: "کێ لە وێنەی تۆیە لەناو خواکاندا ئەی خوا، کێ وەك تۆ پیرۆزە) تەنانەت ناوزەد دەکرێت بە خوای خواکان، وەك لە (یشوع٢٢: ٢١) هاتووە (نەوەکانی رائوبین وەڵامیان دایەوە و وتیان: ئەی خوای خواکان"[٥٩].

هەروەها هەمان سەرچاوە زیاتر ڕوونیدەکاتەوە و دەڵێ: "(یهوه) واتە خوای نەوەکانی ئیسرائیل بەشێوەیەکی زۆر دراماتیکیانە و لە وێنەی مرۆڤێکدا خۆی نیشاندەدات و لەگەڵ (یعقوب)دا دەکەوێتە گفتوگۆ. پاشان دەکەونە ململانێ و زۆرانبازییەوە و تەنانەت یعقوب لێی دەدات تا ئەوکاتەی هاواردەکات، کە من (یهوه)م، ئەم چیرۆکەش بە درێژی لە (سفر التكوين٣٢)دا هاتووە"[٦٠].

---

[٥٩] فراس السّواح، الرحمن و الشيطان، ل١٠٣.

[٦٠] سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٧.

تەنانەت ئەم خوایە لەگەڵ (موسا)شدا دەکەوێتە ململانێ کاتێك، کە موسا داوا دەکات بیبینێ، بەڵام ئەو ڕازی نابێت، بەڵام دواتر موسا و هارونی برای و چەند کەسێکی تر هەر دەیبینن.

بەگشتی ئەگەر لە ڕووی تێڕوانینەوە سەیری ئایەتەکانی نێو تەورات بکەین (یهوە) بەردەوام دژی هەیە و لە ململانێدایە. هەندێکجار لەگەڵ خوای دیکەدا و هەندێکجار لەگەڵ مرۆڤێکدا و تەنانەت لە سەرەتای دروستکردنی (ئادەم)دا، کە خوای گەورە واتە (یهوە) فەرمان دەکات بە (ئادەم)، کە لەو دارە نەخوات، چوونکە خواردنی بەری ئەو دارە (نەمر)ی داوەتە مرۆڤ و (یهوە)ش پێیناخۆشە کەس جگە لە خۆی نەمر بێت!![٦١]. سەبارەت بە کارەکتەری (شەیتان) و بابەتی چاکە و خراپە لە ئایینی یەهویدا، دەبینین، کە شەیتان ئامادەیە (واتە حاضر)ە و نائامادەشە.

سەرەتا وا دەردەکەوێت، کە شەیتان ڕۆڵێکی زۆر لاوەکی هەیە و (یهوە) خۆی دروستکەری چاکە، خراپە، تاریکی و ڕووناکیشە. لە (یشوع٤٥: ٧٦)دا هاتووە، کە "تەنها من خوام، نەك کەسیتر، وێنەبەخشی ڕووناکی و دروستکەری تاریکی، دروستکەری ئاشتی و هەروەها خراپە و شەڕ. من دروستکەری هەموو ئەمانەم". لێرەدا کەسایەتی خوا و شەیتان لە (یهوە)دا کۆکراوەتەوە، بەڵام هەندێکجار شەیتان وەکو (هاوبەش) لەگەڵ (یهوە)دا دەردەکەوێت و هەندێکجاریش وەك دواکەوتووی و فەرمانەکانی جێبەجێدەکات، بۆ نموونە لە (سفر لاوین) (یهوە) (عزازیل) واتە شەیتان بانگ دەکاتو پێکەوە ئەو قوربانیەی، کە کراوە و قوربانی (گوناهە) دابەشدەکەن وەك یەك بەش بەشی دەکەن.

---

[٦١] سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٧.

هەروەها لە (أشعيا)دا هاتووە، کە (یهوه) شەیتانی دروستکردووە تا کاری خراپەی پێبکات و بە (مهلك) لەناوبەر ناوی دەبات و دەڵێ: "من لەناوبەرم دروستکردووە بۆ خراپەکاری) (٥٤: ١٦). هەندێکجار ڕۆحی پیس و هەندێك بە بەڵاو دەرد ناوی دەبات و هەندێکجار پێکەوە هاوکارن بۆ تۆڵەسەندنەوە، وەك لە باسی هاوکاری (یهوه) و (شەیتان)دا هاتووە بەرامبەر بە (ئەیوبی پێغەمبەر) و لە تەوراتدا بەناوی (سفر ایوب) ئاماژەی پێدراوە"[٦٢].

بەگشتی لەم ئایینەدا جەدەلی نێوان خوا، شەیتان، چاکە و خراپە لە ڕەفتار و دەروونی مرۆڤەکاندا و ململانێی نێوان دوالیزمە دژەکان پێکهێنەری ئەو ئایدیایە. مێژوو، ململانێی نێوان ئەم دوالیزمە دژانە دەیجوڵێنێ و کۆتایی مێژوویش ئەوکاتەیە، کە چاکە سەردەکەوێت بەسەر خراپەدا و ئەوەش لەوەدا بەرجەستە دەبێت، کە مرۆڤایەتی سەرکەوتوو دەبێت لە خۆ پاککردنەوەو تێپەڕاندنی مرۆڤی ناکامڵ و گوناهکار (لە وێنەی ئادەم) بۆ مرۆڤی کامڵ لە وێنەی ئەو کەسە ڕزگارکەرەی، کە لە تەوراتدا مژدەی هاتنی دراوە.

### ١-٢-٧-د/ عیرفانی یەهودی:

(غنوصی) واتە (عیرفانیەت)، کە دراوەتە پاڵ (غنوص – Gnosis)، کە ئەویش وشەیەکە لە بنەڕەتدا یۆنانیە و بەشێوەیەکی گشتی بە واتای مەعریفە دێت. هاوشێوەشی لە زمانەکانی دیکەی هیندوئەورووپیدا هەیە. بۆنموونە بە ئینگلیزی (know) واتە دەزانێت و مەعریفەی هەیە و هەروەها (knowledge) واتە مەعریفە، ئەو مەعریفەیەی، کە چەمکەکانی (غنوص) باسی دەکات، زیاتر

---

[٦٢] فراس السّواح، الرحمن و الشیطان، ل١٣١.

نزیکە لەو چەمکەی (عیرفان)، کە لە تەسەوفی ئیسلامیدا بەکاردێت. بەگشتی و لە هەموو ئایینەکاندا، واتە ئەو چالاکیە ڕۆحی و دەروونیەی، کە دەمانگەیەنێتە مەعریفەی نهێنییەکانی خوایی لەڕێگەی ئەزموونکردنی (تجربەی باطنی)یەوە، کە دەرئەنجام سەر لە (کشف) و (الأستنارة) ئاشکراکردن و بەرچاو ڕۆشنییەوە، دەردێنێت.

لەبەرامبەر ملکەچی یەهودیەك بۆ شەریعەت و بەجێگەیاندنی سرووتەکانی و هەروەها لەبەرامبەر باوەڕی مەسیحییەکدا بە (یسوع) ڕزگارکەر، کەسێکی (غنوص) عارف ئەو ڕێگایە دەگرێتەبەر، کە بە ئەزموونی عیرفانی خۆی بەرەو مەعریفەی خوایی بڕوات، ئەویش ڕێگای (ذوق) و (کشف) و (ئیلهامە). ئەم مەعریفەیەش تەنها ڕێگای ئازادکردنی ڕۆحە لە زیندانی جەستەی، مادی و بگەڕێتەوە بۆ جیهانی ڕووناکی بالا، کە لێوەی هاتووە[٦٣].

هەروەها هەمان زانا بەردەوام دەبێ و دەڵێ: " ئەو خوایەی، کە کەسی عارف لە ناخیدا بەدوایدا دەگەڕێ، (یهوە) نییە، کە دروستکەری ئەم جیهانە مادديەیە، بەڵکو ئەو خوا بالایە، کە دوالیزمەکانی نێو دروستکراوەکانی تێپەڕاندووە و بڵندترە لەوان. ئەوان باوەڕیانوایە، کە ئەم جیهانە کەموکورتە و لێوانلێوە لە خراپەکاری و دروستکراوی خوا نییە، بەڵکوو لە دروستکراوی خوایەکی نزمە، کە خوای نێو (تەوراتە). ئەو خوایە بەراورد دەکەن لەگەڵ خوای خراپەی ناو ئایینی (زەردەشت) و ناوزەدی دەکەن بە (فەرمانڕەوای تاریکی)، کە فەرمانڕەوای جیهانی مادديە. ئەم خوایە دژە لەگەڵ خوای ڕووناکی جیهانی بالادا، کە هیچ وەسف و ناوێك ناتوانێت گوزارشتی لێ بکات و

---

[٦٣] سەرچاوەی پێشوو، بڕوانە ل٢٠٤.

ئەم خوایە بەردەوام کار لەسەر هێشتنەوە و دەرنەچوونی ئەو بەشە ڕووناکیە ئاسمانیە دەکات، کە لە ناوەڕۆکی دروستکراوەکانی جیهاندایە. هەر ئەم خوایە کاتێك دابەزیە سەر دروستکردنی مرۆڤ وەك دواکاری دروستکردن و جەستەی ئەم مرۆڤەی لەو ماددە تاریکیە دروستکرد، پاشان ڕۆحی، کە لە ڕووناکییەکانی باڵاوە وەریگرتووە خستیە ناو جەستەیەوە و بۆئەوەی لەچوارچێوەی نەزانیدا بمێنێتەوە (شەریعەت)ی بەسەردا فەرزکرد. (شەریعەت) تەنها سەرقاڵکردنی مرۆڤە تا نەگاتە عیرفان و (اکتشاف) و ناوەڕۆکی ڕاستەقینەی ڕۆح"[٦٤].

١-٢-٧-هـ/ دوالیزمی دژیەك لە ئایینی مەسیحی دا:

"لەسەرەتاوە وشەیەك بوو، وشەکەش لای خواوە بوو، وشەی خوا بوو. سەرەتاکان لای خوا بەمجۆرەبوون. هەموو شتێك بەوەوە هەبوو، بەبێ بوونی ئەویش هیچ شتێك لەوەنەبوو، کە هەیە"[٦٥].

هەروەك لە ئینجیلدا هاتووە: "لە ئەزەلدا هیچ شتێك نەبوو جگە لە خوا، بوونێکی لەخۆوە و دروستنەکراو، هەمووی ڕووناکی، بەڵام نەك لەوجۆرە ڕووناکیەی، کە دوایی دروستکرا، بەڵکو ڕووناکی شکۆ و سەروەری. ئەم بوونە بەشێوەیەکی ئاڵۆز و نهێنی، کە لە چۆنیەتیدا (سێ لەیەك و یەك لە سێ بوو)، کە ئەوانیش (باوك) و (کوڕ) و (گیانی پیرۆز) بوون، لە ئەزەلەوە کوڕ لە باوك و

---

[٦٤] فراس السّواح، الرحمن و الشیطان، ل٢٠٤.

[٦٥] ئینجیلی پیرۆز، چاپخانە زانکۆی صلاح الدین- هەولێر ١٩٩٨ ز.

گیانی پیرۆزیش لە هەردووکیان بووەتەوە، کەواتە سێ سەروەر و یەك خوان"[٦٦].

لە باوەڕی مەسیحیدا فریشتەکان یەکەم دروستکراوی خوان، کە لە چەقی ڕووناکییەوە دەرچوون و دابەشبوون بەسەر حەوت ئاسماندا، کە هەمووی ڕووناکییە، لەناو فریشتەکاندا (لوسیفر)، کە جوانترین و بەڕێزترین فریشتەیە، پێیوابووە خوا لەو باشتری دروستنەکردووە بۆیە، کە خوا پلانی دروستکردنی ئادەمی دانا، (لوسیفر) هەموو پلانی خۆی بۆ بەرەنگاری ئەو دروستکراوە نوێیە خستە کار[٦٧]. سەبارەت بە ئادەمیش لە ئایینی مەسیحیدا: "ئادەم بەرجەستەبووی مرۆڤێکی کامڵ بوو، کە خوا ویستوویەتی، ئەویش سەرەتا وەك فریشتەکان نەمر بوو ئەگەرچی لە ماددە دروستکراوە، هەروەها وەك فریشتەکان خاوەنی ویست و ئازادی بوو، لەسەر زەوی. خوا نموونەی بەهەشتێکی وەك ئەوەی باڵای بۆ دروستکرد، کە هەموو شتێك تیایدا حەڵاڵ بوو، تەنها بەرووبوومی درەختێك نەبێت. واتە خۆی و (حەوا)ی خێزانی، کە دواتر لە پەراسووی ئادەم دروستکرا، بەڵام دواتر شەیتان هەروەك فیشکە فیشی (مار) دەیچپاند بەگوێی (حەوا)دا و دەرئەنجام ڕازی کرد، کە لە بەری ئەو دارە بخوات و دەرخواردی ئادەمیشی بدات. شەیتان سوێندی بۆ خواردن ئەگەر لەو دارە بخۆن ئەوا ئێوەش وەك خوا زانستی چاکە و خراپە دەزانن. ئەم هەواڵە، کە گەیشتە لای خوا (واتە هەواڵی یاخی بوونی ئادەم)، (خوا) نەفرەتی گەورەی کرد لە (ابلیس) و (ئادەم) و هەموو جیهانی ماددە. چونکە

---

[٦٦] فراس السواح، الرحمن والشیطان، ل٢٠٥.

[٦٧] سەرچاوەی پێشوو، بڕوانە لاپەڕەکانی ٢٤٠ بۆ ٢٥٢.

مرۆڤ سەروەری ئەم جیهانەیە، خوا ئادەمی لە بەهەشت دەرکرد و ناردیە سەرزەوی خۆڵ، کە خۆی لەوە دروستبوو بوو، بەمشێوەیە جیهانەکەشی فڕێدرایە سەر زەوی"[٦٨].

ئایینی مەسیحیش وەکو نموونەی ئایینەکانی پێشوو ڕاڤەیەکی دوالیزمیانەی هەیە بۆ (بوون) ئەگەرچی لە بنەڕەتەوە باسی دووخوایی نەبێت، بەڵام لە ژیاندا ململانێی شەیتانو مرۆڤ ئامانجی سەرەکییە، کە نوێنەرایەتی هێزی چاکە و خراپە دەکەن. ئەوە جگە لەوەی باسی جیهانی باڵا و خوارەوە ڕووناکی و جیهانی تاریکی و... چەندین بابەتی دیکەش، بۆ بابەتەکەی ئێمە، کە گەردوونی بوونی دوالیزمی دژیەکە، بەڵگەیەکی ئاشکرایە.

### ١-٢-٧-و/ عیرفانی مەسیحی:

لە بابەتی عیرفانی (یەهودی)دا باسی زاراوە و چەمکی (غنوص)ی، یاخود عیرفانمان کرد، کە لێرەدا پێویستی بە دووبارەکردنەوە نییە، بەڵام بە پێویستی دەزانم بڵێم، عیرفانی (مەسیحی)یش، کە درێژکراوەی عیرفانی یەهودیە، بەهەمانشێوەی ئەوان لە ڕێگای گەیشتن بە (بصیرت)ی ناخ و دەروونەوە دەگەنە ڕاستی گشتی و ڕەها و نەیارەکانیشیان واتە ناعارفەکان (agnostics)، ئەوانەن، کە ڕووکەشی ڕێنماییە ئایینییەکانیان وەرگرتووە و نەچوونەتە ناوەڕۆکی. هەربۆیە ئەگەر ڕزگاربوون لای یەهودیەك بە پەیوەستبوون بێت بە شەریعەتەوە و لای مەسیحیەك لەڕێگەی باوەڕهێنان بێت بە (یسوع) مەسیح، ئەوا ڕزگاربوون لای عارفێك بە ڕێگای چالاکی ڕۆحی

---

[٦٨] فراس السواح، الرحمن والشیطان، ل٢٥٢.

دەروونی دەبێت، کە دەرئەنجام عارف مەعریفەی دەبێت بە (نەفس)ی خۆی و دواتر مەعریفەی نەفس سەردەکێشێت بۆ مەعریفە، یاخود پەیبردن و ناسینی مرۆڤ دواتر لە قووڵترین حاڵەتیدا سەردەکێشێ بۆ مەعریفە و ناسینی خوایی. هەربۆیە گوناه و خراپە دوژمنی مرۆڤ نییە، بەڵکو (نەزانین) دوژمنی مرۆڤە (واتە کارکردن لەسەر دوالیزمی زانین و نەزانین). هەر لێرەوە لای عارفەکان (مەسیح) زیندوو تەنها هێمایەکە بۆ زانینی ڕاستی[٦٩].

بەهەمان شێوەی عیرفانی یەهودی، لای عارفانی مەسیحیش، ئەو خوایەی لە ناخدا بەدوایدا دەگەڕێن، ئەو خوایە نییە، کە ئەم جیهانە ماددیەی دروستکردووە، کە پڕە لە ئازار و خراپەکاری و مردن، بەڵکوو مەبەست لەو (باوکە) پڕ لە ڕووناکییەیە، کە دوانەیی نێو دروستکراوەکانی تێپەڕاندووە و هیچ وەسف و ناوێك گوزارشتی لێ ناکات. "یەکێك لە خاڵە جیاوازەکانی عیرفانی مەسیحی لە ئایینی مەسیحی ئەوەیە، کە ئەم جیهانە ماددییە دروستکراوی خوا نییە، بەڵکو دروستکراوی خوایەکی پلە نزمە، کە خوای یەهودە، کە ئەدەبیاتی عیرفانی مەسیحی لە شێوەی دروستکراوێکی شێواودا وێنەی دەکات، کە بەشێکی مارە و بەشێکی شێر و دوو چاوی سووری ئاگراوی هەیە و لەسەر تەختێك دادەنیشێ، کە دار و دەستەکەی لە هێزی تاریکی دەوریان داوە"[٧٠].

---

[٦٩] فراس السواح، الوجه الآخر للمسيح. منشورات دار علاءالدين، سورية – دمشق. الطبعة الأولى، ٢٠٠٤م. ل٦٦.

[٧٠] فراس السواح، الرحمن والشيطان، ل١٤٩.

ئەم جۆرە وێناکردنە، عیرفانی مەسیحیش دەخاتە ڕیزبەندی بیروباوەڕە (دوانەیی)یەکانەوە، کە باوەڕی بە دوو دەستپێك، یاخود دوو ڕەگەز و بنەڕەتی جیاواز و دژ هەیە، کە بەردەوام لەپشت هەموو دیاردەکانی بوونەوە، لە ململانێ و دژایەتیدان و لە هەموو ئاستەکاندا دوالیزمیان دروستکردووە. دەرئەنجام ململانێی نێوانیان ڕەوڕەوەی مێژوو دەجولێنێ، مرۆڤایەتی بەرەو کۆتایی دەبات بەپێی سێ قۆناغ، کە دوا قۆناغیان سەرکەوتنی چاکە بەسەر خراپەدا. ئەم دوالیزمە بە دوالیزمی گەردوونی ناوزەد دەکرێت، چونکە دژایەتی نێوان ئەم دوو ڕەگەزە شۆڕبووەتەوە بۆ نێو هەموو بازنەکانی، یاخود بوارەکانی گەردوون و ژیان.

## ١-٢-٨/ دوالیزمی دژیەك لە ئایینی ئیسلامدا:

دیارە ئێمە مەبەستمان لەم ڕانان و باسە کرۆکییە زۆرکورتەی دوالیزمی دژیەك، هەڵچنین و دارشتنی سەرەتایەکە بۆ چوونە ناو کرۆکی لێکۆڵینەوەکەمان، چونکە ئەو دوو شاعیرەی، کە ئێمە دەمانەوێ دەربارەی ئەم چەمکە لە بەرهەمی شیعری لیریکیاندا بدوێین مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزین. ئەوانیش زادەی نێو ترادسیۆنی ئیسلامی و عیرفان و تەسەوفی ئیسلامین و پێکهێنەر و پاڵنەری شیعر و ئەدەبیانە و لەهەمانکاتدا بە بەرهەمەکانیان پانتاییەکی گەورەیان لەو ترادسیۆنە پڕکردۆتەوە. بۆیە بە پێویستی دەزانین بەشێوەیەکی کەمێك زیاتر لە بابەتی دوالیزم و دوالیزمی دژیەك لەم ترادسیۆنەدا بدوێین. واتە باس لە جیهانبینی و دۆکترین و فەلسەفە و عیرفان و تەسەوفی ئیسلامیدا و چۆنیەتی کەوتنەوەی ئەم بابەتە لای هەندێ ڕەوت و ڕێچکەی فیکری و زانای ناوداری ئیسلامی بکەین.

وەك دکتۆر علی شەریعەتی دەڵێت: "دوانەیی و دوالیزم لە ئیسلامدا تەنها لە (جیهانی مرۆڤ)دایە و ئەم دوانەییەش لە (جیهانی مرۆڤ)دا، ئیسلام دانەری نییە و پێشنیاری نەکردووە و مرۆڤەکانی بۆ بانگهێشت نەکردووە. لە بنەڕەتدا (مرۆڤ) بوونەوەرێکی (دوانەیی)یە، هەر کەسێك بەو ڕێژەی، کە ئاگایی لە (خود)ی خۆی هەیە هەست بە دوانەیی لە خۆیدا دەکات، دووفاقەیی و دوانەیی لە ناخی خۆیدا دەدۆزێتەوە و ململانێی نێوان دوو هێزی تاریکی و ڕووناکی دەبینێت.

هیچ ڕاستیەك هێندەی ڕاستی دوالیزمی دژیەك، لە مرۆڤدا ئاشکرا نییە. ململانێ و شەڕی نێوان (تاریکی و ڕووناکی)، (ئەهریمەن و ئاهورامەزدا)، لە جیهانی گەورە و باڵادا نییە، بەڵکو لە جیهانی (بچووك)دایە. شەیتان نەیاری خوا نییە، بەڵکو بەندەیەتی، بەڵام نەیاری مرۆڤە. کەواتە مرۆڤ لە ڕوانگەی قورئانەوە، بوونەوەرێکە لە پێکهاتەیەکی دژیەك. دوو هێزی دژیەك بەرە و دوو جیهانی دژیەك بانگهێشتی دەکەن: یەکێکیان بەرەو نزمی و پەستی و ئەوی دیکەیان بەرەو بەرزاییەك، کە هەموو فریشتەکان کڕنووشی ڕێزی بۆ دەبەن. مرۆڤ بەردەوام لەبەردەم ئەم دوو ڕێگە جیاواز و دژەدایە و شەیتانیش (ئیبلیس) بەردەوام لە هەوڵی لەخشتەبردنیدایە و یەخەی بەرنادات"[٧١].

بیروباوەڕی ئیسلام لەسەر بنەمای باوەڕبوون بە خوای تەنها و دروستکەری تاقانە دامەزراوە. "یاأیها الذین آمنوا آمِنوا بالله و رسوله و الکتاب الذي نزَّل علی رسوله والکتاب الذي أنزل من قبل ومن یکفر بالله وملائکته وکتبه ورسله والیوم الآخر فقد ضل ضلالاً بعیداً"[٧٢]، بێگومان ئەم باوەڕە پەیوەستە بە بوونی

---

[٧١] علی شەریعەتی، فرهنگ لغات، ل١٤٨.

[٧٢] قورئانی پیرۆز، سورەتی النساء، ئایەتی ١٣٦.

کرداری چاکەوە و باوەڕی تیۆری بەتەنها بەس نییە "وأما من آمن وعمل صالحاً فله جزاءً الحسنی"[٧٣].

باوەڕبوون بە شەیتان ڕەگەز و مەرجێك نییە لە بنەماکانی بیروباوەڕی ئیسلام، بەڵام بڕوابوون بە هەبوونی و ڕۆڵی لە ژیانی تاك و کۆمەڵگادا لەسەر هەموو موسڵمانێك پێویستە "إن الشیطان کان للأنسان عدواً مبیناً"[٧٤].

"ئەگەرچی هاوشێوەیی و هاوبەشییەك لەنێوان شەیتانی نێو ئایینە دوانییەکان و شەیتانی باوەڕی ناو قورئاندا هەیە، بەڵام کرۆکی باوەڕە قورئانییەکە هەر لە بنەڕەت و سەرەتاوە لە خاڵێکی زۆر گرنگدا جیاوازە، ئەویش ئەوەیە: شەیتان لە ئیسلامدا بەرامبەر و نەیاریی لەگەڵ خوادا نییە و بەگشتی بۆماوەیەکی کەم، یاخود کاتیش بێت لە ئاست و جەمسەری بەرامبەر خواییدا نییە، بۆیە هیچ هێزی دروستکردنی نییە و تەنانەت توانای بەسەر هیچ دروستکراوێکدا ناشکێ، بەکورتی نە هێزی هەیە و نە دەسەڵات. جگە لەمەش شەیتان دروستکەری سەرەتایی خراپە و خراپەی گەردوونی نییە و خاوەن و دەسەڵاتداری (جیهانی خراپە) نییە. چاکە و خراپە دوو ئەگەرن، دوو ویستراوی سروشتین کە خوا خستوویەتییە بەردەم مرۆڤ بۆ تاقیکردنەوە و خواستی ئازادانەی مرۆڤ و وەك ڕێزلێنانێك بۆ مرۆڤ لەچاو دروستکراوەکانی دیکەدا، کە ناعاقڵن"[٧٥].

"کل نفس ذائقة الموت ونبلوکم بالشر والخیر فتنة وإلینا ترجعون"[٧٦].

---

[٧٣] قورئانی پیرۆز، سورەتی الکهف، ئایەتی ٨٨.

[٧٤] قورئانی پیرۆز، سورەتی الأسراء، ئایەتی ٥٣.

[٧٥] فراس السّواح، الرحمن و الشیطان، ل٢٧٧.

[٧٦] قورئانی پیرۆز، سورەتی الأنبیاء، ئایەتی ٣٥.

وێڕای سنووردارببوونی کاری شەیتان تەنها لە بوارە ڕەوشتییەکەدا، توانایی لەسەر کاریگەربوون لەم بوارەشدا دیاریکراو و سنووردارە. بەجۆرێك، کە دەسەڵاتی، یاخود کاریگەری تەنها لەسەر ئەو کەسانەیە، کە خواستی خۆیان بەکارهێناوە لەهەڵبژاردنی خراپەدا و داویانەتە پاڵ خراپەکاری و شەیتانیش زیاتر و زیاتر هانیان دەدات و کارەکەیان لا جوان دەکات، بەڵام هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر چاکەکاراندا نییە، کە چاکەکارن. "إنه لیس له سلطان علی الذین آمنوا وعلی ربهم یتوکلون، إنما سلطانه علی الذین یتولونه والذین هم به مشرکون"[٧٧].

هەروەك قورئانیش لەسەر زاری شەیتان ئاماژەی پێدەدات: "وما کان لي علیکم من سلطان إلا أن دعوتکم فاستجبتم لي، فلا تلوموني ولوموا أنفسکم"[٧٨].

توێژەرێك ئەمە لێکیداوەتەوە و دەڵێ: "کورتەی چەمکی چاکە و خراپە لە باوەڕی قورئانیدا ئەوەیە، ئەم دوو دژە لەناو دەروونی خودی مرۆڤدا هەن و لە دەرەوەی خۆی بۆی نایەت، بەرامبەر بەم ڕاستیە گەورەیە، مرۆڤ پێویستە جوامێرانە هەڵوێست وەرگرێ، بەجۆرێك، کە شایستە بێت بە شکۆی جێگرەوەیەکی خوا (کە مرۆڤە) و دژایەتی و ململانێی خراپە بکات لە ناوخۆی و دەرەوەی خۆیدا، تا مێژوو بەرە و ئامانجی باڵا بەرێت و ئەم جیهانە پڕ کە لە دوالیزمی دژیەکە، تێپەڕێنێت بەرەو جیهانێکی تەواو چاك و کامڵ"[٧٩].

---

[٧٧] قورئانی پیرۆز، سورەتی النحل، ئایەتی ٩٩ – ١٠٠.

[٧٨] قورئانی پیرۆز، سورەتی ابراهیم، ئایەتی ٢٢.

[٧٩] فراس السّواح، الرحمن و الشیطان، ل٢٧٩.

له قورئانی پیرۆزیشدا هاتووه: "ونفس وما سواها، فألهمها فجورها وتقواها، قد افلح من زكاها، وقد خاب من دسّاها"[٨٠].

خوای گەورە مرۆڤی دروستکردووە لە دوو پێکهاتە، کە دوالیزمی دژیەکن، بەڵام لە مرۆڤدا کۆبوونەتەوە، کە ئەوانیش (گیان) و (مادده)ن.

خوا یەکەمجار، کە مرۆڤی دروستکرد (ئادەم) و (حەوا)ی دروستکرد، کە دوو ڕەگەزی جیاوازن، بەڵام تەواوکەری یەکترین.

بەگشتی ئەم جیهانە (بچووکە)، (مادده)یە، جیهانی دوانە و دوالیزمەکانە. لەئەنجامی خوێندنەوەی جیاجیا بۆ ئیسلام و باوەڕی ئیسلامی بەگشتی، چەندین ڕێچکە و ڕێبازی جیاواز سەریهەڵداوە، کە زۆرجار بابەتی (دوالیزم) بابەت و هۆکاری سەرەکی، یاخود کەرەسە و هۆکاری لاوەکی پێکهێنان و جودابوونەوە و دروستبوونی بووە. لەوانەش چەندین ڕێبازی فەلسەفی و ڕێچکەی عیرفانی، کە بەپێویستی دەزانم ئاماژە بەسەرەکییەکانیان بکەم.

### ١-٢-٨-أ/ (الباطنية) دەروونگەراکان:

(باطنية)، یاخود ڕێچکە و ڕێباز و قوتابخانە (باطنیەکان) دەروونگەراکان زۆر پێش ئیسلامە و تەنها لەناو ترادسیۆنی ئیسلامیدا بوونی نییە، بەڵکو لە ژیانی پێش مێژوودا (واتە مێژووی نووسراو) هەبووە لە سەرەتای مێژووی

---

[٨٠] قورئانی پیرۆز، سورەتی الشمس، ئایەتەکانی ٧، ٨، ٩، ١٠.

نووسراویشدا (لەگەڵ جادووگەریدا) دیاردەی باوی سەردەم بوون، بە چەندین شێواز و جۆر، کە لێرەدا دەرفەتی ئاماژەپێدان و باسکردنمان نییە[٨١].

بەگشتی و بەکورتی بڕوای (باطنیة) دەروونگەراکان لەوەدا کۆدەبێتەوە، کە دوو جۆر (جیهان) هەیە، یەکەمیان جیهانی ئاشکرا و بینراو، کە جیهانی ماددەیە و جیهانی هەستەکانە. ئەم جیهانە بڕاوەیە، واتە کۆتایی دێت و (محدث)ە، (ازلي) نییە و تەنها دەربڕین و نموونەیەکە بۆ جیهانی (باطن) دەروونو ناوەوە، کە ئەوە جیهانی نەبڕاوە و ڕاستییە. جیهانی ئاشکرا و بینراو بە هەستەکان دەبینرێت، کە ئەم جۆرە هەستپێکردنە هەموو خاوەن گیانێك لە دروستکراوەکانی دیکە هاوبەشن تێیدا، بەڵام گەردوونی شاراوەی دەروون لە تایبەتمەندییەکانی ئەوەیە، کە بە (عەقڵ) پەی پێدەبرێت نەك بە هەستەکان. مرۆڤ ناتوانێت بەرەو ئەو جیهانە بەڕێکەوێت مەگەر بەهۆی، یاخود لەڕێی (هێزە عەقڵیە)کانەوە. وەك خەون، خەیاڵ و ئەندێشە و (خەواندنی موگناتیسی) و... چەندین ڕێگە و شێوازی دیکەی دەروونگەراکان. کە واتە (ظاهر) پێش (باطن)ە هەروەك لەپێشبوونی (فکر بەر لە کردار)، (کار بەر لە دەرئەنجام)، (هۆکار بەر لە کار)... هەموو ئەمانە واتایەکمان پێدەدەن، کە (خوا) جیهانی خوارەوە واتە (ظاهر)ی دروستکردووە تا مرۆڤ هەموو ئەزموونەکانی لە بوارەکانی (چاك و خراپ)، (پاك و پیس)، (باوەڕ و بێ باوەڕی)، (ڕووناکی و تاریکی)...هتد، لەو جیهانەدا پراکتیزە بکات. هەموو ئەمانە شیاوی جیهانی باڵا (باطن) نین و

---

[٨١] محمد عزیز الوکیلی، المدارس الباطنیة، دار الحوار للنشر والتوزیـع، الطبعـة الأولی، ٢٠٠٧م. بڕوانە لاپەڕەکانی ٢٧ بۆ ٧٧.

جیهانی باڵا دوورە و پاکە لە هەموو دژیەکبوونێك، بەڵام جیهانی ئاشکرا جیهانی تێکەڵکردنی دژەکانە.

مرۆڤ لەم جیهانەدا بەردەوام بەدوای ناسینی خۆیدا عەوداڵ بووە، بەڵام بە سەلیقەی عەقڵی خۆی ئەوەی زانیوە، کە ناکرێت (بوون) تەنها لەم جیهانە بینراوەدا کورتبکرێتەوە. بۆیە بە (نظرة)ی زانیویەتی، کە هێزێکی شاراوە هێڵەکان دەجوڵێنێ و ئاراستە دەکات و یاساکان دادەنێت و پەیوەندییەکان ڕێکدەخات. لەبەرئەوە بەردەوام لە هەوڵی پەیوەندیکردندا بووە بۆ گەیشتن و پەیوەندی کردن بە جیهانی (باطن)ەوە[٨٢].

لە سەرەتای مێژووی مرۆڤایەتییەوە چۆنیەتی ڕاڤەکردنی هەردوو جیهانی (باطن) و (ظاهر) و ئەگەری پەیوەندکردن بە جیهانی (باطن)ەوە، چەندین قوتابخانەی (باطن)ی خستووەتەوە، بەڵام ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە ڕێچکەکانی (باطنیة)یەتە لە مێژووی ترادسیۆنی ئیسلامدا. ئەوەش بێگومان بابەتی دوالیزم و دوالیزمی دژیەك ڕۆڵی بنەڕەتی و سەرەکی هەبووە لە خستنەوە و جیاوازی و ئاراستەکردنی ئەم ڕێچکانەدا.

لە مێژووی ئیسلامیدا چەندین ڕێچکە و ڕێباز هەن، کە بە (باطن) لادەر و دەرچوو لە ئیسلام ناوزەد دەکرێن، بەڵام بەشێکن لە کۆی ڕۆشنبیری جیهانی ئیسلامی و ڕێچکەکانیان لەسەر بنەمای، یاخود سەر بە ترادسیۆنی ئیسلامییە و لە ئاستێکی مەعریفیدا بابەتێکیان، یاخود چەند بابەتێکیان کردووەتە زەمینەی ڕەخنەگرتن و دەرخستنی شوناسی، یاخود تایبەتمەندی خۆیان و زۆرجار ئەو بابەتە، کە کرۆکی ڕەخنە و جێگای

---

[٨٢] محمد عزیز الوکیلی، المدارس الباطنیة، بڕوانە لاپەڕەکانی ٩ بۆ ٢١.

باسکردنیان بووە، لە خودی خۆیدا بابەتێکی دوالیزمی دژیەك بووە. بۆیە داوای بەڵگە و قەناعەتپێکردنی عەقڵیان کردووە، کە دواتر سەری کێشاوە بۆ بواری دیکە. بۆنموونە بابەتی (سیفات و ناوەکانی) خوای گەورە لەوانە: "الظاهر، الباطن، الأول، الآخر..."... هەروەها ناو و سیفاتەکانی دیکە، کە بە سەیرکردنێکی گشتی دوالیزمی دژیەکی تێدا بەدیدەکرێت. ئەم بابەتەی نێو (سیفات و ناوەکانی خوای گەورە)و جیهانی دیار و نادیار و پێکهاتەی مرۆڤ لە جەستەیەکی دیار و (رۆح)ێکی نادیار و چەندین بابەتی دیکە کەرەسەی (باطنیة)کان بووە بەگشتی بە لادەر و ڕاستەڕەوەوە. بە پێی ئەو دابەشکردنەی کە زانا و فەیلەسووفی ئیسلام (ابو حامد الغزالی) بەشێوەیەکی گشتی لە ترادسیۆنی ئیسلامیدا بۆ (باطنییەکان)ی کردووە، (باطنییەکان) دابەش دەبن بەسەر دە جۆردا:

: "الباطنية، القرامطة، القرمطية، الخرّمية، الخرمدينية، الأسماعيلية، السبعّية، البابكية، المعمّرة، التعليمية"[٨٣]. ئێمە لێرەدا دەرفەتی ئەوەمان نییە باسی هەرکام لەم ڕێچکانە بکەین و ئەوەی لە هەرکام لەم ڕێچکانەدا بۆ ئێمە گرنگە چۆنیەتی کەوتنەوەی بابەتی دوالیزمی دژیەکە لای ئەم ڕێبازانە. خۆشبەختانە (الشهرستانی) لە کتێبی (الملل والنحل)دا لەسەر بنەمای جیاوازی و دژایەتیان ئەم ڕێچکانەی پۆلێن کردووە، کە لێرەدا ئاماژەیان پێدەدەین:[٨٤]

---

[٨٣] ابو حامد الغزالي، فضائح الباطنية، تحقيق و تقديم: عبدالرحمن البدوي، إصدار مؤسسة دار الكتب الثقافية – الكويت. بڕوانە ل١١.

[٨٤] محمد عزيز الوكيلي، المدارس الباطنية، بڕوانە ل١٨٠.

گروپی یەکەم: ململانێ و جیاوازیان لەسەر سیفاتی خوای گەورە و بابەتی یەکتاپەرستی لەو سیفاتانەدا، کە سیفاتەکان لەچوارچێوەی دوالیزمەکانی (أزلي) و (حادث)، سیفاتی (ذات) و سیفاتی (فیعل)... کە ململانێکە لەنێوان (الأشعرية) و (الكرامية) و (المعتزلة)دا بوو.

گروپی دووەم: ململانێ و جیاوازیان لەسەر چارەنووس (القدر) و (عدل)ی خواییدابوو، کە وەکو دوالیزمی دژیەك سەیریان دەکرد، کە بابەتەکانی لەم دوالیزمانەدا خۆی دەبینییەوە: قەزا و قەدەر، (جبر) و (اکتساب)ی بوون، ویستی چاکە و خراپە، زانراو و نەزانراو... کە ململانێکە لەنێوان ڕێچکەکانی (القدرية، النجارية، الجبرية، الأشعرية، الكرامية)دا بوو.

گروپی سێهەم: ململانێ و جیاوازیان لەسەر (الوعد) و (الوعيد) ناوەکانی پەیوەست بەم بابەتەوە بوو، کە بابەتە دوالیزمەکانی (باوەڕ و تەوبە، (خوف) و (رجاء)، گومڕاکردن و ڕێنمایی کردن، (مضل و هادي))، دەگرتە خۆی، کە ململانێکە لەنێوان ڕێچکەکانی (المرجئة، الوعيدية، المعتزلة، الكرامية، الأشعرية)دا بوو.

گروپی چوارەم: ململانێ و جیاوازیان لەسەر (بیستن) و (عەقڵ) (نیگا) و پاکیزەیی و مرۆڤبوونی (ئیمام)دا بوو، کە زۆر بابەتی جیاوازی دوالیزمی دژیەکی دەگرتەخۆی و ململانێکە لەنێوان (الشيعة، الخوارج، المعتزلة، الكرامية، الأشعرية)دا بوو.

### ١-٢-٨-ب/ عیرفان و تەسەوفی ئیسلامی:

ئەگەرچی هاوبەشی و هاوشێوەی هەیە لەنێوان عیرفانی یەهودی و مەسیحی و ئیسلامیدا، بەڵام ئەمە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی، کە عیرفان و تەسەوفی ئیسلامی درێژەپێدەری هەمان ڕێچکە و ڕێچکەکانی دەروونگەراییە لە

ئایینە کۆنەکانی هیندوئاسیادا، چونکە باسی پاککردنەوەی دەروونی بوونی ململانێی چاکە و خراپە لە دەروونی مرۆڤدا بابەتێکی پەروەردەیی و ئەخلاقی ڕەسەنە و چاکبوونی گەردوون پەیوەست کراوە بە چاکبوونی نەفسی مرۆڤەوە "أن الله لایغیروا ما بقومٍ حتی یغیروا ما بأنفسهم"[٨٥].

"عیرفان ڕێچکەیەکی فیکرییە، کە لە (فیطرەت)ی چۆنیەتی مرۆڤ سەرچاوەی گرتووە. مانای گشتی عیرفان، هەستکردنە بە ختوکەدان و بزوانێکی دەروونی مرۆڤ لەم جیهانی ماددە و سروشتەدا. ئەم هەستە دەرئەنجامی دڵەڕاوکێی مرۆڤە لەو کەمی و کورتهێنانەی، کە لە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و و سروشتدا هەیە، واتە بەو ئەندازە و ڕێژەی، کە مرۆڤ پەی بە مرۆڤبوونی خۆی دەبات بەو ڕێژەیەش خواست و پێداویستی ئەوتۆی دەبێت، کە سروشت ناتوانێت وەڵامدەرەوەی بێت، بۆچی؟ چونکە سروشت ئەو شوێن جێگایە، کە مرۆڤ و گیاندارەکانی دیکە پێکەوە تێیدا دەژین و ئەم سروشتە لەسەر بنەمای خواستە ئاژەڵییەکان دروستکراوە. مرۆڤ چەندین خواستی هەیە، کە لە سروشتدا بەدەست نایەن، لێرەوەیە، کە هەستکردن بە (نامۆبوون) لە مرۆڤدا سەرهەڵدەدات و ئەم تینوێتی و خواستە لە مرۆڤدا دروستدەکات، کە سەرچاوە بنەڕەتیەکە لە (تجلی) بوونی گیانی عیرفانی مرۆڤدایە. کەواتە ئاساییە مرۆڤ بۆ دەستخستنی خواستی باڵا بیر لە جیهانی مەعنەوی بکاتەوە، چونکە تا لە سروشتدا زیاتر گەشە بکات زیاتر هەست بەو پێداویستی و نامۆبوونە دەکات. بەکورتی ئەو جیهانەی، کە لێرە نییە جیهانی (غیب)ە،

---

[٨٥] قورئانی پیرۆز، سورەتی الرعد، ئایەتی ١١.

کەواتە عیرفان (تجلی) (فیطر)ەتی مرۆڤە بۆ چوونی بەرەو (غیب) و ئاشکراکردنی"[٨٦].

هاوکات بابەتی عیرفان و تەسەوفی ئیسلامی ڕێچکە و ڕێبازی جۆراوجۆری هەیە، کە پەیوەستە بە بابەتەکەی ئێمەوە (دوالیزمی دژیەك) و بەپێی پێویست باسی دەکەین.

پاش سەرهەڵدانی زانستی (ئەپیستمولوژی) واتە (مەعریفەناسی)، کە هەوڵیدا وەڵامی ئەو گومان و پرسیارە بداتەوە، کە ئایا هێزی (درك) پەی پێبردن و (ناسین) لای مرۆڤ ئەو توانایەی هەیە، کە لەنێوان مرۆڤ و جیهانی دەرەوەدا پەیوەندیەکی دروست و جێگای متمانە بسازێنێت؟ لەم بوارەدا بە بەڵێ و نەخێر چەندین ڕێبازی فەلسەفی و دەروونی درووست بوون. عیرفان ڕەوش و ڕێبازێکە بۆ دۆزینەوە و ئاشکراکردنی ڕاستی جیهان، نەك لەسەر بنەمای عەقڵ و بەڵگەی عەقڵی، بەڵکو لەسەر بنەمای (ذوق) و (اشراق) و (وصول) و (اتحاد)[٨٧].

هەمان شارەزای سۆفییەتی دەڵێ: "عیرفان تەنها لەسەر (مەعریفە) کار ناکات، بەڵکو (کار) بنەڕەتی عیرفانە، هەربۆیە عیرفان دابەشدەبێت بۆ دوو جۆر: (کارەکی) و (تیۆری). ڕەهەندی کارەکی بەرنامەیەکی ورد و پڕ لە زبری و ئازار لە ژیاندا دەگرێتە خۆی، کە چەندین (مقامات) و (احوال) دەبڕێت تا دەگاتە (توحید) و (فنا)، کە بەگشتی ئەمە بە (طریقەت) ناودەبرێت.

---

[٨٦] علی شەریعەتی، فرهنگ لغات، ل٢٦٢.

[٨٧] سید یحیی یثربي، فلسفه عرفان، مرکز انتشارات دفتر تبلیغات اسلامی،حوزه علمیـه قـم، چاپ چهارم،١٣٧٧ هـ.ش.بڕوانە لاپەڕەکانی١٧–٣٠.

سەبارەت بە عیرفانی تیۆری، کۆمەڵێ دەربڕینی عارفەکان دەگرێتە خۆی لەوەی لە حەقیقەتی جیهان و مرۆڤ پێی گەیشتوون ئەمەش هەمان بابەتی تیـۆلۆجیایە، چونکە هەوڵی ڕاڤەکردنی (بوون) دەدات"[٨٨].

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا عیرفان و تەسەوفی ئیسلامی ڕێچکە و ڕێبازی جۆراوجۆری هەیە، بەڵام بەگشتی و بە ڕێژەی جیاواز هەموویان لە جۆرەکانی عیرفانی تیۆری و کارەکیشدا لەسەر ئەو باوەڕەن، کە جیهانێکی باڵا و شاراوە و (واجب الوجود) هەیە، کە (ئەزەلی)یە و تێیدا هەموو شتەکان کامڵن، چونکە جیهانی کەماڵە و لەبەرامبەردا جیهانێکی ماددە و بینراو (فانی) و (ممکن الوجود) هەیە، کە (حدث)ە و تێیدا هەموو شتەکان ناکامڵن و بەجیهانی (تناقض)و دوالیزمە دژەکان ناسراوە.

بابەتی عیرفان "گەڕانە بەدوای زاتی خوا و ڕاستی سیفات و ناوەکانیدا"[٨٩] بۆ گەیشتن بە جیهانی کامڵی و دەربازبوون لە جیهانی ناکامڵی و دوالیزمە دژەکان.

عیرفان، یاخود تەسەوفی ئیسلامی چوار ڕەگەز و بنەمای سەرەکی هەیە:

یەکەم: (وحدت)، هەبوون یەك ڕاستی هەیە، کە لە (باطن)دا خاوەنی یەکبوونێکی تەواوە لە خۆیدا و لە هەر جۆرە جیاوازی و فرەییەك بەدەرەو ڕووکەشێکی ئاشکرای دەرەکی هەیە، کە سەرچاوەی نمایشکردنی فرەییە، کە ئەم فرەییانە ڕووکەش و خەیاڵین نەك واقیعی و ڕاستی.

---

[٨٨] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٤.

[٨٩] سید یحیی یثربي، عرفان نظری، مرکز انتشارات دفتر تبلیغات اسلامی، حوزه علمیـه ْ قـم، چاپ ششم، ١٣٨٧ هـ.ش.ل٢٥.

دووەم: (شهود)، عارف دان بە بایەخ و بەهای عەقڵ و بەڵگەی عەقڵیدا دەنێت، بەڵام جەختی لەسەر پەیوەندی (حضوری)یە و مەعریفەیەك، کە دەرهاویشتەی (مکاشفات) و (مشاهدات) بێت بە باشتری دەزانێت لە دەرئەنجامێك، کە زادەی بەڵگەی عەقڵی بێت. هەروەها مرۆڤ دەتوانێت پەیوەندی پەیدا بکات لەگەڵ حەقیقەتی تاقانەی جیهان و پەیوەندیەکی (حضوری) و (شهودی) هەبێت، کە ئەمەش پەیوەست و مەرجدارە بە دەستبەرداربوونی بە خواستە ڕووکەشەکانی دونیاوە.

سێهەم: (فنا)، ئامانجی زانا تێگەیشتنە لە حەقیقەت، بەڵام ئامانجی عارف فەنابوونە لە حەقیقەتدا.

چوارەم: (ریاضت)، بەڵگەی کرداری ڕاستبوونی عارفە. عارف بۆ گەیشتن بە کەماڵی خۆی، کە هەمان (توحید) و (فنا)یە، جەستەی خۆی دەخاتە بەر جۆرە ژیانێکی زبر و پڕ لە ناڕەحەتی لە کەم خۆراکیو کەم خەوی تا پلەی مەعنەویەتی بەرزتر بێتەوە[٩٠].

هەر لەم بارەیەوە شاعیر و بیریاری عەرەب ئەدۆنیس دەڵێ: "ئامانجی سۆفی، یەکبوونی دژەکانە، یاخود (وحدة الوجود)ە، واتە یەکبوون لەنێوان (خود) و (بابەت)دا. بەواتایەکی تر (جیهانی دەرەکی) و (مەعریفە داخلی)"[٩١] بەوەی وەك بوونەوەرێکی جیهانی ئاشکرا پەیوەندی بکات بە جیهانی شاراوە و ناوەکییەوە، "ئەم یەکبوونی دژانە، یاخود (وحدة الوجود)، کە بە (المبدأ العلیا) ناودەبرێت (بریتون) بە (دەسپێکی باڵا) ناوی دەبات و بەم شێوەیە

---

[٩٠] سید یحیی یثربي، عرفان نظری، بڕوانە لاپەڕەکانی ٤٠ بۆ ٥٠.

[٩١] أدونیس. الصوفیة والسوریالیة، دارالساقي، بیروت – لبنان، الطبعة الرابعة، ٢٠١٠م. ل٤٨.

دیاری دەکات: هەموو شتێك دەمانخاتە سەر ئەو باوەڕەی، کە خاڵێکی دەسپێکی ڕۆحی هەیە، کە تێیدا هەموو دژەکان نامێنن لەنێوان (ژیان و مردن)، (واقیع و خەیاڵ)، (ڕابردوو و داهاتوو)، (سەروو و خواروو)..."[٩٢].

"لەم (دەسپێکە باڵا)یەدا وەك جێگە و شوێنێك وایە بۆ بەیەك گەیشتنی جیهانی ناوخۆیی خودی و جیهانی دەرەکی بابەتی..."[٩٣].

"کرۆکی عیرفان هیچ نییە جگە لەوەی جۆرە هێز و هەستپێکردنێکی قووڵە سەبارەت بەو بیرو باوەڕانەی، کە مرۆڤ لەبارەی جیهانەوە هەیەتی"[٩٤].

عیرفان و تەسەوفی ئیسلامی قۆناغی مێژوویی و گۆڕانکاری زۆری بەخۆیەوە دیوە تا گەیشتووەتە ئەمڕۆ. بێگومان "عیرفانی (ابن ادهم) و (فضیل) جیاوازی هەبووە لەگەڵ عیرفانی (قشیری) و (گولابادی)دا و عیرفانی سەردەمی (قشیری)یش قۆناغێکی سەرەتاییە لەچاو عیرفانی سەردەمی (ابن فارض) و (ابن عربی) و (مەولانای ڕۆمی)"[٩٥].

دکتۆر سید یحیا یثربي، قۆناغەکانی عیرفان و تەسەوفی ئیسلامی کردووە بە پێنج بەشەوە:

یەکەم: قۆناغی زەمینەسازی: ئیبن سینا بۆ ئەم قۆناغە ئاماژەی بە سێ نازناو داوە، کە (عابد) و (زاهد) و (عارف)ە، یەکەمیان خوا دەپەرستێ و خوازیاری حەڵاڵەکانی ژیانیشە، بەڵام (زاهد) ڕووی لە ژیان وەرگێڕاوە و

---

[٩٢] سەرچاوەی پێشوو، ل٤٩.

[٩٣] سەرچاوەی پێشوو، ل٥٠.

[٩٤] برتراند راسل، عرفان و منطق، ترجمه نجف دریا بندری، انتشارات ناهید چاپ گلشن، چاپ سوم، ١٣٨٤ هـ.ش. ل٣٩.

[٩٥] سید یحیی یثربي، عرفان نظري، ل١١٣.

کردوویەتیە قوربانی ژیانی کۆتایی و نەبڕاوە. (عارف)، کە لەو دوانەی دیکە بالآترە، تەنها خوای مەبەستە و هیچی ناوێت. عارف لێرەدا لەنێوان دوالیزمی دژیەکی (دونیا و قیامەت)دایە. لە عارفانی ئەم قۆناغە (وەیسی قەرەنی) و (ئەبو زەری غەفاری) و (سەلمانی فارسی).

دووەم: قۆناغی پاش زەمینەسازی: رابیعەی عەدەوی لە ناسراوترین کەسە عارفەکانی ئەم سەردەمە، کە چەمکی (اخلاص)ی گۆڕی بۆ (عیشق)، کە دواتر وەك دژێك لەبەرامبەر (عەقڵ) و هەردووکیان وەکو دوالیزمی دژیەك لە ئەدەبیاتی عیرفانیدا دەرکەوتن. جگە لە رابیعەی عەدەوی (شقیق ابراهیم بلخی) و (ذوالنون مصری) و (معروف کرخی) لە ناودارانی ئەم قۆناغەن.

سێهەم: قۆناغی گەشەکردن: یەکەمین کەسایەتی ئەم قۆناغە (بایزید بەسطامی)یە، کە بابەتی (عیشق) و (فنا)ی بە ئاشکرا لەبەرامبەر (عەقڵ) و (بقا)دا خستەڕوو. هەروەها بۆ یەکەمجار باسی (مکاشفە)ی کرد، کە بێگومان هەموو ئەمانە بابەتی دوالیزمی دژیەکن. جگە لەو (تستری) و (جنید بغدادی) و (ابو منصور حلاج) لە ناودارانی ئەم قۆناغەن. (جنید بغدادی) بۆ یەکەمجار تیۆریزەی بابەتی فەنابوون لە حەق و یەکبوونی (وجود انسان) و (وجودی نامحدود)ی خستە بەر باس و بەڕای ئەو هەموو شتێك لە (حق)ەوە سەرچاوەی گرتووە و بۆ ئەویش دەگەڕێتەوە و دەرئەنجام هەموو جیاوازی و دژەکان بە کۆ و گشتەوە پەیوەست دەبنەوە.

چوارەم: قۆناغی ڕێکخستن‌و کەماڵ: لە عارفە ناودارەکانی ئەم قۆناغە (قشیری) و (باباطاهیری هەمەدانی) و (ابو حامید محمد بن محمد غزالی) و (سوهرەوەردی) و (شیخ فرید الدین عطار نیشاپوری) و (ابن فارض) و (ابن عربی) و چەندین عارفی گەورەی دیکە، کە هەریەکەیان تایبەتمەندی خۆی

هەبووە. دەتوانین هەندێکیان بە ئارام و میانەڕەو و هەندێکیشیان بەپێچەوانەکەی ناوزەد بکەین. گرنگترین کەسیان (ابن عربی)یە، کە بە داڕێژەری (عیرفانی تیۆری) دەزانرێت، (ابن عربی) دانەری جیهانبینی دوالیزمی دژیەکی و (حدث) و (کثرت) واتە خوا لە خۆیدا یەکەیەکی کامڵ و تەواوە دواتر خۆیەتی بەشێوەیەکی (کثرت) فرەیی و جیاواز دەرکەوتووە. ئەوەی هەیە خودی خوای تاقانەیە، بەڵام لە جیهانی دوالیزمە دژەکان و فرە جۆریەکاندا بەشێوەی جیاجیا دەردەکەوێت.

پێنجەم: قۆناغی ڕاڤەکردنی نووسینەکانی (ابن عربی) و دەرکەوتنی چەندین کەسایەتی و عارفی گەورە و ناوداری دیکە، کە دیارترینیان (مەولانای ڕۆمی)یە[٩٦]. مەولانای ڕۆمی لە دیارترینی ئەو عارفانەیە، کە بەپێزترین و زۆرترین بەرهەمی ئەدەبی عیرفانی پێشکەش کردووە، کە لە دواپاری ئەم بەشەی لێکۆڵینەوەکەماندا باسی ئەدەبی عیرفان و دوالیزمی دژیەك و چۆنیەتی کەوتنەوەی لە ئەدەبی عیرفانیدا باسدەکەین، کە ئەوە ئامانجی بنەڕەتی لێکۆڵینەوەکەمانە.

## ١–٣/ دوالیزمی دژیەك لە فەلسەفەو لۆژیك (منطق) دا:

"بەشێوەیەکی گشتی لە فەلسەفەی ئیسلامیدا، کە ئەویش پەیڕەویکەر و وەرگیراوە لە فەلسەفەی (ئەرستۆ)، دوو جۆر دژیەك و دوالیزمی دژیەکیان هەیە، کە هەریەکەیان تایبەتمەندی و جیاوازی خۆی هەیە و پێویستە لە یەکتریان جیابکەینەوە و کۆبوونەوەیان لەژێر ناونیشان و وشەیەك، کە

[٩٦] سید یحیی یثربي، عرفان نظري، ل١١٤ بۆ ١٩٢.

(دژیەك)ە، نەبێتە هۆی تێكەڵبوونی ئەم دوو ئاراستە جیاوازە. ئێمە لێرەدا ئەم دوو جۆرە بە (دژیەكی فەلسەفی) و (دژیەكی لۆژیكی) ناوزەد دەكەین"[٩٧].

**یەكەم: دژیەكبوون، یاخود دوالیزمی دژیەك لە فەلسەفەدا:**

بەكورتی و لەڕوانگەی مەبەستەكەی ئێمەوە، فەلسەفە بریتیە لە: "فەلسەفە، خواستی مرۆڤە بۆ كامڵبوون و بەرزكردنەوەی نەفسی مرۆڤە بەرەو كەماڵ، لەڕێی، یاخود بەهۆی پەیبردن بە حەقیقەتی بوون، بەوجۆرەی، كە لە واقیعدا هەیە و (حوكمدان) بەسەر بوون و هەبووندا بەشێوەی لێكۆڵینەوە و پێدانی بەڵگە نەك بە لاسایی كردنەوە و گومان، هەموو ئەمانەش لە چوارچێوەی توانایی مرۆڤدا..."[٩٨].

فەلسەفە بۆ گەیشتن بە چییەتی بوون، زۆرجار بابەتەكانی، كە بەگشتی (دوالیزمی دژیەك)ن دەكاتە ڕێچكەی لێكۆڵینەوە و بابەتی بەدواداچوون تا بەپێی (مەنهەجێكی عەقڵی) بە حەقیقەتێكی دیاریكراو بگات.

بابەتی دژیەك بوونی فەلسەفی، یاخود دوالیزمی دژیەك لە فەلسەفەدا، باسكردنی ئەوە نییە، كە بابەتێك دوو سیفەتی جیاوازی بدرێتە پاڵ، بەڵكو باسی دوالیزمی دژیەك بابەتی بەریەك كەوتن و دژبوونی دوالیزمەكانە و دەرئەنجام سەركێشانی ئەم بابەتەیە بۆ باسی دوالیزمی دژیەكی (چاكە) و (خراپە)، كە ئایا بۆچی لە جیهاندا خراپە بوونی هەیە؟! زانایانی بواری

---

[٩٧] عبدالكريم سروش، تضاد ديالكتيكى، ل٧.

[٩٨] مولا صدرا، محمد ابراهيم (صدرالدين شيرازى). اسفار اربعه، مؤسسه انتشارات حكمت، چاپ اول، ١٣٨٣ هـ.ش. ل٢٠.

فەلسەفە بە شێوازی تایبەتی خۆیان ئەم بابەتەیان چارەسەر کردووە (هەروەك لە پاری دووەمی ئەم بەشەدا باسمان کرد — وەرگێڕ) و لێرەدا وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە جێگای بایەخی ئێمە نییە.

کرۆکی بابەتی فەلسەفە لێرەدا، باسی ماددەیە، واتە پێکهاتەی ئەم جیهانە بە جۆرێکە، کە ماددەیەك بوونی هەیە و لەگەڵ وێنەی، یاخود شێوازی دەرەکی. ماددە پێکهێنەری بنەڕەتی ئەم جیهانەیە، ماددە وەکو ناوەڕۆکێك گۆڕانکاری لەخۆدەگرێت واتە دەتوانێت شێواز و تایبەتمەندی و وێنەی فرە و جۆراوجۆر لەخۆبگرێت.

بەکورتی جیهان لە پێکهاتەیەك دروستکراوە، کە ماددەیە و ماددەش وێنەی جیاواز و گۆڕا و لەخۆدەگرێ، لێرەوەیە، کە بابەتی (خراپە) دێتە پێشەوە، کە ئەویش گۆڕانی (نسبی)یە لە شێوازێکەوە بۆ شێوازێکی تر، بە واتایەکی دیکە (هێزو ئامادەیی)یەك هەیە لەگەڵ (کار و ئەگەر و واقیع)دا.

کورتە و مەبەستی بنەڕەتی ئەوەیە، کە ئەو جۆرە ئاڵوگۆڕە بەردەوامەی وێنەکان، یاخود ڕووکاری ماددەی ئەم جیهانە، واتە شێواز گرتنە خۆی جیاواز و بەردەوامی ئەم جیهانە بەهۆی لێکدان و بەیەکگەیشتنی بوونەوەرە جیاوازەکانە، هەمان ئەو بابەتەی، کە زانایان بە لێکدان و بەرامبەربوونەوە تەعبیری لێدەکەن. ئەم تەنها شتەی، یاخود بابەتەی، کە ئەمڕۆ شتێکە و شێوازێکی هەیە، بۆئەوەی ببێتە شتێکی دیکە، پێویستە ئەم حاڵەتەی ئێستای بەڕێبکات و ببێتە شتێکی دیکە. ئەم دوو شێوازییە، کە بەردەوام بەسەر ماددە و بابەتێکدا دێت و لێکدان لەو نێوەندەدا دروست دەبێت، پێی دەوترێت (دژیەك بوونی فەلسەفی)[٩٩].

---

[٩٩] عبدالکریم سروش، تضاد دیالکتیکی، بڕوانە ل٣٨.

بەگشتی دەتوانین کۆی ئەو بابەتەی سەرەوە لە دوو خاڵدا کۆبکەینەوە:
١. ئامادەیی جیهان و مادده بۆ گرتنەخۆی وێنە و شێوازی دژیەك.
٢. ئەگەری (تفاعل) و کاریگەری حاڵەتەکانی دژیەك، لەسەر یەکتری و پەیدابوونی، هەبوونی (نویێ).

بێگومان هیچ کام لەم دوو خاڵە بەواتای کۆبوونەوەی دوو دژیەك نییە لە یەك بابەت و لە یەك کاتدا، بەڵکو شێوازەکانی، کە دژیەکن لە کایە جیاوازەکاندا و لە ماددەدا بوونیان هەیە و پێکدادان و پێکەوەبوونی ئەو شێوازە دژیەکانە، دەبێتە مایەی کار و کاردانەوە و گۆڕانکارییەکان.

ئەم بابەتە واتە دوالیزمی دژیەك و جۆرەکانی، بووەتە چەق و بابەتی یەکەمی زۆرینەی فەیلەسوفەکانو ڕێچکە فەلسەفییە جیاوازەکان. لەم پارەدا بەشێوەیەکی گشتی و هێندەی خزمەت بە بابە ته سەرەکییەکەمان بکات، وەك بەڵگەیەك ئاماژە بە هەندێك لەو زانا و ڕێچکە فەلسەفیانە دەکەین، کە دوالیزمی دژیەك لە فەلسەفەی کلاسیك و مۆدێرنیشدا، گرنگی و بایەخێکی ناوەندی هەیە.

## ١-٣-١/ دوالیزمی دژیەك لای هەندێ لە فەیلەسوفەکانی پـێش (سۆکرات)دا:

### (زەینونی ئەیلی، هیرۆقلیدس، سوفستائییەکان و گۆرگیاس وەك نموونە، فیساگۆرسییەکان، ئەفلوتین)

فەیلەسوفەکانی "بەر لە (سۆکرات) بە (١٢) بیریاری گەورە دەوترێت، کە بەر لە (سۆکرات) هەوڵیانداوە پێکهاتەی جیهان و سروشتی واقیع ڕاڤە بکەن، ئەرەستۆ بە (لێکۆڵەرانی بواری سروشت) ناوزەدی کردوون، چونکە ئەوان

سروشت و پێکهاتەی شتەکانیان وەك (کُل) گشتێك سەیر دەکرد، ئەگەرچی واقیعیان دابەشدەکرد بۆ (واقیعی دەرەکی) و (ناوەکی)، بەلاّم هەردوو واقیعەکەیان وەکو واقیعێکی فیزیکی ڕاڤە دەکرد"[١٠٠].

بەگشتی بابەتی دوانەیی، یاخود دوالیزمی دژیەك، باسی دوانەیی (جوهر)، یاخود بوونی بالاّ نییە وەك لە تیۆلۆجیادا ئاماژەمان پێکرد، بەڵکو باسی دوالیزمی دژیەکە وەك سیفاتی بوون (وجود).

یەکێك لەو فەیلەسوفانە زەینونی ئەیلی یە. "زینون فەلسەفەیەکی تایبەت بە خۆی نەبووە، بەڵکو هەموو هەوڵەکانی خۆی خستبووە خزمەت بەرگریکردن لە فەلسەفەی مامۆستاکەیەوە، واتە (بارمنیدس)، کە کرۆکی فەلسەفەکەی لەسەر دوو بابەتی گرنگ بوو:

١. (الوجود الواحد)، واتە یەك هەبوون، یاخود بوون تەنها یەکە.
٢. (الوجود الساكن)، واتە بوون نەگۆڕە.

لەوبارەوە (زینون) کتێبێکی نوسی، کە ئامانجی لەو نووسینە ئەوەبوو تا بۆ خەڵکی ڕوونبکاتەوە، کە باوەڕبوون بە فرەیی، سەردەکێشێت و بۆ چەندین جیاوازی و دژیەکی"[١٠١]. بەگشتی فەلسەفەی ئیلییەکان و زینون لەوەدا کورت دەبێتەوە کە: "حەقیقەت یەك دانەیە و یەکە، ئیتر هەموو شتەکانی جگە لە ئەو ناڕاستە"[١٠٢]، واتە جیهانی ڕووکەش و دوالیزمە دژەکان تەنها ڕووکەشە و خودی حەقیقەت نییە.

---

[١٠٠] الموسوعة الفلسفية المختصرة، وەرگێڕانی لە ئینگلیزیەوە بۆ عەرەبی: فـواد كامـل، جـلال العشري، عبدالرشيد الصادق، مكتبة النهضة، بغداد، ل٣٠٤.

[١٠١] امام عبدالفتاح امام، المنهج الجدلي عند هيجل، دار المعارف بمصر – القاهرة، الطبعة الأولى، ١٩٨٧م. ل٥١.

[١٠٢] سەرچاوەی پێشوو، ل٥٦.

فەیلەسوفێکی دیکە، کە (هیرۆقلیدس)ە لە (٥٧٦-٤٨٠)ی پێش زایینیدا ژیاوە. "بڕوای وایە، کە سروشتی جیهان لە کەشتیەك دەچێت، کە لێوانلێوە لە دوالیزمی دژیەك و چەندین نموونەی هێناوەتەوە. سەرەتا لە بالاترینی بوونەوەرەکانەوە بۆ نزمترینیان، خوا ڕۆژ و شەوە، زستان و هاوینە، جەنگ و ئاشتییە، تێری و برسیەتییە، شتە ساردەکان دەبنە گەرم و گەرمەکانیش سارد دەبنەوە. وشکەکان تەڕ و تەڕەکان وشکدەبنەوە. هەر لە ئێمەی مرۆڤدا دوالیزمەکانی ژیان و مردن، خەوتن و بێداری، بچووکی و گەورەیی، بوونی هەیە و کۆی ئەم دوالیزمە دژانە دەگۆڕێن بۆ دوالیزمی دیکە. هیرۆقلیدس یەکبوون لە دژەکاندا بە دەرئەنجامی فرەیی دژەکان دەزانێ، بۆیە (یەك) لە (کۆ) کردنەوەی شتەکان پێکدێت و هەموانیش لە (یەك) دەردەچن"[١٠٣].

لە چوارچێوەی باسکردنی فەیلەسوف و ڕێچکە فەلسەفییەکانی پێش سۆکراتدا (پەیوەست بەم لێکۆڵینەوەیەی ئێمە)، نابێت باسی سوفستائییەکان و لەنێویشیاندا بەتایبەتی (گۆرگیاس) لە یاد بکەین. بەگشتی گۆرگیاس جگە لەوەی ئینکاری (وجود) بوونی دەکرد هەروەها ئینکاری (مەعریفە)شی دەکرد و ڕەتیشی دەکردەوە هیچ پەیوەندیەك لەنێوانیاندا هەبێت[١٠٤]. بەگشتی سۆفستائییەکان (پەیوەست بە بابەتەکەی ئێمەوە)، "بابەتەکانی دوالیزمی دژیەکیان وەك هۆکار و کەرەسەیەك دەگرتەبەر بۆ (قەناعەت) پێکردنی نەیار و

---

[١٠٣] امام عبدالفتاح امام، المنهج الجدلي عند هيجل، ل٥٩.

[١٠٤] سەرچاوەی پێشوو، بڕوانە ل٦٣.

بەرامبەرەکانیان تا لە کۆتاییدا یەکێك لە دوالیزمە دژەکانیان سەردەخست بەسەر ئەوی دیکەدا"[١٠٥].

فیساگۆرسییەکانیش ڕێچکەیەکی دیکە بوون، کە دوالیزمیان وەك بنەمایەکی شیکاری گەردوونی باسکردووە. "فیساگۆرس خۆی فەیلەسوفێکی یۆنانیە، کە لە سالآنی (٥٣٠) پێش زاییندا ناوی هاتووە، ڕاڤەی بۆ جیهان ڕاڤەیەکی ژمارەییانە بووە، کە باوەڕی وابوو جیهان پێکدێت لە دوالیزمی (سنووردار) و (بێ سنوور) و دواتر فیساگۆرسییەکان لەسەر بنەمای ئەو دوالیزمە (قائمة الأزواج العشرة). واتە دە دوالیزمەکەی بلآوکردەوە، کە پێیانوابوو جیهان لەوانە پێکدێت، ئەوانیش بریتین لە (تاك، نێر، ڕاستەوخۆ، چاکە، چەسپاو...هتد) و دژەکانیان"[١٠٦].

لە کۆتایی ئاماژەماندا بە نموونەکانی بەر لە سۆکرات پێویستە باسی (ئەفلوتین) بکەین. "هەندێك لە زانایان باوەڕیانوایە، کە فەلسەفەی ئەفلوتین، دەسپێك و سەرەتایەکە بۆ (وحدة الوجود)، کە لە عیرفاندا هەیە، بەلآم هەندێکی تر باوەڕیانوایە، کە ئەفلوتین باوەڕی بە پلەبەندیەکی بزواوی یەك لەدوای یەك هەیە، کە سەرەتا لە بوونی یەکەمەوە دەستپێدەکات و تا بوونەکانی دیکە. پلەکانی بوونی خوارەوە، یاخود بوونەکانی لە پلەکانی خوارەوە زۆرترین جیاوازی و دوالیزمی تێدایە، هەروەها باوەڕی بە (النفس

---

[١٠٥] بولس سلامه، الصراع فى الوجود، دارالكتب اللبناني، بيروت – لبنان، الطبعة الثالثة، ١٩٧٣م. ل٣٩.

[١٠٦] كامل ومجموعة من المؤلفين. الموسوعة الفلسفية المختصرة، مكتبة النهضة – بغدا ل٣٢١.

الكلية) بوون و نەفسی گشتی هەیە، کە بەردەوام پێویستە نەفسە (فرد)بییەکان، بوون لە گشتیەکەوە وەرگرن"[١٠٧].

## ١-٣-٢/ سۆکرات (سقراط) و هەندێ لە فەیلەسوفە کلاسیکەکانی مێژووی فەلسەفە و بابەتی دوالیزمی دژیەك:

## (سۆکرات، ئەفلاتون، ئەرستۆ)

"(ئەی مرۆڤ خۆت بناسە)، ئەم گوتەیەی سۆکرات، مێژووی فەلسەفەی گۆڕی. بیریارانی لە تێڕامان بۆ (جیهانی دەرەکی) لەپێناو ڕاڤەکردنی گەردووندا وەرچەرخاند بۆ تێڕامان لە (جیهانی ناوەکی)، واتە لەبری تێڕامان لە سروشت (ئاو، هەوا، ئاگر، خاك) جەختی کردەوە لە تێڕامان لە خودی مرۆڤ واتە (عەقڵ)یی نەك جەستەیی.

سۆکرات دوالیزمە دژەکانی بەرامبەر یەك دادەنا و لە (جدل)ەکەیدا دەیکردنە پێوانە و پێوەر بۆ یەکتری، واتە سۆکرات بابەت و دژەکەی دەکردە جێگای بایەخ و بەرگریکردن لێی، نەك بۆ هێنانەکایەی (نوێ)یەك، بەڵکو لەپێناو گەیشتن بە حەقیقەت"[١٠٨].

بەگشتی دەتوانین سێ خاڵی سەرەکی لە فەلسەفەی سۆکراتدا دیاری بکەین:

١. پەیبردنی مرۆڤ بە خودی خۆی، کە بەگشتی لە بابەتی دوالیزمی (خود) و (بابەت) دەدوێ.

---

[١٠٧] مصطفى غالب، في سبيل موسوعة فلسفية، ج١، ل٢٢.

[١٠٨] بولس سلامه، الصراع فى الوجود، ل٤٤.

٢. سۆكرات لە گفتوگۆكانیدا بابەتێکی وەردەگرت و دەیخستە بەر گفتوگۆ و دەرئەنجام (جهل)ی بەرامبەرەكانی دەسەلماند بۆ ئەو بابەتە. پاشان بە شێوازی پێوانە و پێوەركردنی دوالیزمە دژیەكەكان حەقیقەتی چەمكە دژەكەی دەخستەڕوو. وەك ئەو پرسیارەی (سۆكرات) لە (مینون)ی دەكات دەربارەی (الفضیلة) دواتر بە پێوەركردنی لەگەڵ (الرذیلة)[١٠٩].

پاش سۆكرات، (ئەفلاتون)، وەك گەورەترین فەیلەسوفی سەردەمی خۆی ئاماژەی بە دوالیزمی دژیەك وەك بنەمایەكی فەلسەفی و شیكاری داوە. ئەفلاتون بە سودوەرگرتن لە هەندێ ڕەگەزی بنەڕەتی فەلسەفەكانی پێش خۆی بووە داڕێژەری فەلسەفە و ڕێچكەیەكی نوێ لە فەلسەفەدا. لە (بارمنیدس)ەوە ئەو باوەڕەی وەرگرت، كە (حەقیقەت) هەمیشەییە و ناچێتە چوارچێوەی (كات)ەوە، هەروەها لە (هیرۆقلیدس)ەوە ئەو بیرۆكەی وەرگرت، كە (العالم المحسوس) جیهانی هەستپێكراو نەمر و بەردەوام نییە. "بەڕای ئەفلاتون (مەعریفە) لە عەقڵەوە وەردەگیرێت و تەنها (عەقڵ) سەرچاوەی حەقیقەتە و (هەستەكان) سەرچاوەی بەهەڵە بردنمانە، چونكە هەستەكان ڕووكەش (ظاهر)مان نیشان دەدات، بەڵام عەقڵ خودی حەقیقەتمان بۆ دیاری دەكات"[١١٠]. واتە لای ئەفلاتون مەعریفە دابەشبووە بۆ دوالیزمە دژیەكەكانی (عەقڵ و هەستەكان) و (جیهانی ڕووكەش و حەقیقەت).

"ئەفلاتون باوەڕی بە حەقیقەتێكی گشتگیر و هەمیشەیی هەیە، كە خودی ماهیەتی شتەكانە و بە (مثل)، نموونە و (نموونەیی) ناوزەدی دەكات. ئەمە

---

[١٠٩] امام عبدالفتاح امام، المنهج الجدلی عند هیجل، بڕوانە ل٦٣-٦٧.

[١١٠] امام عبدالفتاح امام، المنهج الجدلی عند هیجل، ل٦٨-٦٩.

ڕاستی و حەقیقەتی شتەکانە، کە لە جیهانی هەستپێکراوەکاندا (جیهانی ڕووکەش)دا دەبینرێن. فەیلەسوف لە حەقیقەت و ماهیەتی شتەکانی نێو ئەم جیهانە ناگات تەنها لەڕێگەی (جدل) (دیالیکتیک)ەوە نەبێت"[١١١]، دیالکتیکیش پێکەوە هێنانی دوالیزمە دژیەکەکانی نێو سروشت و بوونە تا بە حەقیقەتی شتەکان بگەین. (هەروەك چۆن دواتر و بەتایبەت باسی دیالیکتیك دەکەین).

ئەفلاتون پێیوایە دیالکتیك دوو ڕێگای هەیە، دیالکتیك بەرەو بڵندی و باڵا و دووەمیان، دیالکتیك بەرەو خوارەوە. لەوەی یەکەمیاندا مرۆڤ پارچە ڕووکەش و جیاواز و دژیەکەکان دەبینێت و پاشان بەرزدەبێتەوە بۆ ئەو (عەقڵە گشتیە)ی، کە پەیوەندی لەنێوانیاندا دروست دەکات، واتە لە فرەیی هەستپێکراوەکانەوە بەرزدەبێتەوە بۆ یەکیەتی عەقڵی. بەرزبوونەوە بەردەوامە لە تاکەکانەوە بۆ جۆرەکان و پاشان بۆ ڕەگەزە پێکهێنەرەکان‌و دواتر بۆ سەرچاوەی هەموو پێکهاتە و ڕەگەزەکان، بۆ فیکرەیەك، کە زۆرترین حەقیقەتی لەخۆگرتووە و باڵاترین پلە و پایەی هەیە و ئەم فیکرەیەش هیچ نییە جگە لە (مُثل)، کە سەرچاوەی (چاکە)یە. ئەم سەرچاوەیە لە (جیهانی معقول)دا ڕۆڵی هەمان (خۆر)ی هەیە لە جیهانی هەستپێکراوەکاندا[١١٢].

سەبارەت بە ئەرستۆش "بنەمای دوالیزمی دژیەك لە فەلسەفەی ئەرەستۆدا، جێگا و بایەخی خۆی هەیە. ئەرەستۆ ئەم بنەمایە بە (اول الاوائل) یەکەمی یەکەمەکان ناوزەد دەکات و لە میتافیزیکدا باسی کردووە. ئەرستۆ لە

---

[١١١] مصطفى غالب، في سبيل موسوعة فلسفية. من منشورات دار و مكتبة الهلال، بيروت، ١٩٧٩م. ل٤٨.

[١١٢] امام عبدالفتاح امام، المنهج الجدلي عند هيجل، ل٧٠.

باسی میتافیزیکدا وەك بەڕێزترین زانست و بەرفراوانترین هاوکێشەی بوونناسی باسی کردووە و هەر لەوێشدا بنەمای دوالیزمی دژیەکی وەك ناسراوترین و بەڕێزترین و لەپێشترین بنەما ناساندووە. بنەمای دوالیزمی دژیەك لە ڕوانگەی ئەرەستۆوە بە (مبدء المبادئ) ناودەبرێت. بەواتایەکی دیکە دەربڕی پایە سەرەکییەکانی بوونە، بەجۆرێك بە ڕەتکردنەوەی دوالیزمی دژیەك هەموو یاسا و سیستمی بوونەوەر لەیەك هەڵدەوەشێتەوە. ئەرەستۆ بەردەوام هەوڵیداوە لە هەریەك لە بابەت و بەرهەمەکانی خۆیدا باسی دوالیزمی دژیەك بکات. لە باسکردنی هەندێك بابەتدا، بڕوای وایە، کە بۆ دژیەکبوونی دوو دوالیزم پێویستە هەڵگری تایبەتمەندی یەکبوون و یەکیەتییش بن. بەجۆرێك، کە دەتوانرێت ئەرەستۆ بە یەکەمین فەیلەسوف و لۆژیکزان ئەژماربکرێت، کە لێکۆڵینەوەی کردووە لە (الوحدة الأعتبارية) لە دوالیزمی دژیەکدا، واتە گەڕان بۆ بنەڕەتی یەکبوون لە دوالیزمی دژیەکدا.

ئەرەستۆ بە هەشت جۆر تێڕوانینی خۆی بۆ بنەمای دوالیزمی دژیەك دەربڕیوە: کە لێرەدا تەنها ئاماژە بەو خاڵانە دەکەین لەگەڵ بابەتەکەی ئێمەدا دێتەوە.

أ. هەبوون و نەبوونی شتێك لە یەك کاتدا نەگونجاوە.

ب. نەگونجاوە شتێك پێکەوە لە یەك شوێن و یەك کاتدا هەبێت و نەشبێت.

ج. دوو گوتەی دژیەك دەربارەی یەك شت ناکرێت ڕاست بێت.

د. هیچکات ناکرێت دوو گوتەی دژیەك وەك یەك و بۆ یەك بابەت ڕاست بێت.

بەگشتی هەشت جۆر دەربڕینی هەیە، کە دوالیزمی دژیەك بنەڕەت و بابەتی جیاوازیو پۆلێن بەندیەکەیە[١١٣].

هەروەها وەك لێکۆڵەرێکی تر دەڵێ: "بابەتێکی زۆر گرنگ لای ئەرەستۆ، بابەتی (تطور) گەشەکردنە، ئەو پێیوایە، کە شتەکان بەردەوام لە ململانێ و کێبەرکێدان تا بگەنە باڵاترین (صورة) شێوە و وێنەی خۆیان و هەوڵدان بۆ گەیشتن بە (ئامانج)، کە هۆکاری بزوێنەری هەموو جیهانە و هۆکاری یەکە..."[١١٤].

## ١-٣-٣/ میتافیزیك (میتافیزیقا):

"میتافیزیك لێکۆڵینەوەیە لە پرنسیپە سەرەتاییەکانی، یاخود یەکەمی شتەکان. هەروەها دەگوترێت لێکۆڵینەوەیە لە (جوهر) کرۆکی شتەکان، (جوهر)یش ئەوەیە، کە هەر لە دەستپێك و سەرەتاوە هەبووە و ڕاڤەکردنی هەر شتێك پێویستی بە ناسینی (جوهر)ی ئەو شتە هەیە.."[١١٥].

د.عەبدولکەریم سرووش دەربارەی ئەم زاراوەیە پێیوایە: "بەکارهێنانی زاراوەی میتافیزیك بۆ (جیهانی ناهەستیار) هەڵەیە، ئەم هەڵەیە لەڕاستیدا هەندێك فەیلەسوفی ڕۆژئاوایی کردوویانە، تەنانەت فەیلەسوفەکانی وەکو (سوهرەوەردی) و (مولاسەدرا) و (بوعلی سینا)ش، کە زادەی ڕۆژهەڵاتن

---

[١١٣] علی اکبر احمدی افرمجانی، تعبیرهای ارسطو از اصل تناقض، فصلنامه دانشگاه قم شماره سوم، و چهارم. ١٣٨١ هـ.ش

[١١٤] مصطفی غالب، في سبيل موسوعة فلسفية، ل٦٣.

[١١٥] الموسوعة الفلسفية المختصرة، وەرگێڕانی لە ئینگلیزیەوە بۆ عەرەبی: فواد کامل، جلال العشری، عبدالرشيد الصادق، ل٤٦٦.

نەکەوتوونەتە ئەو هەڵەیەوە. میتافیزیك جۆرێکە لە دابەشکردنی مەعریفە، نەك دابەشکردنی جیهان و بوون. میتافیزیك جۆرێکە لە مەعریفە، کە پەیوەستە، یاخود پەیوەندی بە هەموو بوونەوە هەیە و لەوانەش ئەم جیهانە. میتافیزیك هەروەك زانست چۆنیەتی و ڕەوش و ئەحکامی خۆی هەیە و ئەمەش بەواتای ئەوە نییە، کە (دژیەك) بن. تەنها جیاوازیان لەوەدایە، کە بابەتەکانی میتافیزیك (سەلماندن) و (ڕەتکردنەوە)ی خۆی لەڕێی (ئەزموونکردن)ەوە ئاشکرا ناکات. بۆ نموونە هاوکێشەکانی لۆژیك جۆرێکە لە میتافیزیك. بەگشتی زانستێك، کە باس لە هاوکێشەکان و یاساکان و ئەحکامەکانی (بوونی ڕەها) دەدوێت. بە میتافیزیك ناوزەد دەکرێت"[١١٦].

بێگومان ئەم جۆرە زانستەش جگە لەوەی گریمانەی دوو جیهان و دوو بنەڕەت و بابەتی چاکە و خراپە و...هتد، دەکاتە کەرەسەی لێکۆڵینەوەی خۆی، دوالیزمە دژیەکەکانی جیهانی واقیعیش دەکاتە خاڵی دەستپێك و سەرەکی بۆ دۆزینەوەی بوونی ڕەها.

## ١-٣-٤/ دوالیزمی دژیەك لای هەندێك لە فەیلەسوفەکانی مۆدێرنە: (کانت، هیگل)

کانت فەزڵێکی زۆر گەورەی بەسەر (دیالکتیك)ەوە هەیە، بەوەی بابەتی دوالیزمە دژیەکەکانی هێنایە کایەوە و کەلێنی نێوان وەك یەك، یاخود یەکبووەکانی ئاشکرا کرد[١١٧].

---

[١١٦] عبدالکریم سروش، تضاد دیالکتیکی، ل١٢٢.

[١١٧] بولس سلامە، الصراع فی الوجود، ل٤٩.

لەم بارەیەوە وتراوە: "کانت یەکەم کەس بوو، کە جیاوازی نێوان (عەقڵ) و (فهم)ی دۆزییەوە، کە پێیوابوو بابەتی ژیری دوایی نەهاتوو و بێ مەرجە بەپێچەوانەی تێگەیشتنەوە، کە بابەتەکەی کۆتایی هاتوو و مەرجدارە"[118].

لە گرنگترین کارەکانی، کە (کانت) کردی، دەرخستن و ڕووناکی خستنە سەر فیکرەی دژیەکەکان، یاخود دوالیزمە دژیەکەکان بوو. "پێشتر وا باوبوو، کە ئەگەر مەعریفە سەربکێشێت بۆ (تناقض) جیاوازی و دژیەکبوون، ئەوا وەك بەڵگە سەیردەکرا بۆ لادان و هەڵەی خودی، یاخود لە بەڵگەکاندا، بەڵام کانت باوەڕی وابوو، کە (فیکر) بەشێوەیەکی سروشتی دەچێتە ناو بابەتە جیاواز و دژیەکەکانەوە بەتایبەتی، کە بیەوێت پەی بە دوایی نەهاتوو (اللامتناهی) بەرێت. هەر لێرە کانت خزمەتێکی گەورەی بە فەلسەفە کرد، بەوەی ئاماژەیدا بە (متناقض)ەکانی عەقڵ، چونکە ناسینی دوالیزمە دژیەکەکان ڕووی هەمووانی وەرگێڕا بۆ جوڵە و تێگەیشتن لە (دیالکتیك). کانت بڕوای وابوو، کە ناتوانین هیچ شتێك تەنها لە خودی خۆیەوە بناسین و پەی پێبەرین بەبێ پەیبردن بە دوالیزمە دژەکەی بەرامبەری، (دژ) بەواتا پۆزەتیڤەکەی، کە مەبەستمان لە پۆزەتیڤ ئەوەیە، کە هەر شتێك بوونی (فعل) و حەقیقی هەبێت ئەوا لەناخی خۆیدا چەندین ڕەگەزی دژیەکی کۆکردووەتەوە، هەربۆیە ناسین و پەیبردن لای کانت پەیبردنە بە شتەکان وەك یەکەیەکی زیندوو لە پارچە و پێکهاتەی جیاواز و دژبەیەك"[119].

---

[118] امام عبدالفتاح امام، المنهج الجدلی عند هیجل، ل٨٢.

[119] سەرچاوەی پێشوو، بڕوانە ل٨٣.

سەبارەت بە (هیگڵ)، کۆی هەوڵی هیگڵ بەرزکردنەوەی فەلسەفە بوو بۆ پلەی (زانست)، واتە دەربازکردنی لە هەموو بابەتێك، کە پێچەوانەی عەقڵە، یاخود لەگەڵ ئەزموونگەری (عەقڵ)دا نایەتەوە.

هیگڵ باوەڕی بە ململانێی دوالیزمە دژەکان هەبوو "باوەڕی بە فەلسەفەی مێژوو، هەروەها بزاوتنی مێژوو هەبوو بەرەو کۆتایی، کۆتاییەك، کە چینی (ناوەند) کۆمەڵگا پێکدەهێنێ و حکومەتی مۆدێرن بە سیستمێکی دیاریکراوی فەلسەفییەوە پەیوەست دەبێت"[١٢٠].

وەك عەلی شەریعەتی دەڵێ: "ئەگەر لە دوو وشەدا فەلسەفەی هیگڵ کورت بکەینەوە ئەوا دەڵێین خوازیاری ئازادی بوو. بۆیە دژی هەموو جۆرە سنوورەکانی ئایین و مەزهەب بوو. هیگڵ لە نیوەی دووەمی ژیانیدا، واتە لە سەدەی نۆزدەهەمدا، بابەتی (سنووردار) و (بێ سنووری)، یاخود (دروستکراو) و (دروستکەر)ی ورووژاند و پێیوابوو پەیوەندی نێوان خوا و مرۆڤەکان بەندایەتی نییە، چونکە ئەوە دژە لەگەڵ (ئازادی) مرۆڤدا، بەڵکو تەنها پەیوەندی (عاشقانە) دەتوانێت (خالق) واتە (تێز) و (مخلوق) (ئەنتی تێز) و (سێنتێز)ێکی نوێ بخولقێنێ"[١٢١].

بۆ زیاتر تێگەیشتن لە بابەتی دوالیزمی دژیەك لای هیگڵ پێویستە باسی دیالکتیك بکەین، چونکە ئەگەرچی ڕەگەز و ڕیشەی دیالکتیك لای زۆرێك لە فەیلەسوفەکانی پێش سۆکرات و دوای ئەویش هەیە، بەڵام دیالکتیك بەشێوەیەکی تیۆری و تەواو لای هیگڵ ئاماژەی پێدراوە.

---

[١٢٠] علی شەریعەتی، فرهنگ لغات، ل٢٧٩.

[١٢١] عبدالکریم سروش، تضاد دیالکتیکی، ل٣٩.

## ١-٣-٥/ دیالکتیك و دوالیزمی دژیەك لای هیگڵ:

لەڕووی واتا و بەکارهێنانەوە، دیالکتیك بریتیە لە: "گەیشتن بە حەقیقەت و سەلماندنی ئامانجێك لەڕێگەی ئاشکراکردن و بەدوای یەکتردا هێنانی دوالیزمە دژیەکەکان لە فیکر و گوتاردا"[١٢٢].

وەك پێشتر باسمان کرد سۆکرات لە ڕەوشی گفتوگۆی خۆی لەگەڵ نەیارەکانی بە خستنەڕووی دوالیزمە دژیەکەکان، نەیارەکەی خۆی شکست پێدەهێنا و بەسەریدا سەردەکەوت. "ئەم شێوازەی سۆکرات لای هیگڵ بەردەوام بوو، بەڵام بەو جیاوازییەی، کە دیالکتیکی هیگڵ بریتی بوو لە تێگەیشتن لە دیاردەکانی جیهان و کار و کاردانەوەکانی بوون لەسەر بنەمای دۆزینەوەی یاساکانی دوالیزمی دژیەك و باوەڕ بەو بنەمایەی، کە دەرئەنجامی ململانێ لەنێوان دوو دژیەکدا، دیاردەیەکی نوێ دێتە کایەوە. هەروەها باوەڕبوون بەوەی ململانێ و دژایەتی نێوان دژەکان هەمیشەییە و لە هەموو کایەکاندایە و دواجار باوەڕ بەو بنەمایەی، کە هەر دیاردەیەك لە خۆیدا دوالیزمی دژە خۆی بەشێوەیەکی (جبری) واتە لە دەرەوەی ویستی خۆی هەڵگرتووە بۆیە دیالکتیکی هیگڵ لەسەر سێ بنەماو پایە وەستاوە:

١. (تێز)، یاخود (بنەڕەت)، (کار).

٢. (ئەنتی تێز) دژەکەی.

٣. (سێنتێز) ئەو دەرئەنجامەی، کە لە کۆکردنەوەی ئەم دوو دوالیزمە دژە دێتە کایەوە"[١٢٣].

---

[١٢٢] علی شەریعەتی، فرهنگ لغات، ل١٩٤.

"دیالکتیك، وەك پێکهاتەیەکی لەیەك جودا و سەربەخۆ ناڕوانێتە شتەکان، بەڵکو لەڕوانگەی پەیوەندی هاوبەشی نێوان هەموو پارچە و بەشەکان، وەك یەکەیەکی گشت و کامڵ و تەواو سەیری هەموو جیهان دەکات، ئەمەش واتە گشتگیری یەکێکە لە بنەماکانی دیالکتیك، کە تێیدا هەموو دیاردەیەك پەیوەند و پەیوەستە بە هۆکاری دیکەوە و هەموو بەشێکیش فەرمان و ئەرکی خۆی هەیە و جیهانیش تەنها لەسەر ئەم بنەمایە ڕاڤە دەکرێت. بۆنموونە چاو چ مانایەکی هەیە ئەگەر پەیوەست نەبێت بە جەستەوە؟ ئایا ڕاستە پێی بوترێت چاو؟ ئایا ئەو کاتە دەبینێت؟ کێیە بینەرەکە؟ هەروەها پرینسیپی بەردەوامبوون و گەشەکردن هەردەم لە گۆڕانکاری دایە و هیچ شتێك لەم بوونەدا جێگیر و چەسپاو نییە، هەموو شتێك لەدایکدەبێت و گەشە دەکات و پاشان دەمرێت. هەموو شتێك مێژووی خۆی هەیە. ڕابردوو و ئێستا و داهاتووی هەیە. کەواتە دیالکتیك لە ڕوانگەی گەشە و ژیانەوە سەیری شتەکان دەکات"[124].

"سەبارەت بە (دوالیزمی دژیەك)، یاخود (دژیەك)، بنەمای سەرەکی ڕێچکەی (دیالکتیك)ە و پێچەوانەی لۆژیکی ئەرەستۆیە، چونکە لۆژیك پێیوایە، هەموو شتێك یەکسانە بە خودی خۆی. بۆنموونە (ئەحمەد) یەکسانە بە (ئەحمەد)، بەڵام دیالکتیك بڕوای وایە هەموو دیاریکردنێك یەکسانە بە نەییکردن لە ئەوانی دیکە، یاخود دژەکەی. بۆنموونە دەڵێین ئەوە (ئەحمەد)ە واتە ئیبراهیم نییە، بەڵکو دیالکتیك لەوە زیاتر دەڕوات و بڕوای وایە هەموو

---

[123] سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٤.

[124] بولس سلامە، الصراع فی الوجود، ل٤١.

شتێك لە خۆیدا دژەكەی هەڵگرتووە. بۆنموونە (تۆو)ی ڕوەكێك (مردووە)، بەڵام لە خۆیدا ژیانی ڕووەكێكی هەڵگرتووە، پاشان ئەویش دەمرێ و ژیانی لە تۆودا جێهێشتووە... كەواتە دژیەكبوونی دیالكتیكی وێرانكاری و مردن نییە، بەڵكو بزوێنەری ڕاستەقینەیە. دوالیزمە دژەكان بەرزدەبنەوە تا دژیەكبوون تێپەڕێنن و (نوێ)بوونەوەیەك بهێننە كایەوە.."[125].

## ١-٣-٦/ ماركسیزم:

لەڕاستیدا ئەگەرچی واباوە، كە دیالكتیكی ماركسیزم تەواو جیاواز و دژە لەگەڵ دیالكتیك هیگڵدا، بەڵام بەگشتی جیاوازیەكی ئەوتۆ لەنێوان هەردوو دیالكتیكەكاندا نییە و ماركس بڕوای وایە، كە تەنها ڕێبازێك، كە پێویستە فەلسەفە بیگرێتە بەر، بریتیە لە ڕێبازی دیالكتیكی هیگڵی و هەردووكیشیان بە تەواوی میتافیزیك ڕەتدەكەنەوە[126].

زانایەكی ئەم بوارە دەڵێ: "خاڵی سەرەكی جیاوازیی نێوان ماركس و هیگڵ، لە وێناكردنی هەر دووكیانەوەیە بۆ (بوون) گەردوون، یاخود ئەگەر وردتر ئاماژەی پێبكەین، جیاوازی هەردووكیان پەیوەندی بە (فیكر) و (وجود)ەوە هەیە و لەڕووی لۆژیكییەوە كامیان لە پێشترن. هیگڵ بڕوای وایە، كە (فیكر) مەرجی بنەڕەتی و (مبدأ) یەكەمی گەردوونە. هەروەها چییەتی و كرۆكی جیهانی واقیعییە و هەربۆیە پێویستە لە (فیكر)ەوە دەستپێبكەین بۆ (سروشت)، بەڵام ماركس ئەم تێڕوانینە نموونەییە ڕەتدەكاتەوە و پێیوایە

---

[125] سەرچاوەی پێشوو، ل٤١.

[126] امام عبدالفتاح امام، المنهج الجدلی عند هیجل، ل٣٢٠.

(سروشت) بنەڕەتی یەکەمە و مەرجی لۆژیکیانەی بوونی (فیکر) و ژیانی ڕۆحیشە بەگشتی. ئەم خاڵە بنەڕەتیەش لە جیاوازی نێوان هیگڵ و مارکسدا کار ناکاتە سەر خودی ڕێبازەکە. خاڵی دەسپێك هەرچیەك بێت، بابەتی فەلسەفە و تێڕوانینیان بۆ فەلسەفە هەرچیەك بێت، ئەوا هیچ لەو ڕاستییە ناگۆڕێت، کە هەردووکیان بڕوایانوایە ڕێگەی ڕاست هیچ نییە جگە لە دیالکتیك"[١٢٧].

کەواتە مارکس و هیگڵ بڕوایان بە دیالکتیك هەیە، بەڵام هیگڵ بە (فیکر) دەستپێدەکات و مارکس بە (ماددە). کەواتە بابەت و بنەڕەتی دوالیزمی دژیەك، کە لە (هیرۆکلیس)ەوە ڕیشەکەیمان هێنا، لێرەدا (مارکس)یش دەیکاتە بنەڕەتی دیالکتیکی خۆی وەك زادەی سروشت، چونکە وەك لە ئایدیای مارکسیزمدا هاتووە ئەگەر دژیەکبوون و دوالیزمی دژیەك نەبێت ئەوا هەموو شتەکان وەك خۆیان و بەبێ گۆڕانکاری و بە چەسپاوی دەمانەوە. "لە مارکسیزمدا (مبدأ) دوالیزمی دژیەك و دژیەکبوون سەردەکێشێ بۆ گۆڕانکاری لە چۆنیەتیدا. بۆنموونە دەنکە (گەنم)، یاخود (جۆ)یەك، کە دەبێتە (گوڵ) ئەوە گۆڕانە لە چۆنێتیدا نەك تەنها لە چەندێتیدا. ئەم گەشەکردنە لە جۆردا لەگەڵ کاتدا دەبێت و لەناو سروشتدا. ئەگەر سەرنجێکی وردی ناو سروشت بدەین چەندین گۆڕانکاری بەدیدەکەین. ئەم گۆڕانکارییە گەورانە (شۆڕش)ن و مارکسیزمیش لەسەر بنەمای (شۆڕش) دامەزراوە. شۆڕش لە نەریتی مارکسیزمدا ڕۆژانە بەرچاو دەکەوێت. ئەمە ڕای مارکسیزم بوو لەسەر ئاستی سروشت و ماددە، بەڵام بابزانین لەسەر ئاستی مێژوو چۆنە، چونکە ئەم خاڵە

---

[١٢٧] امام عبدالفتاح امام، المنهج الجدلی عند هیجل، ل٣٣١.

گرنگترین خاڵی ناو دیالکتیکی ماددەیە. لە مارکسییەت و لە ململانێی مارکسیزمدا، کە بڕوای بە شۆڕش و دژایەتی نێوان دژ و دوالیزمە دژیەکەکان هەیە، ململانێکە داستانی خودی مرۆڤە و پاڵەوان و پلەی باڵاش (چینی کرێکار)ە. مرۆڤ لە مێژوودا هاتە بوون و دواتر دەرئەنجامی دابەشکردنی کار (موڵکی تایبەت) پەیدابوو. لەبەر موڵکداری و خاوەنداریەتی تایبەت، مرۆڤەکان بوونە دژی یەکتر و دەرئەنجام (بەرژەوەندی گشتی) کەوتە ململانێ لەگەڵ (بەرژەوەندی تایبەت)دا، دەرئەنجام لەناو خوازیارانی بەرژەوەندی گشتیدا کەسانێکی خاوەن دەسەڵات دروستبوون، کە بوونە خاوەنی (سەرمایە) و ئازادی مرۆڤیان کردە قوربانی سەرمایەی خۆیان و خودی مرۆڤیشیان کردە کاڵا و...هتد. دەرئەنجامی ئەم هەموو ململانێیە و لە دەرئەنجامی گەشەی ململانێی نێوان ئەم دژیەکانەدا، مارکسیش قۆناغەکانی گەشەی کۆمەڵگای کردووە بە "سەرەتایی، کۆیلەیی، دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری...) و دەرئەنجام ئەم ململانێ دیالکتیکیەی نێوان دژەکان کۆمەڵگا دەبات بەرەو (سۆشیالیزم) و دواقۆناغیش بەرەو کۆمۆنیزم، کە کۆتایی ململانێ و دژایەتیکردنە"[128].

بەگشتی و بەکورتی لە فیکری مارکسیزمدا بزوێنەری دیالکتیکی ماددی و مێژوویش ململانێی نێوان دوالیزمە دژیەکەکانە و قۆناغی کۆمۆنیزمیش هیچ نییە جگە لە قۆناغی کۆتایی ململانێ و دژایەتی نێوان دژەکان.

بەگشتی زۆر فەیلەسوف و ڕێچکەی فەلسەفی هەن، کە دوالیزمی دژیەکیان کردۆتە بنەما و ڕەگەز و بابەتی سەرەکی کارەکانیان، یاخود تایبەتمەندی

---

[128] بولس سلامه، الصراع فی الوجود، ل١٢٥.

بوونیان، بەڵام لەم بابەتەی ئێمەدا ناتوانین باسی هەموویان بکەین. ئەگەر (دیکارت) وەرگرین (شك) گومان دەکاتە ڕێباز و ڕێگای گەیشتن بە (یقین)، کە ئەمە دوالیزمی دژیەکە[١٢٩]. ئەگەر باسی (نیتشە) بکەین ئەوا "لای لێکۆڵەرانی بواری فەلسەفە، نیتشە ناسراوە بە فەیلەسوفێکی ئازاد و (متناقض)، کە هیچ بایەخێکی بۆ لۆژیك و یاسا و ڕێسا دانەناوە"[١٣٠].

وجودیەت، (بوونی تاکگەرا) و (بوونی گشتی) دەکاتە چەقی بابەتی خۆی، کە کامیان ڕاستەقینەیە. (تناقض) و (توتر)، واتە دڵەڕاوکێ هەموو فیکری وجودی داگیرکردووە، تەنانەت فەیلەسوفی ناوداری وجودی (کێرکیگارد) دەڵێ: فیکر عاشقی ململانێیە، بیریار، یاخود (مفكر) بەبێ ململانێ وەك عاشقی بێ خۆشەویست وایە[١٣١].

## ١-٣-٧/ دوالیزمی دژیەك لای هەندێك لە فەیلەسوفەکانی ئیسلام:

لەڕاستیدا فەلسەفەی ئیسلامیش، کە وەکو قۆناغ و بابەت بەشێکە لە کۆی مێژووی فەلسەفە، لەڕووی بابەتو پانتاییەوە کاریگەری خۆی هەیە و ئەمیش وەکو کۆی فەلسەفە ئامانجی گەیشتنە بە وەڵامە بنەڕەتییەکان سەبارەت بە (بوون)، لەو ڕوانگەوە (دوالیزمی دژیەك) یان کەرەسە و ئامرازی لێکۆڵینەوەیە، یاخود بابەتەکانی، کە بوونەتە جێگای مشتومڕی فەیلەسوفەکانی هەر قۆناغێك لە خودی خۆیاندا دوالیزمی دژیەکن. لێرەدا و وەك بەڵگە، نموونەی چەند فەیلەسوف و ڕێچکەیەك باسدەکەین تا بزانین دوالیزمی دژیەك لەکوێی بایەخ و بابەتی ئەواندایە:

---

[١٢٩] مجموعة من المؤلفين، في سبيل موسوعة فلسفية، ج٥، بڕوانە لاپەڕەکانی ١١٠-١١٨.

[١٣٠] سەرچاوەی پێشوو، ج٦، بڕوانە لاپەڕەکانی ٣١-٣٨.

[١٣١] بولس سلامە، الصراع في الوجود، بڕوانە ل١٣٥.

### ١-٣-٧-أ/ فەلسەفەی ئیشراق (اشراق)، یاخود (ئیشراقییەکان):

پەیڕەوانی ئەم جۆرە فەلسەفەیە، جگە لەوەی پەنا دەبەنە بەر بەڵگە و لێکۆڵینەوەی عەقڵی و فیکری هاوکات، بەدەستهێنانی مەعریفە لەڕێگەی (تأملات باطني) و چێژی ڕۆحی و ڕێژەن و ڕووناکبوونەوەی دەروون، بە پێویست دەزانن، کە ئەویش بەرهەمی کۆششی دەروونی و ڕۆحییە، چونکە پێیانوایە عەقڵ و فیکر بەبێ ڕووناکی و پاکبوونەوەی دەروون و زیندووکردنەوەی هەستە دەروونییەکان کەموکورتە. "پەیڕەوانی ئەم جۆرە فەلسەفەیە، کە تێکەڵکردنی (فەلسەفە) و (باطني) بوونە، لە ترادسیۆنی ئیسلامیدا پێکدێن لە (شێخ الأشراق) واتە (شێخ شەهابەددین سوهرەوەردی) و (شارەزووری). شێخ شەهابەددین فەلسەفەکەی خۆی لەسەر شوێنەواری فەیلەسوف و حەکیمەکانی دێرینی هیند، ئێران، بابل، میسر و یۆنان، بونیادناوە"[١٣٢].

شێخ شەهابەددین سوهرەوەردی لە سەرەتای کتێبەکەیدا (کتاب حکمة الأشراق)، باسی مەعریفە دەکات و پێیوایە جگە لە بەدەستهێنانی مەعریفە لەڕێی هەستەکانەوە، هەموو مرۆڤێکیش بە ڕێژەی کەم، یاخود زۆر و بە ئەندازەی کۆششی خۆی دەبێتە خاوەنی (ذوق)، کە هۆکاری بەدەستهێنانی حەقیقەتی مەعریفە و مەعریفەی (باطن)ە. واتە هەر لەسەرەتاوە مەعریفە دابەشدەکات بۆ سەر دوالیزمەکانی (حەقیقەت و ڕووکەش)، (هەستەکان و ذوق).

سوهرەوەردی پاشان باس لە (فیساغورس) دەکات تا (ئەفلاتوون) و پێیوایە، کە ئەم ڕەوشی مەعریفە وەرگرتنە لەڕێی (ذوق) و کۆششی (باطن)

---

[١٣٢] سید یحیی یثربي، فلسفة عرفان، ل٢٨.

یەوە، ڕەوشی ئەو فەیلەسوفە گەورانەش بووە و پاشان باس لەوە دەکات، کە گوتەی ئەو حەکیمە گەورانە بە شێوەی (ڕەمز) بووە بۆیە هەندێك ڕەخنەیان لێ دەگرن ئەگەرنا (باطن)ی ناوەڕۆکی نووسین و گوتەکانیان بگرین و (ظاهر) ڕووکەش تێپەڕێنین، ئەوا مەبەستە سەرەکیەکەمان بۆ دەردەکەوێت.

پاشان باس لە بنەمای (ڕووناکی و تاریکی) دەکات، کە لە ڕۆژهەڵاتدا، بنەمای تێڕوانینی حەکیمەکانی ئێران و (براهمن) بووە. دواتر بەگشتی زانایان پۆلێن دەکات بۆ سێ جۆر و باشترینیان بەوانە دەزانێت، کە پەیڕەوی لە (علوم ذوقي) و (علوم بحث)ی دەکەن و لەڕاستیدا تەنها ئەوانەن، کە (خلیفە الله)ن.

جگە لەم دوالیزمە دژیەکانەی، کە لە باسکردن و پۆلێنکردنی مەعریفەدا هەیەتی بەگشتی (عالم محسوسات)، یاخود (عالم بحث) بە جیهانی دوالیزمە دژیەکەکان دەزانێت، کە هەر خودی دوالیزمی دژیەکیش کەرەسەی پەیبردنە بەو جیهانە[١٣٣].

## ١-٣-٧-ب/ ڕەوشی (متكلمین):

بەگشتی ئەمانیش بابەتە دوالیزمەکان، کە لەهەمانکاتدا وەك دوالیزمی دژیەك دەردەکەون، بابەتی ململانێ و گفتوگۆکانیان بوو. بۆ نموونە (ابو الهذیل علاف)، کە لە (١٣٥-٢٣٥) کۆچیدا ژیاوە تیۆری (جوهر فرد)ی کردبووە بنەمای لێکۆڵینەوە شەرعییەکان و بە گونجاوتری دەزانی لە (هیولی) و (صورة)ی لای ئەرەستۆ. لەو ڕوانگەوە، کە ئەوەی لای ئەرەستۆ (قدیم)ە، بەڵام دەگونجێت (جوهر فرد) لەگەڵ (حادث) بووندا بێتەوە. بەکورتی ئەم

---

[١٣٣] سید یحیی یثربی، لە ڕاڤەی کتێبی حکمة الأشراق، فەلسەفەی عرفان، بڕوانە ل٣٠.

جۆره بابەتانە، کە دوالیزمی دژیەکن لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەکانی (متکلمین)یشدا بوو.

لە دامەزرێنەران و پەیڕەوانی ئەم ڕەوشە، بریتیبوون لە: حسن بەسری، جاحظ، باقلانی، ئەبولحەسەنی ئەشعەری، غەزالی، خواجە نصیرەدینی طوسی[١٣٤].

### ١-٣-٧-ج/ اخوان الصفا:

کۆمەڵەی (اخوان الصفا و خلاف الوفاء) کۆمەڵەیەکی نهێنی بووە، کە لە (بصرة) و لە سەدەی (١٠)ی زاینیدا دروستبوون و (٥٢) نامەی نووسراویان هەیە بەناوی (رسائل أخوان الصفا) و چەندین نووسراو و بەرهەمی دیکەیان هەیە.

بڕوایان وایە، کە (مردن)ی (جەستە) هیچ نییە جگە لە (لەدایکبوونی) (ڕۆح) هەروەك چۆن (گەوهەر) لە (صدف) دەردەهێنرێت. بڕوایان وایە، کە (قیامەت) ئەوساتەیە، کە (عارف) دڵ و دەروونی ڕووناك دەبێتەوە بە مەعریفەی خوایی و دەچێتە جیهانێکی نوێوە.

بڕوایان بەوە هەیە، کە (ڕۆح) بەشێکە لە نوری خوا، کە لە تاریکی جەستە و ماددەدا زیندانی کراوە و تەنها بە ناسینی خۆی ڕزگاری دەبێت و مرۆڤی عارف بەرزدەبێتەوە بەرەو (باڵا) و ئەم جیهانە نزم و پڕ لە دوالیزمی دژیەکە بەجێدێڵێت[١٣٥].

---

[١٣٤] سید یحیی یثربي، فلسفة عرفان، بڕوانە لاپەڕەکانی ٢٨-٣٣.

[١٣٥] فراس السواح، طريق اخوان الصفا، منشورات دار علاءالدين، دمشق – سوريا، الطبعة الأولى، ٢٠٠٨م. بڕوانە ل٢٠-٣٩.

## ١-٣-٧-د/ هەندێك لە فەیلەسوفەکانی ترادسیۆنی ئیسلامی: (کندی، ئیبن سینا، مولا صەدرا، غەزالی، فارابی، ئیبن روشد، ئیبن خەلدون)

(کندی) یەکێکە لە فەیلەسوفەکانی ترادسیۆنی ئیسلامی، ئەم فەیلەسوفە پێیوایە، کە جیهان ڕەنگدانەوەی (الله)، کە بالاترین (علة)یە و یەکەمین (علة) هۆکارە، کە دەرئەنجام چەندین (علة) و (معلول)ی لە ئاستی خوارەوەدا لێکەوتووەتەوە. (علة) کاریگەری هەیە بۆ (معلول)، بەلام (معلول) هیچ کارناکاتە سەر (علة).

بەگشتی تیۆری مەعریفە لای ئەم زانایە دوالیزمییە، کە پێیوایە بەهۆی هەستەکانی جەستەوە پەی بە (جزئیات) دەبەین و بەهۆی (عەقڵ)یشەوە پەی بە (کلیات) دەبەین[١٣٦].

جگە لەم زانایە هەردوو زانای ناوداری نێو ترادسیۆنی ئیسلامی، واتە (ئیبن سینا) و (مەلا صەدرا) دوالیزمی دژیەکیان لە ڕەوشی مەعریفیی خۆیاندا بەکارهێناوە. بەگشتی و بەکورتی ئەم دوو حەکیم و فەیلەسوفەی ترادسیۆنی ئیسلامی ڕەوشێکی پێشبینی کراوی لەوجۆرەیان گرتووەتەبەر، کە (خوا) بە (علة) هۆکاری یەکەم و کامڵ دەزانن و هەموو دروستکراوەکانی بە (معلول)ی ئەو (علة)یە دەزانن و سەبارەت بە بوونی شەڕەنگێزی و (خراپە) لە (بوون)دا بەوجۆرە ڕاڤەی دەکەن کە:

١. (خراپە) بە بەراورد لەگەڵ (چاکە) زۆر دەگمەن و کەمە.

---

[١٣٦] مجموعة من المؤلفين، الموسوعة الفلسفية المختصرة، بڕوانە لاپەڕەکانی ٣٤٨-٣٥٢.

٢. ئەم (خراپە)یە، کە زۆر کەمە بە کارکردن لەسەری بە بەڵگە و شیکردنەوە، لە نەبوونەوە سەر دەردەکات واتە لە ژیاندا بەسەردەچێت.

٣. (خراپە) بە دەرئەنجامی، یاخود زادەی گۆڕانکاری و دژیەکبوونی دیاردەکانی جیهانی (سروشت) دەزانن و نەبوونی گۆڕان و دژیەکبوون، یاخود دوالیزمی دژیەك وەك (حوکم) دانە بە نەمانی (جیهانی سروشت)، چونکە ئەوە سروشتی ئەو جیهانەیە. واتە دوالیزمی دژیەك تایبەتمەندی نەگۆڕی جیهانی ماددەیە[١٣٧].

فەیلەسوفێکی دیکە، کە (غەزالی)یە ئاماژەی داوە بە دوالیزمی دژیەك لە دیدە فەلسەفی و تێڕوانینە دەروونی و ڕەوشتییەکانیدا. ئەم فەیلەسوفە ناودارەی ترادسیۆنی ئیسلامی لەو قۆناغەدا، کە لە بواری فەلسەفەدا کاری کردووە بە فەیلەسوفی (شك) و (یقین) ناسراوە، کە دوانەیەکی دوالیزمی دژیەکە[١٣٨].

(فارابی) یەکێکی دیکەیە لە فەیلەسوفەکانی ترادسیۆنی ئیسلامی، کە زۆر هەوڵی نزیککردنەوەی فەلسەفەی یۆنانی و ئیسلامی داوە. فارابی هەموو (بوون) دەکاتە دوو جۆر (واجب الوجود) و (ممکن الوجود). (ممکن الوجود) (علة)ی دەوێ بۆ بوونی (علل)یش ناکرێت تا کۆتایی بڕوات بۆیە پێویستیمان بە (واجب الوجود)، کە بوونی یەکەمە و وەکو بوونەکانی دیکە نییە و لە بوونْدا تاکە و (دژ)ی نییە بەو واتایەی، کە (ضد) دژ بەگشتی لەگەڵ بەرامبەرەکەیدا،

---

[١٣٧] منصور ایمانپور، کاملیت جهان و مسئلهٔ شرّ در اندیشهٔ ابن سینا و ملا صدرا، نشریهٔ دانشگاه تبریز، شماره ١٩٩.

[١٣٨] مجموعة من المؤلفین، الموسوعة الفلسفیة المختصرة، ج٧، ل٧٨.

کە دژیەکن و دوالیزمی دژیەك پێکدەهێنن، هاوبەش، یاخود هاوسەنگی دژەکەیەتی و دوو دژەکەش هەر جارە و یەکێکیان ئەوی دیکە (باطل) دەکاتەوە، دەرئەنجام لەبەرئەوەی ئەو (واجب الوجود)ە هیچ (باطل)ی ناکاتەوە. کەواتە هیچ دژی نییە، بەڵام بوونەکانی تر هەموویان دژیان هەیە و پێکەوە دوالیزمی دژیەك پێکدەهێنن[١٣٩].

فەیلەسوفێکی دیکەی ناو ترادسیۆنی ئیسلامی، کە لە هەوڵی نزیککردنەوەی (فەلسەفە) و (شەریعەت)دا بوو، (ئیبن روشد)ە. ئیبن روشد داهێنەری ڕاڤەی (باطن)ە لەبەرامبەر ڕاڤەی (ظاهر)یدا. لەپێناو نزیککردنەوەی (فەلسەفە) و (شەریعەت) لەیەکتری و دەرئەنجام پێیوایە ڕاڤەکردنی (باطن)یانە بۆ کەسانێکە، کە (اهل البرهان) بەڵگە ویست و خاوەن ژیری تەواون[١٤٠].

دواجار بە پێویستی دەزانین ئاماژە بە (ئیبن خەلدون) بکەین. ئەم زانایە بڕوای وابوو، کە واقیعی مێژوویی زادەی دیاردە و ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکانە، کە ئەویش زادەی ململانێ و هاوکێشە هۆکارییەکانی نێوان دژەکانە لە سروشتدا.

ئەم زانایە (شارستانیەت) بە دوا ئامانجی قۆناغەکانی گەشەکردنی سروشتیانەی ژیانی کۆمەڵگا دەزانێت، ئەویش لەبەر دوو هۆکار:

١. گەشەکردن لە ژیانی (لادێ) وە بۆ (شار).
٢. (تفاعل)ی نێوان گەلان و کاریگەری ململانێی نێوان (غالب) و (مغلوب) و لەو ڕوانگەوە، کە (دولة) دەوڵەت دروستنابێت و پێکنایەت تەنها بە

---

[١٣٩] سەرچاوەی پێشوو، ج٨، بڕوانە ل٥٢.

[١٤٠] سەرچاوەی پێشوو، ج١٠، بڕوانە ل١٧٨.

لۆژیکی (غلبة) نەبێت. کەواتە (شەڕ) و ململانێ بابەتێکی سروشتی نێوان گەلان و نەتەوەکانە.

بەگشتی ئەم زانایە ململانێی نێوان دژەکان دەکاتە هۆکاری گەشەی مێژوو و پێکهێنانی دەوڵەت و شارستانیەت و پێیوایە ململانێی نێوان دژەکان لە سروشتی ژیان و کۆمەڵگایە[١٤١].

لە کۆتایی ئەم خاڵەی پاری سێهەمدا، کە باسی (دوالیزمی دژیەك) بوو لە فەلسەفەدا، گەیشتینە ئەو دەرئەنجامەی، کە (دوالیزمی دژیەك) گرنگترین بابەت و کاراترین هۆکار و ڕەگەزی چۆنیەتی گەڕان بوو بەدوای حەقیقەت و چیەتی بووندا. لێرەدا و بەگشتی لە کۆتایی ئەم پارەدا، خاڵی دووەم زۆر بەکورتی دەخەینە بەر باس (دوالیزمی دژیەك لە لۆژیك دا)، چونکە خودی پاری یەکەم پێناسەی فەرهەنگی (دوالیزمی دژیەك) بوو، لە چوارچێوە لۆژیکیەکەی دا، چونکە پێناسەی فەرهەنگی و بەکارهێنانی زاراوەیی لە دەرەوەی لۆژیك نییە.

## دووەم: دوالیزمی دژیەك لە لۆژیك دا:

دژیەکبوون، یاخود دوالیزمی دژیەك لە لۆژیکدا، دەچێتە جوغزی، یاخود چوارچێوەی بەشی (تقابل) لۆژیکی، واتە ئەو بابەتانەی، کە لە لۆژیك بەرامبەر یەك و وەکو دوو جەمسەر دادەنرێن. لۆژیك واتە ئەو هونەرەی، کە نیشانمان دەدات، کە چۆن باش بیربکەینەوە و خۆمان لە هەڵەکانی (فیکر) دووربخەینەوە.

---

[١٤١] سەرچاوەی پێشوو، ج١١، بڕوانە ل٨٥.

لە لۆژیکدا ئەگەر مرۆڤ فێری ئەوە ببێت، چۆن بیربکاتەوە و ڕێنمایی (فیکر)ی بکات و لە پێشینەکان (مقدمات) دەرئەنجام (نتیجە)ی ڕاست وەربگرێت. ئەوا ئیتر کەمتر تووشی سەرلێشێوان دەبێت.

(تقابل)، یاخود بەرامبەر یەك دانان، واتە ئێمە دوو سیفەتمان هەبێت، کە پێکەوە و لەیەك بابەتدا و لەیەك کات و لەیەك ڕووەوە نەتوانرێت کۆبکرێتەوە، واتە (لۆژیك) ڕێگە نادات کۆیان بکەینەوە، چونکە بەپێی هاوکێشە لۆژیکییەکان نابێت و ناگونجێت.

بەگشتی (تقابل)یش چەند جۆرێکی هەیە، کە جۆرەکان و پێناسە و بەراورد و جیاوازییان، لە پاری یەکەمی ئەم بەشەدا باسکراوە پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکات[١٤٢].

ئەم بابەتی دوالیزمی دژیەکە، کە لە (لۆژیك)دا ڕەتدەکرێتەوە و پەسەند نییە، لە ئەدەبدا دەبێتە هونەر و دەربڕینی هونەرییانە، کە لە دواپاری ئەم بەشەدا باسی دەکەین.

## ١-٤/ دوالیزمی دژیەك لە ئەدەبدا بەگشتی و لە ئەدەبی عیرفانیدا بەتایبەتی

### ١-٤-١/ بەهای ئەدەبی دوالیزمی دژیەك:

هەروەك چۆن دوالیزمی دژیەك بنەما و ڕەگەزێکی سەرەکی سروشتە، لە هەمان کاتیشدا یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی زمان ئەدەبناسێك لەم ڕووەوە دەڵێ: "لە دەقی ئەدەبیدا بۆ لێکۆڵینەوەی ئیستاتیکیانە لە دوالیزمی دژیەك،

---

[١٤٢] عبدالکریم سروش، تضاد دیالیکتیکی، ل٧-١٥.

پێویسته ئاگاداربین، که ئایا شاعیر بەشێوەیەکی بەئاگایانه دوالیزمی دژیەك بەکاردەهێنێت* له هۆنراوەکانیدا، یاخود نا؟ ئەگەر وەڵامەکه ئەرێنی بێت ئەوا بێگومان له هێنانی دەستەواژە و چەمکه دژەکان له هۆنراوەکانیدا ئامانجێکی هەیه و پێویسته به سەرنجدانی وردمان بۆ ئەو دوالیزمه دژیەکانه، له پەیامی شاعیر تێبگەین، بەڵام ئەگەر وەڵامەکه نەخێر بوو، ئەوا ئەو هێنانی دوالیزمی دژیەکه جێگای بایەخی جوانکاری نییه و ناتوانرێت وەك ئەفراندنێکی ئەدەبی و هونەری ئەژماربکرێت، چونکه تەنها سەرفکردنی زاراوەی دژیەك له دەق و گوتاردا، ناتوانێت قایلمان بکات به بوونی وەستایەتیی ئەدەبی و سەرسامبوون. هونەری ئەدەبی بۆ جوانکردنی دەربڕین و ئامانجی تایبەت بەکاردێت و پێویسته هەڵگری ڕەهەندی ئیستاتیکی بێت و هەستی جوانیناسی و سەرسوڕمانی گوێگر، یاخود بەرامبەر ڕازی بکات، جگه لەوە هەڵگری هیچ بەهایەکی ئەدەبی نییه"[١٤٣].

دوالیزمی دژیەك، خۆی جۆره ڕێکخستن و گونجاندنێکی وشەکانه لەگەڵ یەکتر. کاریگەری و کارایی دوالیزمی دژیەك و چەمکەکانی له شیعردا، تەنها کاتێك به سنعەتی ئەدەبی ئەژماردەکرێت، که شاعیرەکه بەو هونەره باڵانسی جوانی هۆنراوەکه بەرزتر بکاتەوە و ببێته مایەی هەڵچوونی سۆزی گوێگر..."[١٤٤].

---

* لێرەدا مەبەستمان له بەئاگایی، ئاستی زانستی و رۆشنبیری شاعیره به هونەرەکانی رەوانبێژی و دەربڕین، ئەگەرنا زۆرجار بێئاگایی (لاوعي) دەبێته زەمینەی ئەفراندنی شاعیر.

[١٤٣] جواد مرتضایی، نقد و تحلیل پارادوکس، مجله ٔ دانشکده ادبیات، دانشگاه اصفهان، شماره ٤٧، ل١٥٩.

[١٤٤] سەرچاوەی پێشوو، ل٤٩.

وەك پێشتر باسمان كرد دوالیزمی دژیەك لە سروشت و هەموو مەوداكانی ژیاندا بوونی هەیە و لە جیهانی فیكریشدا یەكێكە لە ڕێگاكانی مەعریفە. هەربۆیە پێدەچێت، شاعیران و ئەدیبان پەیانبردبێت بە نهێنی دوالیزمی دژیەك و بایەخی لەڕووی ڕاكێشانی باری سەرنجی گوێگرانەوە، هەربۆیە دوالیزمی دژیەكیان لە جیهانی ئەندێشە و خەیاڵ و هەستەوە بۆ ئەفراندنی وێنەی جوانی هونەری، هێناوەتە ناو دەقی شیعری و ئەدەبییەوە. لەمبارەوە عەبدولكەریم سروش دەڵێت: "دوالیزمی دژیەك، بەشێوەی دەربڕینێكی هونەرمەندانە لە ئەدەبیاتدا، وەك دەرهاویشتەیەكی زەینی مرۆڤ بۆ چەمكی دوالیزمی دژیەك و لە دەرئەنجامی هێزی كاردانەوەی دوالیزمی دژیەك، لەپێناو دەربڕینی ئەندێشە ناسك و وردەكانی شاعیراندا، سوود لەم دەربڕینە هونەرمەندانە و دەرهاویشتە زەینی و هێزە بۆ جوانكردنی چۆنیەتی دەربڕین و دەقی ئەدەبی وەرگیراوە.."[١٤٥].

هەروەها دەڵێت: "ئەمە سنعەتێكی ئەدەبی چێژبەخشە و نهێنیەكەشی هەر دەڵێی لەوەدایە، كە دەربڕینێكە پێچەوانەی نەریت و لۆژیكە... ڕۆڵی دوالیزمی دژیەك لە دەقی ئەدەبیدا هەڵكشانی سەرسوڕمان و چێژە لە گوێگردا..."[١٤٦].

ئەدەبیاتیش هەروەك هەموو زانستەكانی دیكە دوو بابەتی دژبەیەك ڕەتدەكاتەوە، بەڵام هەندێكجار شاعیران و نووسەران دوو سیفەتی دژبەیەك بەجۆرێكی هونەرمەندانەی ئەوتۆ و هۆشیارانە لە دەقێكدا بەكاری دەبەن، كە ئێمە ئەو گوتە و دەقە جگەلەوەی بە چێژەوە وەریدەگرین هاوكات بە بیری

---

[١٤٥] عبدالكريم سروش، ذكر جميل سعدى، انتشارات حكمت، چاپ اول، ١٣٥٧ هـ.ش. ل٢٥٧.

[١٤٦] سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

قووڵ و کۆشش بۆ لێکدانەوەی عەقڵی و سەرنجدانی، چێژی تایبەت تری لێوەردەگرینو بەو جۆرە لە زەینماندا بە نەمری دەمێنێتەوە. بەکورتی و بە واتایەکی تر، بابەت و جۆرە گوتنێك پێچەوانەی ئەوەی وەرمانگرتووە و خومان پێوە گرتووە.

دوالیزمی دژیەك کەرەسەیەکی زمانی شاعیرانەیە، کە شاعیر بە خستنە بەرچاوی زاراوە دژەکان سەرنجمان ڕادەکێشێ و دەرئەنجام واتایەکی نوێمان بۆ دەخولقێنێ.

ئەو جۆرە زمان و نووسینەی، کە دوالیزمی دژیەکی تێدایە، چۆنیەتی دەربڕین و توانایی بیرکردنەوە لە ئاستێکی نزمەوە بەرزدەکاتەوە. بۆ پەیبردن بەم جۆرە زمانە، کە هەڵگری دوالیزمی دژیەکە پێویستیمان بە زەین و جۆرە عەقڵێکە، کە بتوانێت چەمکە ناسازەکان بە جۆرێکی تر سازکاتەوە.

هەر دەربارەی دوالیزم توێژەرێکی تر دەڵێ: "هەرچەندە قووڵتر بڕوانینە ئەو دەربڕینانەی، کە دوالیزمی دژیەکی تێدایە و بەشێوەیەکی ڕووکەش بینانە سەیری نەکەین، ئەوکات دەتوانین چەندین ڕاستی شاراوە ئاشکرا بکەین، کە لە دەقەکەدا بەئاسانی خۆی دەرناخات. دوالیزمی دژیەك لە بەرهەمی عارف و هونەرمەند و فەیلەسوفە گەورەکاندا چەندین ئەندێشەی قووڵی گرتووەتە خۆی، کە هێندەی پانتایی دوالیزمەکان زیاتر بێت ئەوا گەورەیی و قووڵی ئەندێشەکەش والاتر و سەرنج ڕاکێشترە"[١٤٧].

دوالیزمی دژیەك وەك هونەرێکی ئیستاتیکا و کەرەسەیەکی دەربڕین و هەڵسەنگاندن لە کایەکانی ڕەگەز و هونەرەکانی ئەدەبدا بوونی هەیە و بە

---

[١٤٧] هوشنگ اشرافیان، زبان پارادوکس، سایتی: http/literature-dept.talif.ir

پانتایی مێژووی ئەدەبی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بایەخی خۆی هەبووە و تەنانەت بووەتە سیما و تایبەتمەندی هەندێ نووسەر و قوتابخانەی ئەدەبی. لێرەدا هێندەی بتوانین هەندێك لەو بوارانە وەك بەڵگە دەخەینەڕوو.

## ١-٤-٢/ ئەفسانە:

ئەفلاتون یەکەمین کەس بوو، کە وشەی (Mythologia)ی میتۆلۆجیای بۆ هونەری گێڕانەوەی چیرۆك بەکارهێنا بەتایبەتی ئەو جۆرەی، کە ئەمڕۆ ئێمە بە (ئەفسانە) ناوزەدی دەکەین.

ئەفسانە چەند تایبەتمەندیەکی هەیە، لەوانە:

١. لەڕووی شێوازەوە ئەفسانە جۆرێکە لە جۆرەکانی ئەدەب، هەروەك چیرۆك، ڕەگەزەکانی پلۆت و گرێ و ململانێی کەسەکانی تێدایە.

٢. بابەتی ئەفسانە ململانێی خواکانە، خوای تاریکی و ڕووناکی. چاکە و خراپە، جوانی و ناشیرینی.

٣. لەڕووی کاتەوە، لە چوارچێوەی کاتێکی دیاریکراودا نییە، بەڵام بەردەوام ئامادەیی هەیە، بۆ نموونە خوای گەرمای (تەموز)، کە دەکوژرێت تا لە بەهاردا بگەڕێتەوە، ئەمە ئەفسانەیەکی (سۆمەری)یە و بەردەوام ئێمە هاوین بەڕێدەکەین و لە کۆتاییدا چاوەڕێی بەهارین. خوای (مەردۆخ) لای ئێرانییەکان هەموو سەری ساڵێك واتە بەهاران سەرلەنوێ گەردوون دروست و نوێ دەکاتەوە و ئێستاش واباوە. یاخود ململانێی خوای (بعل) لەگەڵ (لونان) ماردا، کە شەش سەری هەیە، ئەمە ئاماژەیە بە ململانێی چاکە و خراپە، کە هەمیشە بەردەوامە.

٤. بابەتەکانی ئەفسانە لە چوارچێوەی بابەتە گەورەکانی ژیان و گەردووندایە، کە بەردەوام عەقڵی مرۆڤ عەودالّی بووە، وەکو (مردن و ژیان) و (جیهانی بینراو و نەبینراو) و (دروستبوونی گەردوون و لەناوچوونی)، کە هەموو ئەمانە جگەلەوەی دوالیزمی دژیەکن جێگای بایەخی مرۆڤن.

٥. خواکان و دژەکانیان، کە ئەوانیش خوان، ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕن لە ڕووداوەکانی نێو ئەفسانەدا و ململانێ لەنێوان ئەو خوایانەدا هەیە، کە وەك دوالیزمی دژیەك دەردەکەون (خوای ئاسمان و زەوی)، (چاکە و خراپە)، (شەڕ و ئاشتی)، (خۆشەویستی و ڕق). بەم جۆرە ئەفسانە جۆرێك لە پیرۆزی هەیە و زۆرجار جگەلەوەی سەرەتای بیری ئایینییە، دەشگونجێت وەکو کەرەسەیەکی گوزارشتکردنی ئایینیش بەکاربهێنرێت.

ئەفسانە یەکەمین بەرهەمی ئەدەبیە، کە مرۆڤ بەرهەمی هێناوە و ململانێی نێوان دژەکان، کە زۆرجار خوان و دوالیزمی یەکتریشن، بابەتی سەرەکی ئەفسانەیە. بەگشتی سێ جۆر ئەفسانە هەیە: یەکەمیان – ئەو ئەفسانانەی، کە یۆنانییەکان بۆیان بەجێهێشتووین، کە پەیوەستە بە جیهانبینی و بیروباوەڕیانەوە و بەشێك لە باوەڕی ئایینیان پێکدەهێنێت. دووەمیان – ئەو جۆرەیە لە ئەفسانە، کە هیچ پەیوەندیەکی بە ئایینەوە نییە، بەڵکو بەرهەمی نەتەوەکانە وەکو ئەفسانەی (ڕۆستەمی زاڵ). جۆری سێهەمیان ئەگەرچی کارەکتەرەکانی پڕن لە شەیتان و خواکان و هێزی چاکە و خراپە، بەڵام سەربەخۆیە لە ئایین و بابەتی ئایین نییە. ئەوەی بۆ ئێمە لێرەدا گرنگە ململانێی نێوان دوالیزمەکانە، کە بابەتی بنەڕەتی هەر سێ جۆرەکەی ئەفسانەیە[١٤٨].

---

[١٤٨] فراس السواح، دين الأنسان، بڕوانە لاپەڕەکانی ٥٦–٦٩.

ئەفسانە چیرۆکە، چیرۆکێکی پیرۆزە، کارەکتەرەکانی خواکانن، تۆماری کاری خواکانە، یەکەمین دەربڕینە سەبارەت بە هەموو ئەو کارانەی لە جیهانی مرۆڤدا ڕوویان داوە، ئەفسانە جگە لەوەی بووە بە بابەتێکی بەهێزی شیعر، بوەتە داهێنەری شانۆگەریش، کە زۆرجار لەسەر شانۆ خوا دژەکان، یاخود سومبولەکانی چاکە و خراپە و ڕووناکی و تاریکی دەکەوتنە شەڕ و ململانێ.

فرۆید لە کتێبەکەیدا (ڕاڤەی خەونەکان) زۆر بە سەرنجەوە باسی ئەفسانە دەکات، لەگەڵ (خەو)دا بەراوردیان دەکات و بە یەکتریان دەچوێنێت، فرۆید پێیوایە، کە خەون و ئەفسانە پڕن لە سیمبوڵ، کە ئەگەر ڕاڤە بکرێن ئاماژە دەدەن بۆ دەروونی شاراوەی مرۆڤ کە چەند خواستی خنکێنراوی تێدایە و لەڕاستیدا مرۆڤ بەردەوام لە ململانێی دەروونی دژەکاندا دەژی وەك ئەفسانە. لێرەدا ئاماژەدان بە ڕاڤەی فرۆید بۆ ئەفسانەی (ئۆدیب) بەسە وەك بەڵگە بۆ ڕاکانمان. لەو ئەفسانەدا منداڵەکان، یاخود کوڕەکان هاوکاری یەکتری دەکەن بۆ کوشتنی باوکیان تا ژنەکانی باوکیان بۆخۆیان بێت، کاتێك ئەوەیان بەدەستهێنا، کەوتنە لۆمەی خۆیان و ژنەکانی باوکیان (بە یاسایەك) لە خۆیان حەرامکرد[١٤٩].

زۆر ڕا هەیە لەسەر چییەتی ئەفسانە، هەندێك بە کەڵەکەبووی بەرهەمی فیکری مرۆڤایەتی دادەنێن، کە وەك شاکارێکی ئەدەبی دەردەکەوێت و هەندێکی تر ئەفسانە دەگێڕنەوە بۆ سەرچاوەی سروشت واتە دیاردەکانی سروشت و ڕووداوەکانی وەکو مانگ و خۆر، یاخود هەورە بروسکە و هەڵچوونی دەریاکان و بومەلەرزەو...هتد.

---

[١٤٩] فراس السواح، مغامرة العقل الأولى، منشورات دار علاءالدين، دمشق – سوريا، الطبعة الثالثة عشر، ٢٠٠٢م. بڕوانە ل٥–٣٩.

هەندێکی تریش بە زیادەڕەوی لە گێڕانەوەی ڕووداوی مێژوویی و دواجار ڕای لەوجۆرەش هەیە، کە بە نووسینەوەی سروتە ئایینییەکانی دەزانێت[١٥٠]، بەڵام بەگشتی ئاماژە بۆ ئەو ڕاستیە دەکەن، کە ئەفسانە ململانێیە و ململانێی نێوان دژەکان و زۆرجار دوالیزمە دژەکانە.

## ١-٤-٣/ دوالیزمی دژیەك لە ڕەوانبێژی عەرەبیدا: (سەعدەدین تەفتازانی، ئەحمەد هاشمی)

کاتێك دەڵێین ڕەوانبێژی عەرەبی، مەبەستمان لەو هونەرەی دەربڕینە، کە لەم ناوچەیەدا دەرکەوتووە و لە زمانی عەرەبیدا بەهۆی قورئانەوە گرنگی زیاتری پێدراوە، چونکە هونەری پەیبردن و تێگەیشتن بووە لە واتای قورئان.

"یەکێك لە سنعەتە واتاییەکانی نێو زانستی (جوانکاری) (طباق)، یاخود (دژیەك) بوونە، ئەم هونەرە بەجۆرێکە، کە لە دەربڕینەکەدا وشە دژیەکەکان لە نزیك یەکەوە دادەنرێن بەجۆرێك، کە خودی دەربڕینەکە بخوازێت و پێویست بکات و دەربڕینەکە لە حاڵەتی گونجان و هاوسەنگی دەرنەکات. وەك (هو الأول والآخر والظاهر والباطن) واتە هەر خوا خۆی سەرەتا و کۆتاییە و ڕووکار و ناوەوە"[١٥١]. "دژیەك، بریتیە لە کۆکردنەوەی شت و بەرامبەرەکەی، یان شت و دژەکەی"[١٥٢]. "بریتیە لە کۆکردنەوەی نێوان دوو دژ لە ئاخاوتندا"[١٥٣].

---

[١٥٠] فراس السواح، مغامرة العقل الأولى، بڕوانە ل٥-٣٩.

[١٥١] غلامرضا کریمی فرد، پارادوکس خاستگاه و پیشینه ٔ آن در بلاغت عربي. ئەنتەرنێت.

[١٥٢] فضـل حسـن عباس، البلاغـة فنونهـا وأفنانهـا (علـم البيـان والبـديع) دار الفرقـان للنشـر والتوزيع، عمان – الأردن، الطبعة الأولى، ١٩٨٧م. ل٢٧٥.

(طباق)، یاخود دژیەك، دەتوانرێت بە شێوازی جۆراوجۆر لە دەربڕین و گوتەدا دەرکەوێت. بۆنموونە لەنێوان دوو (ناو)دا یان دوو کردار، یاخود دوو پیت. هەروەها دەگونجێت لەنێوان یەك ناو و یەك کاردا بێت، بەگشتیش دەگونجێ پۆزەتیڤ، یاخود نێگێتیڤ بێت لەنێوان دوو دەستەواژەدا، یاخود دوو ڕستەدا بێت، هەندێکجاریش واپێدەچێت دژیەك بێت ئەگەرنا دژیەك نییە.

هەر لەم بارەوە ئێستا لە ئەدەبو ڕەخنەی نوێدا، وێنەی دژبەیەك هەیە لە کۆی بەرهەمێکی ئەدەبیدا، کە بە (پارادوکس) ناوزەد دەکرێت و دواتر لە باسی دوالیزمی دژیەك لە ئەدەبی مۆدێرندا باسی دەکەین[١٥٤].

لە یەکەمین ئاماژەماندا بە یەکێك لە زانایانی بواری زانستی ڕەوانبێژیی پێویستە باسی (سەعدەدینی تەفتازانی) بکەین. ئەم زانایە، کە زانای بوارەکانی (نحو، صرف، المعاني والبیان، الأصول والکلام، المنطق والفلسفة)یە. واتە (مەسعود کوڕی عومەری کوڕی عبدالله) ناسراو بە شێخ سەعدەدینی تەفتازانی (٧١٢-٧٩١ك) لە بەشی یەکەمی کتێبەکەیدا بەناوی (شرح المختصر)، گۆشەیەکی تایبەت کردووە بەناوی (المطابقة)وە، کە لەوێدا دەڵێ: "هەروەها (طباق) و (تضاد)یشی پێدەوترێت، بریتیە لە کۆکردنەوەی، یاخود پێکەوە هێنانی دوو دژیەك، واتە دوو واتای بەرامبەر یەك لە ڕستەدا، کە لەنێوانیاندا (تقابل)، یاخود (تنافي) هەبێت ئەگەرچی لە چەند وێنەیەکیشدا

---

[١٥٣] أمین ابولیل، علوم البلاغة (المعاني والبیان والبدیع)، دار البرکة للنشر والتوزیع، عمان – الأردن، ٢٠٠٦م. ل٢١٤.

[١٥٤] سیروس شمیسا، نگاهی تازه به بدیع، نشر میترا، چاپ چهارم، ١٣٩٠ هـ.ش. بروانە ل٢٥.

بێت، ئیتر دەگونجێت (تقابل)ەکە (حقیقي) بێت، یاخود (اعتباري)، دوالیزمی دژیەك بن، یاخود بەرامبەر بوونی پۆزەتیڤ و نێگێتیڤ. کۆکردنەوەی ئەم دوو دژە هەندێکجار لەنێوان دوو دەربڕین یا دوو ناو یان دوو کردار، یاخود دوو پیتدا بێت وەکو (الیها ماالکتسبت وعلیها ماالکتسبت)، لێرەدا پیتی (لام) بۆ (سودە)، بەڵام پیتی (علا) بۆ زیانکردنە، بەگشتی باسێکی ورد و دووردوورودرێژی (طباق)ی کردووە، بەڵام ئێمە ئەم هێندە وەك بەڵگە دەخەینەڕوو لەسەر گرنگی و بەهای (طباق) لای زانایەکی گەورەی بواری ئەدەب و ڕەوانبێژی[١٥٥].

ئەگەرچی چەندین زانای دیکە لە نموونەی (سکاکیو جورجانیو...هتد) لەم بوارەدا جێدەستیان دیارە، بەڵام دواجار یەکێکی دیکە لەو زانا ناودارانەی، کە لە بابەتی ڕەوانبێژیدا پێشڕەوی و دەستپێشخەرییان هەیە، (السید احمد الهاشمی)یە. ئەم زانایەش لە کتێبەکەیدا (جواهر البلاغة)، زۆر بە دوورودرێژی باسی (طباق)ی کردووە و بەمجۆرە پێناسەی دەکات: "بریتیە لە کۆکردنەوەی دوو دەستەواژە، کە لەڕووی واتاوە (مقابل) بەرامبەر یەکتری بن، هەندێکجار دوو ناون وەکو (هو الأول والآخر والظاهر والباطن)، یاخود دوو کردارن..."[١٥٦] بەگشتی ئەم زانایە وەك پێشینانی خۆی باسی گرنگی (طباق)ی کردووە وەك هونەرێکی دەربڕین.

---

[١٥٥] التفتازانی، شرح المختصر، ج١، شرح المختصر، انتشارات دار الحکمە، چاپ أمیر، چاپ سوم، ١٣٦٠ هـ.ش. بروانە ل١٣٦–١٤١.

[١٥٦] احمد الهاشمی، جواهر البلاغة، مرکز انتشارات دفتر تبلیغات اسلامي – حوزە قوم، چاپ سوم، ١٣٧٠ هـ.ق. ل١٦٦–١٦٩.

## ١-٤-٤/ دوالیزمی دژیەك لە ئەدەبی هاوچەرخدا:

لەم لێکۆڵینەوەیەدا و لە بابەتی (دوالیزمی دژیەك لە فەلسەفەی مۆدێرندا)، باسی دوالیزمی دژیەکمان کرد، وەك بنەمایەك بۆ جیهانبینی نوێو هەروەها وەك ڕێچکەیەکیش بۆ لێکۆڵینەوە لە (بوون)، بێگومان (ئەدەب)یش زادەی تێڕوانین و دیدمانە بۆ (ژیان). دەرئەنجام دەگەینە ئەو ڕاستیەی، کە دوالیزمی دژیەك و ململانێی نێوان دژەکان پێکهێنەری زۆر ڕێچکەی ئەدەبییە و بەشێکە لە پێکهاتەی چۆنیەتی بیرکردنەوەی زۆر نووسەر و ڕەخنەگری بواری ئەدەب. بەجۆرێك، کە لە سەردەمی مۆدێرندا (دوالیزمی دژیەك) جگەلەوەی بووەتە بابەتێکی گرنگ بۆ زۆر بەرهەمی ئەدەبی لەهەمانکاتدا لای ڕەخنەگرانی بواری ئەدەبیش شێوازێکی ناسینەوەی، یاخود جیاکردنەوەی دەربڕینی بەهێزە لە دەربڕینی ڕووکەشو سادە.

دوالیزمی دژیەك بابەتێکی سەرەکی نێو ئەدەبی میللی و فۆلکلۆریشە (کە لە سەردەمی ئەدەبی هاوچەرخدا جێگای بایەخە)، بەو بەڵگە، کە بەردەوام لەو دوو جۆرە ئەدەبەدا باس لە ململانێی نێوان دژەکان دەکات لە بابەتی نەریتی کۆمەڵایەتی و کۆن و نوێ و ململانێی چاکە و خراپە و تادەگات بە باسی دێو و درنج و پۆلێنکردنی ئاژەڵەکانیش بۆ دڕندە و مرۆڤ دۆست و فێڵباز و زیرەك و گەلحۆ و بەوەفا.

لە ڕەخنەی نوێدا، دوالیزمی دژیەك لە تایبەتمەندییە بنەڕەتییەکانی (شیعر) ئەژمار دەکرێت، تا ئەو ڕادەیەی، کە شاعیری سادەبێژیش ناچارە، دوالیزمی دژیەك بکاتە کەرەسەی دەربڕینی خۆی. بۆچوونی هەندێ لە بیرمەند و

ئەدەبناسان بەم شێوەیەیە: "(دیچن) زمانی دوالیزمی دژیەك، بە زمانی شیعر دەزانێت، کە بڕوای وایە دەربڕینەکان لەڕێی دوالیزمی دژیەکەوە زۆر گونجاوە لە زمانی شیعریدا، شاعیر لەڕێی دوالیزمە دژەکانەوە ڕاستییەکان دەردەبڕێت.

(فردریك شللیگل) و (توماس دکونس) سەلماندوویانە، کە دوالیزمی دژیەك ڕۆڵێکی بنەڕەتی لە دەربڕینی شیعردا هەیە، چونکە دوالیزمی دژیەك چییەتی ئەم جیهانە دژیەکە دەردەخات، کە هەمان ئەرك و کاری شیعرە"[١٥٧].

هەر لەم ڕووەوە ئەدەبناسێك دەڵێ: "دوالیزمی دژیەك وەك دەرکەوتەیەکی مۆدێرنە لە قووڵایی مێژوودا ڕەگوڕیشە و بوونێکی کارای هەیە و هەر ئەم دوالیزمی دژیەکەیە، کە مرۆڤی بزواندووە و چالاکی کردووە لە ڕێڕەوی جیهانبینی خۆیدا، بەجۆرێك لە کایەی (ڕەوشت)دا دوالیزمی دژیەکی (چاکە و خراپە) و لە (لۆژیك)دا (ڕاست و هەڵە) و لە میتافیزیکدا (ظاهر و باطن) و...هتد خستووەتەوە. بنەمای بنەڕەتی فیکری مۆدێرنەش بەهەمانشێوە لە چوارچێوەی دوالیزمی دژیەکدایە، کە هەمان بابەتی بنەڕەتییە، کە خۆی لە (الذات) خود و (موضوع) بابەتدا دەبینێتەوە، خود وەك ئازادی و کار و ئیرادە و پێوەر، بابەتیش وەك تۆڕێك لە دەرهاویشتەی بابەت و حەتمی بوون، یاخود ڕەها و نەگۆڕ. بەواتایەکی تر مرۆڤ لە تێڕوانینی فیکری مۆدێرندا بەردەوام لە ململانێدایە لەنێوان دوالیزمە دژەکانی (الأختیار) هەڵبژاردن و (جبر) سەپاندندا"[١٥٨].

---

[١٥٧] فرشید وز بله، متناقض نما در غزلیات حافظ، سایتی تحلیلی خبری عصر ایران.

[١٥٨] سراته البشیر، الخطاب الشعري والثنائیات الضدیة، ٢٠١١، ئەنتەرنێت.

دکتۆر (روح الله صّیادی نژاد) لە باسی (دوالیزمی دژیەك لە ئەدەبیاتی هاوچەرخی عەرەبیدا) باس لە گرنگی و بایەخی دوالیزمی دژیەك دەکات و پێیوایە لە هەردوو بواری زمانەوانی، یاخود ڕێزمانی و (سیمانتیك) واتایشەوە، بوون و کاریگەری هەیە. دکتۆر (صّیادی نژاد) لەڕوانگەی ڕەگەزەکانی ڕێزمانەوە و هەروەها لەڕوانگەی واتاییەوە چەندین پۆلێنبەندی دەکات بۆ دوالیزمی دژیەك[١٥٩].

دکتۆر (احمد مداس) لە کتێبی (لسانیات النص)دا، کە ئامانجی کتێبەکەی بەمجۆرە دیاریکردووە (نحو منهج لتحليل الخطاب الشعري) واتە بە ڕێبازێکی شیکاریانە بۆ دیسکۆرسی شیعری، لە بەشی دوالیزمی دژیەکدا دەڵێ: "دوالیزمی دژیەك شێوازێکی تایبەتە، کە ڕەخنەگران شیکارییەکانی خۆیان لەسەر بونیاد ناوە، هەروەکو چۆن (کمال ابوديب) لە بنەمای دوالیزمی دژیەکەوە هەوڵی گەیشتنی داوە بەو نموونە فیکری و مەعریفیەی، کە دواتر دەرئەنجامەکەی گشتاندووە بەسەر هەموو شیعری جاهلیدا. پاشان لە دوالیزمی دژیەکەوە جۆرە پەیوەندیەکی بونیادناوە لەنێوان بەش و پارچەکانی چامەی (لبيد)دا، کە لەسەر بنەمای دوالیزمی دژیەکی (ظاهر) ئاشکرایە..."[١٦٠].

پاشان دەڵێ: "دوالیزمی دژیەك بە هەموو جۆرەکانیەوە، هاوشێوەیی (التشاكل– Isotopie) و جیاوازی (التباين– Alotopie) دروستدەکات، لە بەکارهێنانی زمانەوانیدا.

---

[١٥٩] روح الله صّیادی نژاد، متناقض نما در شعر معاصر عربی، بڕوانە: مجلە زبان و ادبيات عربی، شماره ٢، سالی ١٣٨٩ هـ.ف.

[١٦٠] احمد مداس، لسانيات النص، عالم الكتب الحديث للنشر والتوزيع، ٢٠٠٧م. ل٦٢.

جگە لەوانەش (سمیر الدیوب) ڕایوایە کە: "دوالیزمی دژیەك فەزایەکی ناوازە دەخاتەوە لە دەقدا، بەجۆرێك، کە کۆمەڵێ پەیوەندی کاتی و شوێنی و کارەکی پەیوەست بە سەردەمی جیاوازەوە، بەگشتی ئەم پەیوەندیانە لە چەندین جەمسەرەوە بەیەك دەگەن. بەیەك دەگەن و بەیەکدا دەدەن و دەپچڕێن و پێکدێنەوە و دەرئەنجام ئەو بەرهەمەی لێدەکەوێتەوە، کە دەقەکە دەوڵەمەند دەکەن و ئەگەرەکانی گریمانەیی ڕاڤەکردنی زیاتر دەکەن. دوالیزمی دژیەکی کرداری و ناویی پێکهێنەری جیهانی دیالێکتیکی نێوان واقیع و خودە، کە ململانێیە لە ژیاندا. زۆری دوالیزمی دژیەك لە دەقێکی ئەدەبیدا بەڵگەیە لەسەر گونجان و کرانەوەی لە چەندین جەمسەرەوە بە جۆرێك، کە لەوانەیە لە دەقێکی ئەدەبیدا کۆمەڵێ نەسەقی دژیەك بەرچاومان بکەوێت، کە بزواوی دەداتە دەقە ئەدەبیەکە، ئەم نەسەقە دژیەکانە پەیوەستن بەو گەردوونەوە، کە وێنای دەکەین هەربۆیە دوالیزمی دژیەك تایبەتمەندی جوانی دەداتە دەق"[١٦١].

سەبارەت بە ئەدەبی هاوچەرخی فارسیش، زۆرن ئەوانەی، کە گرنگی و بایەخیان بە (دوالیزمی دژیەك) داوە وەك (شفیعی کدکنی)، کە لای فارسەکان بە داهێنەری (پارادوکسی وێنەیی) دادەنرێت[١٦٢].

هەروەها (سیروس شمیسا)، کە لە کتێبەکەیدا (نگاهی تازە بە بدیع) تێڕوانینی هاوچەرخانەی بۆ دوالیزمی دژیەك خستووەتەڕوو[١٦٣]. جگە لەوانیش

---

[١٦١] سەرچاوەی پێشوو، ل٦٣.

[١٦٢] شفیعی کدکنی، بڕوانە هەر دوو کتێبەکانی صور خیال در شعر فارسی، مرکز پخش، کتاب گزیدە، چاپ چهارم، ١٣٩٠ هـ.ش. و موسیقی شعر، مرکز پخش، کتاب گزیدە، چاپ دوازدهم، ١٣٨٩ هـ.ش.

[١٦٣] سیروس شمیسا، نگاهی تازە بە بدیع، ل١٠٩.

(د.مهدی محبتی) لە کتێبەکەیدا (بدیع نو) تێڕوانینێکی نوێی بۆ هەموو هونەرەکانی (جوانکاری) پێشکەش کردووە[١٦٤].

ئەوەی لێرەدا زیاتر جێگای سەرنج و بایەخە، دوالیزمی دژیەکە لە ئەدەبی مۆدێرنی ڕۆژئاواییدا، چونکە ئەگەرچی (دوالیزمی) دژیەك ڕەگوڕیشە و بناغەی هەیە لە ڕۆژهەلات و بەتایبەتی لە ڕەوانبێژیدا، بەلام لە چەرخی نوێدا دوالیزمی دژیەك وەك ستایلی دەربڕین و بابەتی ڕەخنەی ئەدەبی، لە ڕۆژئاواوە بۆمان دێتەوە و دەبێتە بنەما و بناغەی چەندین ڕێچکە و میتۆدی ئەدەبی و ڕەخنەیی و مەودایەکی نوێش بۆ ئیستاتیکای دەربڕین دێنێتە کایەوە. لێرەدا وەکو بەلگە و هێندەی مەودا و زانیاریمان هەبێت سەرەتاکانی گرنگی و بایەخ بە دوالیزمی دژیەك لە ئەدەبی هاوچەرخی ڕۆژئاوادا دەخەینەڕوو، یاخود بەواتایەکی تر هەولدەدەین بابەتی دوالیزمی دژیەك لە تایبەتمەندییەکانی هەندێ قوتابخانە و نووسەری بواری فیکری ئەدەبدا، بدۆزینەوە:

### ١-٤-٤-أ/ دی سۆسێر:

فردینان دی سۆسێر (١٨٥٧-١٩١٣ز)، زانایەکی بواری زمانەوانییە و دواتر بۆچوونەکانی بوونە بنەمایەکی پتەو بۆ قوتابخانەی بونیادگەری. سۆسێر لە ناودارترین زانایانی هاوچەرخە لە بواری زمانەوانیدا.

دەگوترێت زانستی زمان لە (دی سۆسێر)ەوە دەستپێدەکات. ئەوەی لێرەدا و بۆ لێکۆلینەوەی ئێمە جێگای بایەخە، ئەوەیە، کە سۆسێر تێڕوانینێکی نوێی

---

[١٦٤] مهدی محبتی، بدیع نو هنر ساخت و آرایش سخن، انتشارات سخن، چاپ دوم، ١٣٨٦ هـ.ش. ل١٠٦.

بۆ زانستی زمان هێنایە کایەوە. بەگشتی (دوالیزمی دژیەك) ڕەوشی چۆنیەتی لێکۆڵینەوەی سۆسێرە لە زمان. سەرەتا لە پێناسەی زماندا پێیوایە کە: "سیستمێکی هێماییە، هێماکانی یەکتری تەواو دەکەن و ڕووندەکەنەوە و بەها لە یەکتری وەردەگرن"، هێمان، واتە پەیوەندی نێوان (هێما) و (واتا)کەی ڕێکەوتنی کۆمەڵایەتیە، یەکتری تەواو دەکەن واتە واتا و ڕۆڵ بۆ یەکتری تەواودەکەن، لە کۆتاییدا، کە دەڵێ بەها لە یەکتری وەردەگرن، واتە کاتێك دەڵێین (چاك) بۆ ئەوەیە جیای بکەینەوە لە (خراپ)، یاخود (ڕەش) بۆ ئەوەیە جیای بکەینەوە لە (سپی) و ڕەنگەکانی دیکە، کە ئەمەش هەمان دوالیزمی دژیەکە، واتە هێنانی وشەیەك بۆ جیاکردنەوەیەتی لە بەرامبەرەکەی، یاخود دژەکەی.

بنەماکانی تێڕوانینی سۆسێر بۆ زمان، کە لەهەمانکاتدا (دوالیزمی دژیەك)یشن بریتین لە:

١. زمان و ئاخاوتن: سۆسێر پێیوایە، کە بۆ لێکۆڵینەوە پێویستە پشت بە زمانی (ئاخاوتن) ببەستین نەك زمانی نووسراو. ڕایوایە، کە ئاخاوتن، یاخود زمانی ئاخاوتن تایبەت نییە بە کەسێك، بەڵکو زمانی کۆمەڵگایە، بەڵام زمانی نووسین، ئەزموون و تایبەتمەندی کەسێکە و زمانی پەیوەندیکردنی نێو کۆمەڵگا نییە بەگشتی.

٢. سۆسێر دوو ئاستی بۆ لێکۆڵینەوە دانا (کە ئەمیش جۆرێکی تری دوالیزمە)، یاخود دوو جۆر پەیوەندی دیاریکرد، کە ئەوانیش (پارادیگم) پەیوەندی واتایی‌و (سینتاگم) پەیوەندی ڕێزمانی بوو.

٣. سۆسێر دوو جۆریشی بۆ لێکۆڵینەوە دیاریکرد، کە ئەوانیش (سینکرونی) واتە لێکۆڵینەوە لە ئێستای زمان و (دیاکرونی) لێکۆڵینەوە لە قۆناغێکی مێژوویی زمان.

٤. سۆسێر پێیوایە، کە زمان لە دوو جۆر پەیوەندی پێکدێت، یەکەمیان پەیوەندیەکی (جدول)، یاخود (اقتران)ی، کە پەیوەندییەکە جۆرێکە، کە لە دەرەوەی سیستمی زمانەوانیە. دووەمیان، پەیوەندی ڕێکخستن، یاخود (ترکیب)ی، کە دەکەوێتە ناوەوەی ئاخاوتن و وشەکان دەکەونە ناو جۆرە پەیوەندییەکەوە، کە جیاوازە لە پەیوەندی یەکەم[١٦٥].

بەگشتی ئەم تێڕوانینانەی سۆسێر و بەکارهێنانی دوالیزمی دژیەك وەك ڕێچکەیەکی لێکۆڵینەوە چەندین قوتابخانەی ئەدەبی بەدوای خۆیدا هێنا، لەوانە:

### ١-٤-٤-ب/ فۆرمالیستەکان:

فۆرمالیستە ڕووسەکان لەنێوان ساڵانی (١٩١٥-١٩٣٠) سەریان هەڵدا، بانگەشەیان دەکرد بۆ بایەخدان بە پەیوەندی ناوخۆیی دەقی ئەدەبی و بڕوایان وابوو، کە ئەدەب سیستمێکی زمانەوانیە و زمانیش تەنها چەند هێمایەکە بۆ ئاماژەکردن بە واقیع نەك ڕەنگدانەوەی واقیع بێت. جگە لەمانەش ئەدەبیات دادەبڕێ لە فیکر و فەلسەفە و کۆمەڵگا[١٦٦].

لەڕاستیدا فۆرمالیستەکان لە کاردانەوەی ڕژێمی کۆمۆنیستیی ڕوسیادا دەیانویست بناغەی ڕێبازێکی سەربەخۆ بۆ ئەدەب دابنێن جیاواز لەوەی، کە دەسەڵات و ڕژێمی کۆمۆنیستیی دەیویست، کە جەخت کردنەوە بوو لەسەر

---

[١٦٥] کمال بشير، التفكير اللغوي بين القديم والجديد، دار غريب، القاهرة، ٢٠٠٥، بڕوانە ل٤٥.

[١٦٦] إيناس محمود عبدالله، نقد النقد، عالم الكتب الحديث، الأردن، الطبعة الأولى، ٢٠١٢م. ل٢٨.

ناوەڕۆك و بابەت، كە بەو پێیە ئەدەب تەنها دەربڕی ئەدەبیاتی ماركسی بوو و هیچ شتێك بەناوی فۆرم و ڕووخساری ئەدەبی جێگای بایەخ نەبوو[١٦٧].

یەكێك لەو فەیلەسووف و زانایانەی، كە جاروبار بە هەڵە بە فۆرمالیست ناوی دەركردووە، چەردەیەك بیروبۆچوونی تازەی هێنایە ئارا (میخائیل باختین)ە، باختین لەوەدا هاوڕا بوو لەگەڵ سۆسێر، كە (زمان) بنەمای گشتی واتا و ڕەگەزی بنەڕەتی ناسینەوەی واتایە، بەڵام بەپێچەوانەی سۆسێرەوە زمانی بە دەرهاویشتەیەكی كۆمەڵایەتی و مێژوویی دەزانی. بەڕای باختین زمان بەهیچ جۆرێك جێگیر و چەسپاو نییە، بەڵكو بەردەوام لە گۆڕاندایە[١٦٨].

(لوشینیف)، كە هاوڕێبازی (باختین)ە دەڵێ: "زاراوە و وشەكان چەند نیشانەیەكی كۆمەڵایەتین، كە دەتوانن لەنێوان چینەكانی كۆمەڵگا و قۆناغە جیاوازەكانی مێژوودا، واتای جیاواز و چەمكی جیاواز هەڵبژێرن"[١٦٩].

"هەر گوتەیەك، كە دێتە سەرزمان بەهەموو بوونی خۆی وەڵامی قسەكەرێكی نەبینراو دەداتەوە و كاردانەوە دەنوێنێت و ئاماژە بە شتێك دەكات لە دەرەوەی خۆی و زیاتر لە سنوورەكانی خۆی"[١٧٠].

---

[١٦٧] یوسف عوض، نظریـة النقـد الأدب الحـدیث، ط١، الأمـین – القـاهرة، ١٤١٤ هــ.ق. بڕوانـە ل١٦.

[١٦٨] بابك أحمدی، ساختار و هرمنوتیك، گام نو، چاپ سوم، ١٣٨٣ هـ.ش. بڕوانە ل٢٤.

[١٦٩] ویستر، راجر. پیش درآمدی بر مطالعه نظریه ادبی، ترجمة: الهه دهنوی، روزگار. چـاپ اول، ١٣٨٢ هـ.ش. ل٥٨.

[١٧٠] رامان سلدن، ویدسـون پـیتر. راهنمـایی نظریهـای ادبـی معاصـر، ترجمـة: عبـاس مخـبر، چاپخانە طرح نو، چاپ سوم، ١٣٨٤ هـ.ش. ل٢٨.

باختین باوەڕی وابوو، کە زمان زادەی دوولایەنە، یاخود چەند جەمسەریە، ئاماژە بەوە دەکات، کە تایبەتمەندی گفتوگۆی ناو زمان لە زمانی ئەدەبیدا بەتایبەتی لە (ڕۆمان)دا ئاشکراترە و دەتوانێت گریمانە جیاوازەکانی نێوخۆی بە شێوازی جۆراوجۆر ڕێکبخات. واتە باختین دۆزەرەوەی چەمکی (فرە دەنگیە) لە ڕۆماندا[١٧١].

لێرەدا گرنگی و بایەخی (دوالیزمی دژیەك) لای فۆرمالیستەکان جگە لەوەی وەك کەرەسەیەکی زمانەوانی و دەربڕین دەردەکەوێت، کە (دوالیزمی دژیەك) بەشێکە لە پێکهاتەی دەرەکی (دەق) و بەرهەمی ئەدەبی لەهەمانکاتدا لای باختین بەتایبەتی لەو گۆشەنیگایانەیدا، کە دەربارەی ڕۆمانەکانی ف.م.دیستویێڤسکی دەریبڕیوون ململانێی دژەکان بەگشتی سروشتی ئاسایی خۆی وەردەگرێت.

### ١-٤-٤-ج/ بونیادگەرایی، یاخود بونیادگەری (ستروکتورالیزم):

وشەی بونیادگەری لە (بونیاد) و پێکهاتەی بنەڕەتییەوە هاتووە، بەجۆرێك، کە بونیادگەراکان ڕایان وایە: هەموو دیاردەیەك، مرۆڤایەتی بێت، یاخود ئەدەبی، بونیادێکی هەیە، یاخود بونیادێکی پێکهێناوە. بۆ لێکۆڵینەوە لەم بونیادە پێویستە شیبکەینەوە بۆ ئەو پێکهێنەرانەی، یاخود ڕەگەزانەی، کە ئەو بونیادەیان پێکهێناوە بەبێ گەڕانەوە، یاخود بایەخدان بە هۆکارە دەرەکییەکان[١٧٢].

---

[١٧١] ریچارد هارلند، درآمدی تاریخی بر نظریه ادبی – از افلاطون تا بارت. ترجمة: علی معصومی و شاپور جوکش، چشمه، چاپ دوم، ١٣٨٥ هـ.ش. بڕوانە ل٢٥.

[١٧٢] ليونارد جاكسون، بؤس البنيوية، ترجمة: ثائر ديب، دار الفرقد، الطبعة الثانية، ٢٠٠٨م. بڕوانە ل١٢٦.

بونیادگەری ئەگەرچی لە بواری زانستی زمان و ڕەخنەی ئەدەبیدا زۆر لەبارەیەوە دەگوترێت، بەڵام بەگشتی ڕێبازێکی فیکریە و هۆکارێکی شیکارییە، کە بونیادنراوە لەسەر فیکری گشتگیر، یاخود کۆیەکی ڕێکخراو. بونیادگەری گرنگی بە هەموو کایەکانی مەعریفەی مرۆڤایەتی داوە[١٧٣].

لە کایەی زمانەوانیدا (سۆسێر) بە پێشڕەوی بونیادگەری زمانەوانی دادەنرێت. لە کایەی کۆمەڵناسیدا (کلود لیڤی شتراوس) بڕوای وایە، کە کۆی ئەو لێکۆڵینەوانەی، کە پەیوەستە بە کۆمەڵگەوە، هەرچەندە جیاوازی هەبێت، دەرئەنجام سەردەکێشێت بۆ چەند بونیادێك. بەجۆرێك ئەو پێکهاتانەی نێو کۆمەڵ وا گریمانە دەکات، یاخود بەجۆرێك خۆی دەسەپێنێت، کە کۆیەکی پێکەوە گونجاوە لە خودی خۆیدا، ئەوەش بەهۆی ئەو پێوەرە سەپێنراوانەوەیە، کە کۆمەڵگا دەیسەپێنێت.

لە کایەی زانستی دەروونناسیدا (میشیل فۆکۆ) و (جان لاکان) هەر دووکیان دژ بە ڕەوتی تاکگەرایی (الفردیة) وەستانەوە لە بواری (الأحساس) و (الأدراك)دا[١٧٤].

لە تێڕوانینی بونیادگەراکانەوە، لێکۆڵینەوە لە هەر دیاردەیەك و ڕاڤەکردنی، واتە پێویستە لێکۆڵەر مامەڵە لەگەڵ ڕەگەزە پێکهێنەر و بونیادییەکانی ئەو بابەتە بکات و ڕێگە نەدات فیکر و بیروباوەڕی خۆی، یاخود هۆکاری دەرەکی دزە بکاتە ناو لێکۆڵینەوەکەی لەسەر بونیادی دەقێك. وەك

---

[١٧٣] عبدالقادر حمه أمین، ئەدەب و ڕێبازەکانی ئەورووپی – کوردی، سلێمانی ٢٠١١ز. بڕوانە ل١٧٩.

[١٧٤] ریتشرد هارلند، مافوق البنیویة، ترجمة: حسن حمامة، دار الحوار، سوریة، الطبعة الثانیة، ٢٠٠٩م. بڕوانە ل٢٠-٧٢.

بونیادگەراکان دەڵێن خاڵی بنەڕەتی خودی بونیادە و تەنها ئەویش بەسەو پێویست بە چوونە دەرەوەی چوارچێوەی بونیاد ناکات[١٧٥]. بەڕای بونیادگەراکان، هەموو دیاردەیەك بونیادێك بۆخۆی پێکدەهێنێت، پیتە دەنگییەکان بونیادن، جێناوەکان بونیادن، بەکارهێنانی کارەکان و ڕێکخستنی هونەرەکانی ڕەوانبێژی و..هتد هەموو ئەمانە بونیادن[١٧٦].

لە بواری ڕەخنەی ئەدەبیدا، ڕەخنەی بونیادگەری، ڕێچکەیەکی تایبەتی هەیە، کە کورتەکەی ئەمەیە: بەگشتی کاردانەوە و بڕیارە ویژدانییەکان، یاخود دەروونییەکان ناتوانێت بگاتە ئەو لێکۆڵینەوە و دەرئەنجامەی، کە لێکۆڵینەوە لە ڕەگەزە سەرەکییەکانی بونیادی بەرهەمێك، پێیدەگات. بۆیە هەر بەرهەمێك پێویستە لەناو خودی خۆیدا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین، لە ناوەڕۆك و (سیاق) و پەیوەندی بەش و ئەندامەکانی، ئەمەش کارێکی زۆر پێویستە، چونکە پێویستە بگەینە ئەو ڕووکارە هونەرییە، کە سەربەخۆیە لە هەموو بوونێکی، یاخود هۆکارێکی دەرەکی و دەوروبەر.

بەگشتی بونیادگەری باوەڕی بە (ظاهر) هەیە وەك بونیادێك، دابڕاو لە هۆکار و پاساوەکانی دەوروبەری و هەوڵی شیکاری و ڕاڤەکردنی دەدات بۆ پێکهاتە و ڕەگەزە سەرەتاییەکان لەپێناو تێگەیشتن و پەیپێبردنی. هەر لێرەوەیە، کە ڕەخنەگرانی بڕوایان وایە، کە حوکمەکانی شکڵی و ڕووکەشن[١٧٧].

---

[١٧٥] ریتشرد هارلند، مافوق البنیویة. هەمان لاپەڕە.

[١٧٦] محمد عزام، النص الغائب، عالم الکتب الحدیث – الأردن، ٢٠١١م. بڕوانە ل١٨.

[١٧٧] رولان بارت، نقد و حقیقت، ترجمة: شیرین دخت دقیقیان، نشر مرکز – تهران، چاپ پنجم، ١٣٩٠ هـ.ش. بڕوانە ل٧٣.

لیڤی شتراوس بڕوای وایە، کە دەگونجێت ئەم ڕێباز و نەسەقە لە هەموو جۆرە لێکۆڵینەوەیەکدا پەیڕەو بکرێت[١٧٨].

یەکێك لە دامەزرێنەرانی ئەم قوتابخانەیە (رومان جاکبسون)،ە کە ئەویش لە بواری زمانەوانیدا وێنەیەکی تەواوی لە پەیوەندی ئاخاوتن پێشکەش کرد و دابەشیکرد بۆ (گەیەنەر) و (وەرگر).

لە دەرئەنجامی بەیەکگەیشتن و هاوکاری و پێکەوە کارکردنی (شتراوس) و (جاکبسون)، کە پێکەوە شیکاریەکیان کرد بۆ دەقی (پشیلەکان)ی (بۆدلێر)، دەتوانین بڵێین بونیادگەری بەڕەسمی لەوێوە لەدایکبوو[١٧٩].

سەبارەت بە لێکۆڵەری (سیمیولۆجی) ڕوسی (لۆتمان– Lotman) ڕایوایە، کە دیاریکردنی (دەق) پشت دەبەستێت بە پێکهاتە (تەعبیری) و (بونیادی) و دیاریکراوەکانی لە دەربڕیندا، دەق لە چوارچێوەی پەیوەندیەکی سنووردار دایە، لەو بونیادانەی لە دەرەوەی دەق دانراوە جیاوازە. ئەگەر دەق ئەدەبی بوو ئەوا دەربڕین سەرەتا لەڕێگەی پەیوەندییە سروشتییەکانی زمانەوە دەبێت[١٨٠].

شایانی باسە یوری لۆتمان پێیوابوو، نابێ ڕێگا لەو کۆدانەی دەری دەقیش بگرین، کە خزمەتی توێژینەوەکە دەکات، هەر ئەم ڕایەش دواتر دوا بونیادگەرەکان ئاوڕیان لێدایەوە.

---

[١٧٨] لیونارد جاکسون، بؤس البنیویة، الأدب والنظریة البنیویة، ترجمة: ثائر دیب، بڕوانە ل١٢٦.

[١٧٩] سەرچاوەی پێشوو.

[١٨٠] محمد عزام، النص الغائب، ل٦٤.

### ١-٤-٤-د/ ڕۆلان بارت و دەق:

لەسەر پێناسە و سروشتی(دەق) ڕای خۆی هەیە. ڕای بارت بە کورتی بەم جۆرەیە. "دەق دابڕاوە لە داهێنەر و سیاقە مێژوویی و کۆمەڵایەتیەکەی. دەق ڕووکاری دەرەکی بەرهەمی ئەدەبیە و چنراوێکە لە وشەی جیاواز و پێکدادرا و و ڕێکخراو بەجۆرێك واتایەکی بەهێز و قووڵمان دەداتێ. (دەق) چنراوێکە لە هونەری ڕەوانبێژیی دەربڕین بەجۆرێك، کە ڕەوانبێژی ئاخاوتن و زمان دەکاتە (چەك). ڕەوانبێژی بۆململانێ کۆمەڵێك کەرەسە دەخاتە بەردەست بەکاربەرەکەی. لێرەوەیە، ڕەوانبێژی تەنها ئیستاتیکای دەربڕین نییە، بەڵکوو بەگشتی فەلسەفەی بیرکردنەوە و ڕۆشنبیری کۆمەڵگا و شێوازی وتووێژ و گفتوگۆیە.."[١٨١]، بەلآم دواتر ئەمیش ئەم ستراتیژەی گۆڕی و بایەخی دەدا بەو دەوروبەرە کولتوورییەی، کە دەقەکەی تێدا هاتۆتە بەرهەم.

لە کورتەی ئەم بابەتەدا گەیشتینە ئەو دەرئەنجامەی، کە بونیادگەری لە تێڕوانینی بۆ دەق و ڕێچکەی ڕەخنەگری خۆیدا (ظاهر) بونیادی دەرەکی دەق دەکاتە پێوەر و لەو پێناوەدا لەسەر بنەمای پەیوەندی کەرەسەکانی ناو دەقێك شیکاری بۆ دەقەکە دەکات. بێگومان (دوالیزمی دژیەك) لە گرنگترین ئەو چنراوانەیە لەناو پێکهاتەی دەقدا و دەتوانێت بنەمایەکی زۆر گونجاو بێت

---

[١٨١] فانسان جوف، الأدب عند رولان بارت، ترجمة: عبدالرحمن بوعلي، دارالحوار، الطبعة الأولى، ٢٠٠٤م. ل٤٧. هەروەها بڕوانە کتێبی (رولان بارت. قراءة جديدة للبلاغة القديمة، ترجمة: عمر أوكان، رؤية للنشر والتوزيع، ٢٠١١م).

بۆ ئەو دەرئەنجامەی، کە شیکار و ڕاڤەکاری بونیادگەر، یاخود ڕەخنەگری بونیادگەر دەیەوێت پێی بگات.

## ١-٤-٥/ دوالیزمی دژیەك و ئەدەبیاتی عیرفان و تەسەوف:

ئەدەبیاتی عیرفانی، یاخود سۆفیانە، بەگشتی بەشێکی زۆر گەورەیە لەو سامانە ئەدەبی و فیکری و ڕۆشنبیریەی، کە عارفانی ئەم ناوچەیە بەرهەمیان هێناوە و پانتاییەکی فراوانی لە هۆنراوەی کلاسیکی گەلانی ئەم ناوچەیە بۆخۆی بردووە، تەنانەت لای نەتەوەیەکی وەکو ئێمە (کورد)، عیرفان و ئەدەبی عیرفانی دەستپێك و سەرچاوەی ئەدەبی کلاسیکیمانە.

ئەم ئەدەبیاتە واتە ئەدەبیاتی عیرفان لەمێژووی ئەدەبیاتی ئیسلامیدا (کە خاڵی هاوبەشی ئەدەبیاتی نێوان گەلانی ئەم ناوچەیەیە، بەڵام هەریەکەیان بە تایبەتمەندی خۆی). سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕێچکە فیکریەی، کە لە سەرەتاکانی سەدەی دووەمی کۆچییەوە بەتایبەتی پاش خەلافەتی (عوسمانی کوڕی عەفان) سەریهەڵدا. کەسانێك نەیار و ناڕازیبوون بەو شێوە ژیان و ڕەفتارانەی، کە کەسانی خاوەن دەسەڵات ئەنجامیان دەدا لە دنیاویستی و لاوازی باوەڕیان، هەربۆیە ئەمان دوورکەوتنەوە لە دەسەڵات و کەوتنە زەمی دونیا و پێویستی پەروەردەی دەروون و عیشق بۆ خوا و خۆیەکلاکردنەوە بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو و گرنگیدان بە ناخ و پاکردنەوەی (نەفس). سەرئەنجام ڕێنمایی و گوتەکانی ئەم ڕێچکەیە لە مێژووی ئیسلامیدا بووە دوو بەش، بەشێکیان کەوتنەوە ئامۆژگاری و ڕێنمایی خەڵکی، کە دەتوانین بەرهەمەکانیان بە (ئەدەبی فێرکاری) ناوبەرین. بەشێکی تریان کەوتنە بابەتی (جذبة) و (عشق)، کە دەتوانین بە (ئەدەبی عاشقانە) ناوزەدی بکەین، کە هەموو

ئەمانە دواتر میراتێکی گەورەی ئەدەبیان بۆ بەجێهێشتین، کە بەگشتی بە (ئەدەبی عارفانە) ناسراوە و لەو ڕێچکە فیکرییەوە دەسپێك و ئیلهامی وەرگرتووە[١٨٢].

لەم رووەوە نووسەر و بیریاری گەورەی ڕووسی (برتلس)، لە کتێبەکەیدا (تصوف و ادبیات تصوف) بەشێکی تایبەتکردوە بەو بابەتە، کە سۆفی و عارفەکانی سەرەتای مێژووی ئیسلامی کەوتنە ئەدەبیات و بەتایبەتی شیعر نووسین. لەمبارەیەوە ڕایوایە، کە سۆفییەکان زۆر گرنگیان دەدا بە (حاڵ) و بە دابەزینی ڕەحمەتی خوایان دەزانی، بۆیە بەردەوام بەدوای ئەو هۆیانەوە بوون، کە دەیانتوانی (حاڵ) لە سۆفیدا بەدیبهێنن. دواتر (سماع)یان داهێنا، سەرەتا دەنگ و ئاوازی خۆشبوو دواتر سەریکێشا بۆ میوزیك و دەرئەنجام ئەم میوزیك و دەنگە خۆشە پێویستی بە وشە و دەستەواژەی پڕ لە جوانکاری (بدیع) هەبوو، بەڵام پێویستبوو لە دەربڕیندا وشە و زاراوە و دەستەواژەی ئەوتۆ هەڵبژێرن، کە بۆ ئاستی گشتی گوێگران گونجاو بێت و لێی تێبگەن. کەرەسە زمانییەکان ئاوازدار بن بەجۆرێك جوڵە و تاسە لای گوێگر دروستبکات. سەرئەنجام لەبەرامبەر ئەو شیعرانەی دەربار و چینی فەرمانڕەوادا، کە بەردەوام سنعەتکاری تێدا دەکرا بە تایبەتمەندی خۆی، هۆنراوەی لیریکیی (شیعری غەزەل) سۆفیانە سەریهەڵدا، کە جگە لەوەی ساکار و سروشتی و پڕ لە پەند و نزیکبوو لە تێگەیشتنی خەڵکییەوە بەگشتی، هاوکات هەموو هەوڵ و ئامانجی ئەم جۆرە شیعرە وروژاندنی هەست و سۆز بوو. هەست و سۆزێك، کە دەرئەنجام (سماع) (حاڵ) دروستبکات.

---

[١٨٢] عبدالحسین زرین کوب، ارزش میراث و صوفیه، انتشارات سخن، چاپ چهارم، ١٣٨٩هـ.ش. بڕوانە ل١٤٠–١٤٤.

ئەم چۆنیەتی دەربڕینە بەردەوام بوو تا کوشتنی (حەلاج)، پاش ئەوە شیعر و ئەدەبیاتی سۆفی و عارفەکان زمانێکی شاراوە و ئاڵۆزی هەڵبژارد بەجۆرێك چەندین هونەری دەربڕینی هێنایە کایەوە، کە لەیەك کاتدا جگە لەوەی جوانکاری بوو لە دەربڕیندا، بەهەمانشێوە ئەو جۆرە زمانەی شیعر بووە زمانێکی شاراوەی بە جورئەت، کە هەموو شتێکی لێوە بگوترێ و ترسیش نەبێت لە سزادان، چونکە دەربڕینەکان بەجۆرێکبوون ڕاڤەی جیاوازیان هەڵدەگرت. ئەگەر لای شاعیران بەگشتی زمانی خوازە بەکار هاتبێت بۆ دەربازبوون لە کەمی و هەژاری لە کەرەسەی دەربڕیندا ئەوا لای سۆفی و عارفەکان جگە لەوە، وەك نیشانەیەك، یاخود سومبولێك بەکارهاتووە بۆ دەربڕینی ئەو چەمکە عیرفانی و فەلسەفیانەی، کە ویستوویانە بە توێکڵداری و نهێنی و ناڕوونی گوزارشتی لێ بکەن.

زمانی خوازە لای عارفەکان زۆرجار بەجۆرێکە، لەکاتی هێنانی چەمکێکدا بە خوازەیی چەمکەکەی بەرامبەریشی وەکو دوالیزمێکی دژیەك. هێنراوە بۆنموونە (خوف و رجاء)، (بسط و قبض)، (محو و سکر)، (زوڵف و ڕوو)، (خۆر و مانگ)...هتد[١٨٣].

لەو ڕوانگەوە، بابەتی (ئەدەبیاتی عیرفان) نەك پەیوەندی ڕاستەوخۆ، خودی بابەتەکەی ئێمەیە، بە پێویستی دەزانم لەسەر دوو ئاست، یاخود ڕەهەند باسی (ئەدەبیاتی عیرفان) بکەم:

---

[١٨٢] یوگنی ادوارد ویچ برتلس، تصوف و ادبیات تصوف، ترجمە سیروس ایزدی، مؤسسە انتشارات امیر کبیر – تهران، ١٣٨٧ هـ.ش. بڕوانە لاپەڕەکانی ٥٠–٧٨، هەروەها ١٤٦–١٥٧.

**یەکەمیان، زمانی دەربڕین، واتە ئەو زمانەی، کە ئەدەبیاتی عیرفانی پێ گوزارشت کراوە:**

یەکێك لە تایبەتمەندییە گەورەکانی ئەزموونی عیرفانی، ئەوەیە، کە دەربڕین و گوزارشتکردن لەو حاڵەتە ئەگەر ئەستەم نەبێت، ئاسان نییە، بەجۆرێك، کە محەمەد غەزالی دەڵێت: "کەسێك، کە ئەم ڕێگا و دەرگایەی بۆ بکرێتەوە، هێندە کاری گەورە دەبینێت، کە ناتوانێت بکاتە سنووری وەسفکردنی"[١٨٤].

بەگشتی دەتوانین لە دەربڕینی عیرفانیدا ئەم هۆکارانە وەك ڕێگر باس بکەین:

ڕێگری بابەت: ئەزموونی عارفانە، بابەتی دووبارەکردنەوە و ئەزموونکردن نییە، بەجۆرێك بتوانرێت وەك هاوکێشەیەکی جیهانی ماددی و هەستەکان ئەزموون بکرێت. دەتوانین ئەم ڕێگر و هۆکارەش بە سەرەکی بزانین، چونکە (دەربڕین) کاری عەقڵە و عەقڵیش تەنها لە توانایدا هەیە چەمکە لێکدراوەکان دابەشبکات و پۆلێنیان بکات و هەندێکجاریش دووبارە لێکیان دەداتەوە. بەواتایەکی تر، بابەتێك، کە هێشتا عەقڵ دەستەوسانە لە قبوڵکردنی ئیتر چۆن زمان گوزارشتی لێ بکات.

ڕێگری زمان: زەمینەی ئەزموونی عیرفان، زەمینەی ژیانی ڕۆژانە و زمانی ئاخاوتنی خەڵکی ئاسایی نییە، کە ڕۆژانە لەڕێی زمانی ئاخاوتنەوە وەك گوێگر و قسەکەر، ئەرك دەبینن. زمانی ئاخاوتنی ئاسایی ڕۆژانە خۆی کورتی هێناوە

---

[١٨٤] احمد غزالی، دو رسالەی عرفان در عشق، به کوشش ایرج افشار، بی چا – تهران، ١٣٥٩ هـ.ش.ل٥٤.

لەوەی مەبەست و واتاکانی ڕۆژانە بخاتە قاڵبی گوتن و ئاخاوتنەوە، ئیتر چۆن دەتوانێت گوزارشت لە واتا گەردوونییەکانی عیرفان بکات؟!

ج. ڕێگری خودی (بکەر): خودی بکەر واتە (عارف)، لێرەدا ڕووبەڕووی حاڵەتێکی دەروونی دژوار دەبێتەوە، کە تێپەڕاندنی ئاسان نییە. ئەویش ئەوەیە، کە کەسی عارف پاش گەیشتن بە پلەیەکی تایبەت، دەیبینێت تووشی شۆك دەبێت و لە حاڵەتی سۆزداریدا نقوم دەبێت بەجۆرێك، کە خۆی لەیاد دەکات، دیارە دەربڕینیش بەشێکە لە خودی عارف، بۆیە توانای گوزارشت و دەربڕینی نامێنێ.

د. ڕێگری گوێگر: زۆرجار لەم کاری دەربڕین و گوێگرتن و لەیەکتر حاڵی بوونەدا کێشەی ئەوە دروست دەبێت، کە گوێگر ناتوانێت لە ئەزموونی عیرفانیانە حاڵی ببێت، چونکە هەروەك وەسفکردنی ڕەنگ و چۆنییەتی ڕەنگەکانە بۆ کەسێکی نابینا و کوێر.

ئەگەرچی ئەو چوار خاڵەی سەرەوە لە جۆرەکانی ئاستەنگ و ڕێگربوون لەبەردەم دەربڕینی عیرفانیدا، بەڵام ڕاستیەکی بەرچاومان هەیە، کە ئەویش بوونی بەرهەمێکی زۆری ئەدەبی عیرفانیە[١٨٥].

**(شطح) بزرکاندن، لە تایبەتمەندییەکانی زمانی دەربڕینی عارفانە:**

بزرکاندن گرنگترین وێستگە و خاڵی پێکدادانی نێوان (عیرفان) و (لۆژیك)ە، ئەم بابەتە لە زۆر ڕوانگەوە بابەتی قسە لەسەرکردنە، بەڵام لەڕوانگەی

---

[١٨٥] علیرضا فولادی، زبان عرفان، انتشارات سخن باهمکاری انتشارات فراگفت، ١٣٨٩هـ.ش. بڕوانە ل٧٨.

لۆژیکەوە و لە دیدێکی ڕەخنەی لۆژیکییانەوە، جۆرێکە لە کۆبوونەوەی دژەکان، یاخود دوالیزمە دژیەکەکان، واتە گونجاندنی دوو نەگونجاو. جگە لە بزرکاندن هەموو جۆرەکانی دیکەی دوالیزمی دژیەك و بەگشتی (دژەکان) لە زمانی عیرفاندا بوونی هەیە، لێرەدا پرسیاری بنەڕەتی ئەمەیە، کە بۆچی (دوالیزمی دژیەك) لە زمانی عیرفاندا بوونی هەیە؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا سێ تیۆری هەیە:

١. تیۆری دژیەکبوونی ئەزموون: لەسەر بنەمای ئەم تیۆریە، دژیەکبوون لە بزرکاندنی عارفەکاندا، پەیوەستە بە بوونی دژیەکی لە ئەزموونی عیرفانیدا. ئەم تیۆریە ڕای (استیلس)ە، کە بڕوای وایە ئەزموونی عارفانە هیچ نییە جگە لە دژیەکییەکی بێ مانا. هەڵەی ئەم تیۆریە لەوەدایە تەنها لە ڕوانگە لۆژیکیەکەوە سەیری دەکات.

٢. تیۆری هەڵەی دەربڕین: ئەم تیۆرییە ڕایوایە، کە (دژیەکبوون) لە دەربڕینی عیرفانیدا، دەرئەنجامی هەڵەیەکە، کە عارف لە وەسفکردنی ئەزموونە عیرفانیەکەیدا دەیکات، واتە بەبێ هیچ مەبەستێك عارف دەکەوێتە هەڵەوە لە وەسفکردنی ئەوەی، کە بینیویەتی.

٣. تیۆری هەڵگرتنی (دژیەکبوون): بەپێی ئەم تیۆرییە بزرکاندن و هەرکام لە (دژیەك)ەکانی دیکە لە دەربڕینی عیرفانیانەدا ئەگەر و گریمانەی ئەوەی تێدایە، کە دژیەکبوونی لۆژیکییانەی لەسەر هەڵگرتبێت، چونکە بوونی دژیەك و دوالیزمی دژیەك لە دەربڕینی عیرفانیانەدا تەنها وەك هێنانی (هاو واتا) وایە بە مەبەستی زیاتر ڕوونکردنەوەی مانای دەربڕین.

٤. تیۆری هونەری ئەدەبی: بەپێی ئەم تیۆرییە بزرکاندن و بەگشتی دژیەك و دوالیزمی دژیەك، جۆرێکە لە هونەری دەربڕین و عارفەکان لەپێناو جوانترکردنی دەربڕینەکانیاندا سودیان لەم هونەرە وەرگرتووە.

بەگشتی ئەو زمانەی، کە عارف لە دەربڕینی عیرفانیدا بەکاریدەهێنێت یا زمانێکی (ڕاڤەکارانە) واتە ئەرکی ڕاڤەکردنی لەئەستۆیە، یاخود ڕوونبێژییە و ئەرکی گەیاندنی واتا و ڕوونکردنەوەی لەئەستۆدایە. مامەڵەکردنی لە جۆری لەگەڵ ئەزموونی عارفانەدا چوار ئاستی زمانی عیرفانی پێکهێناوە، کە یەکەمیان بریتیە لە ئاستی دژیەکی، یاخود بزرکاندنی، کە لەم ئاستەدا ڕووبەڕووی کۆبوونەوەی دژیەك و دوالیزمە دژیەکەکان دەبینەوە. بەشێوەیەکی گشتی (دژیەکی)، یاخود بزرکاندن بە هەموو جۆرەکانیەوە، لایەنە بنەڕەتییەکانی ئاستی دژیەکی دەردەخات لە زمانی عیرفاندا.

سێ ئاستەکەی تریش بریتین لە: (ئاستی سومبولی) و (ئاستی بەڵگەیی، یاخود عەقڵی) و دواجار (ئاستی نەقڵی)، بەڵام ئەوەی پەیوەستە بە بابەتە سەرەکییەکەی ئێمە ئاستی یەکەمە[186].

## دووەمیان، خودی بابەتی ئەدەبیاتی عیرفان:

وەك لە سەرەتای بابەتی (دوالیزمی دژیەك و ئەدەبیاتی عیرفان و تەسەوف)دا ئاماژەمان پێکرد، پەیوەندی و مێژووی نێوان ئەدەبیات و عیرفان (بەتایبەتی لەم ناوچانەدا) هاوتەریب و پەیوەندییەکی تەنگاوتەنگیان هەیە

---

[186] استیس و.ت، عرفان و فلسفه، ترجمه: بهاءالدین خرمشاهی سروش – تهران، چاپ هفتم، ١٣٨٨ هـ.ش. بڕوانە ل٢٦٨.

بەجۆرێك، کە چەندین هاوبەشیان هەیە، لەوانە (زمان) هۆکاری دەربڕینی عیرفان و ئەدەبیشە، جگەلەوە ئەم جۆرە بەرهەمە، واتە (ئەدەب) و (عیرفان) هەردووکیان ڕەنگی وێناکردن دەدەنە ئەزموونی (ذوقي) و چێژی ڕۆحی. وەك (زکی مبارك) لەمبارەوە دەڵێت: "ژیانی سۆفی لەسەر بنەمای (ذوق)ە و هەر ئەمەش بنەمای یەکەمی هونەرە، کەواتە سۆفی کەسێکە، کە (ذوق)ێکی زۆری هەیە و هەرچی دەبینێت و دەخوێنێتەوە و دەبیستێت، بەدوای واتاکانیدا دەگەڕێت، لەم ڕوانگەیەوە سۆفییەکان هۆشیارترین و بەئاگاترین کەسبوون لە شیعر بەگشتی و هۆنراوەی لیریکی بەتایبەتی"[١٨٧].

(شفیعی کدکنی) تەسەوف و عیرفان بە (وەرگرتنێکی هونەریانەی ئایین) دەزانێت[١٨٨].

خاڵێکی تر، کە پەیوەست بە ئەدەب و عیرفانەوە جێگای بایەخ و گرنگییە جیهانی نموونە، یاخود (عالم المثال)ە. بەواتایەکیتر، واتا و مانا ئەدەبییەکانیش هەروەك واتا و مانا عیرفانییەکان، بۆ دەربازبوون لە جیهانی شاراوەیی و نادیاری، پێویستە پەنا بەرنە بەر وێنەی (مثالي)، چونکە تەنها ئەم وێنانە دەتوانێت دەربڕینی واتا دەروونییەکان لەئەستۆ بگرێت. بێگومان لە چوارچێوەی ئەم وێنانەشدا، وێنەکانی، کە وێنەی دژیەك و دوالیزمی دژیەکن ڕوونترین جۆری وێنە پێکدەهێنن لە گوزارشتی ئەدەب و ئەدەبی عیرفانیدا.

---

[١٨٧] محمود زیدان، نظریة المعرفة عند مفکري الاسلام، مؤسسة الرسالة، الطبعة الأولى، ٢٠٠١م. ل٦٨.

[١٨٨] شفیعی کدکنی، دستور زبان عرفانی و عرفان دستور زبان، طرح نو – تهران، چاپ اول، ١٣٧٤ هـ.ش. بڕوانە ل١٠٥.

له كۆتايی ئەم بابەتەدا جەخت لەوە دەكەینەوە كە: "سەرچاوەی دوالیزمی دژیەك و جۆرەكانی پێویستە لە ئەدەبیاتی پڕ لە سیمبولی عیرفاندا بۆی بگەڕێین"[189]. "دوالیزمی دژیەك لە هەموو بابەت و قۆناغەكانی ئەدەبیاتی عیرفانیدا بوونی هەبووە"[190].

بەگشتی لە ئەدەبیاتی عیرفانیدا چەند ئاستێك لە دژیەكی و دوالیزمی دژیەك دەردەكەوێت، كە لەوانە دەتوانین جۆرەكانی (پارادوكس)، (جیاوازی لە هەست ئامێزیدا)، (پێچەوانەیی بوون)، (تجرید)[191]...هتد. هەروەها چەندین ئاستی تری پۆلێنكردن و ئەژماركردنمان هەیە بۆ دوالیزمی دژیەك، كە لە بەشی دواییدا (گونجاوترین جۆریان، یاخود پۆلێنیان بەكاردەبەین بۆ (تطبیق)كردنی لەسەر هەردوو شاعیری عارفمان مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزی)، كە لە بەشی دووەمی ئەم لێكۆڵینەوەیەماندا بە فراوانی و هەمەلایەنە لە (چەمكی دژیەكی) شیعرە لیریكییەكانی هەردوو شاعیر دەكۆڵینەوە.

---

[189] شفیعی كدكنی، دفتر روشنایی، (از میراث عرفان بایزید بسطامی) سخن – تهران، چاپ دوم، ١٣٨٤ هـ.ش. ل٢٥.

[190] سەرچاوەی پێشوو.

[191] علیرضا فولادی، زبان عرفان، بڕوانە ل١٩٥.

## بەشی دووەم

## چۆنیەتیی بەکارهێنان و کەوتنەوەی دوالیزمی دژیەك

## لە هۆنراوەکانی مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزیدا

## ٢/ چۆنیەتیی بەکارهێنان و کەوتنەوەی دوالیزمی دژیەك لە هۆنراوەکانی مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزیدا:

دوالیزمی دژیەك چەمکێکی بنەڕەتی و جەوهەرییە لە زمان و هزر و پەیوەندییە هەمەلایەنەکانی ژیاندا. مرۆڤ بەهۆی دوالیزمی دژەوە دەتوانێت پۆلێنی شت و دیاردەکان بکات و سیستمێکیان بۆ پێکبهێنێ.

ئەم بیرە هەر لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمەوە وەك بەشێکی گرنگی (تیۆریی واتا) بۆ لێکدانەوەی واقیع و بیر هاتۆتە ئارا. لە ڕاستیشدا -وەك پێشتر وترا- بنەوان و دەستپێکی بەکارهاتنی ئەم چەمکە لەگەڵ لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکانی فردیناد دی سۆسێر پەیدابوو. دواتریش زانا و فەیلەسوفە فەرەنسییەکانی وەك کلۆد لیڤی شتراوس و ڕۆلان بارت و... هتد گەشەیان پێدا.

دوالیزمی دژیەك شێوازێکی گونجاو و شایانی توێژینەوەی تێکستە. بوونی دوالیزمی دژ لە تێکستدا، کە لە سەرجەمیشیدا هەیە، هۆیەکی گرنگە بۆ گەشەپێدانی شیکاریی مانا و نوێکردنەوەی کولتوور و تەنانەت یاسا و ڕێساکانی کۆمەڵیش.

ئەوەشی، کە پەیوەندی بە توێژینەوەی ئەدەبییەوە هەبێت، دۆزینەوە و خستنەگەڕی ئەم چەمکە، بۆتە شێوازێکی بنەڕەتیی خوێندنەوە و ستراتیژێکی شیکاریی و لێکۆڵینەوە، بەتایبەتیش یەکێکە لە پرینسیپە هەرە گرنگەکانی بونیادگەریی و دوابونیادگەریی و... هتد.

دوالیزمی دژیەك بە چەشنێکی بەرچاویش لە هۆنراوەکانی ئەم دوو شاعیرە مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزییدا هەیە و هەریەکەیان بە چەندین جۆری دەربڕین و هونەری ڕەوانبێژی و داڕشتنی وێنەی شیعریی بۆ ناوەڕۆکی هەمەچەشنی هۆنراوەکانی بەکاریهێناوە، بەجۆرێك، کە دەتوانین چەندین پۆلێنبەندیی لە بەکارهێنانی ئەم هونەرەدا بۆ هەر شاعیرەیان بکەین و تایبەتمەندی هەریەکەیان بپارێزین و بخەینەڕوو، بەڵام ئەوەی لێرەدا مەبەست و ئامانجی ئێمەیە هەڵبژاردنی جۆرە پۆلێنبەندییەکە. جگە لەوەی لەڕووی کارەکی و (تطبیق)یەوە بەڵگە بێت بۆ هەموو ئەوەی وەك تیۆری ئاماژەمان پێداوە. لەهەمانکاتدا پۆلێنبەندییەکەمان بەجۆرێك بێت، کە هەردوو شاعیرەکەمان لەسەر ئەو بنەما و خاڵە کۆبکاتەوە، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەشێوەیەکی لاوەکی، یاخود ناڕاستەوخۆ بەراورد و کۆکردنەوەی ئەم دوو شاعیرە مەزنەیە لە جوغزی ناوەڕۆك، یاخود چۆنیەتیی دەربڕینی هاوبەشدا.

سکێچی پۆلێنبەندییەکەشمان لە چوارچێوەی، یاخود لە ڕوانگەی جۆر و دابەشکردنی هونەرەکانی ڕەوانبێژیدایە، بەو ئەندازەی، کە هۆنراوەکانی ئەم دوو شاعیرە وەکو خاڵی هاوبەشی نێوان هەردووکیان، هەڵیدەگرێت. ئەگەرنا هەریەکێك لەم دوو شاعیرە بەتەنها بگریت، توانای دەربڕین و جۆری هونەری دەربڕینی (لە دوالیزمی دژیەك دا) زۆر لەم پۆلێنبەندییەی ئێمە فراوانترە و سنووری تیشکدانەوەی داهێنانیان ئەگەر بێسنووریش نەبێت ئەوا لە توانای ئەم باس و بابەتەی ئێمەدا نییە، کە بەش و پشکی لێکۆڵەرانیتر نەهێڵێتەوە تا هەوڵ و کاریتری بۆ زیاد بکەن. وەك لە بەرایی بابەتەکەشدا ئاماژەمان پێداوە بە پەرۆشەوە دەمانەوێت ڕەخنەگران و لێکۆڵەر و خەمخۆرانی ئەدەبی کوردیمان بخەینە بەردەم شێواز و ڕوانینێکی

نوێ بۆ چۆنیەتیی نرخاندنی بەرهەمی ئەدەبیمان، کە ئەم شێوازە جگە لەوەی وەکو هونەرێك بەشێکە لە شوناسی ئەدەبی کلاسیکمان و لەڕووی هونەری دەربڕینەوە پانتاییەکی بەرفراوانی بۆخۆی بردووە، لەهەمانکاتدا ڕێباز و پێوەرێکی نوێ و هاوچەرخیشە، کە پسپۆڕانی ئەدەب لە گەلانی دراوسێ و جیهان، بەشێك لە کارامەیی و جوانکاری ئەدەبی خۆیانی پێ نمایش دەکەن.

دوالیزمی دژەیەك یەکێکە لە دەرکەوتەکانی جوانی ڕوونبێژی لە بەرهەمی ئەدەبیدا. ئەم هونەرە ئەدەبیە دەگونجێت بە شێوازی (تەعبیر، دەربڕین)، یاخود (ترکیب، ڕۆنان) بەکارببرێت. لە هۆنراوەکانی مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزیدا ئەم هونەرە ئەدەبیە لەتەك هونەرەکانی ڕەوانبێژی و جوانیناسی (خواستن، لێچواندن، وێنەی دوو ڕەهەندی، درکە، خوازە، فرەواتایی، ڕۆچوون و زیادەڕەوی) ئاوێتە بووە و ئاستی جوانی ناوەڕۆك و ڕوونبێژییەکەی دوو هێندە بەرزکردووەتەوە. دەرخستن و ئاشکراکردنی ئەم پەیوەندییانە دەتوانێت زۆر ئاسانکاریمان بۆ بکات تا زیاتر پەی بە تێگەیشتن و ئامانجی شاعیرەکەمان بەرین. لێرەدا پۆلێنبەندی و بەشەکانی دوالیزمی دژیەك لای هەردوو شاعیر بە نموونەی هۆنراوە لیریکییەکانییانەوە دەخەینەڕوو.

**بەشەکانی دوالیزمی دژیەك لە هۆنراوەکانی مەولانای ڕۆمی و مەولەویدا:**

دوالیزمی دژیەك لە هۆنراوەکانی مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوە گۆزیدا، لە ڕوانگەی پێکهێنان و بناغەی دروستبوونەوە، دەکرێت بە دوو بەشی سەرەکی، واتە (واتایی و دەربڕین) و (لێکدراو، یاخود ڕۆنان).

## ٢-١/ دوالیزمی دژیەك بە شێوازی واتایی و دەربڕیندا:

هەندێکجار دوالیزمی دژیەك و پارادۆکس (پێچەوانەی داب و نەریتی باو) لە چەمك و واتا و تێگەیشتنماندا بۆ واتای چەمکی نیوە دێرێك، یاخود کۆپلەی هۆنراوەیەك بە شێوازی دەربڕینی واتا، یاخود وێنە و دەربڕینێکی تایبەت دێت. بە جۆرێك، کە ئەم وێنانە بۆ زەینی خوێنەر و چێژلێوەرگرتن، هونەری و جوانتر دەکەوێتەوە لە بەش و شێوازی دووەمی دوالیزمی دژیەك، کە (دوالیزمی دژیەك بە شێوازی لێکدراو، یاخود ڕۆنانە) وەکو: لە زمانی فارسیدا (تاریکتر شدن از چراخان، صحّت بودن بیماری، احسان بودن ترك احسان...) لە کوردیشدا وەکو: (غەمی بێ غەمی، دەردی بێ دەردی، چاکی مەکە با خراپ نەبێت).

**دوالیزمی دژیەك لە شێوازی گوزارشتی واتاییدا، دەکرێتە دوو چەشن:**

**٢-١-أ/ ئەو گوزارشتە واتاییانەی، کە لە پێکهاتەی ڕووکارییاندا دژیەك بەدیدەکرێت:**

ئەم چەشنە لە دوالیزمی دژیەکیش دەکرێتە دوو جۆر: ناوەڕۆکی و جوانناسی.

**٢-١-أ-١/ دوالیزمی دژیەکی (ناوەڕۆکی):**

لەم چوارچێوەیەدا، دوالیزمی دژیەکی ناوەڕۆکی گوزارشتێکە لە پاشخانی بینراوە سروشتی و عادەتییەکەوە، کە گونجاویشە لەگەڵ باو و نەریتی پەسەندکراودا، ڕاستیەك خۆی شاردۆتەوە، کە پێچەوانەیە لەگەڵ ئەو دیاردە

ئاشکرایەدا. هەربۆیە دەربڕینی ئەم ڕاستی و واقیعە لەبەرئەوەی لەگەڵ باو و لۆژیکی ئاسایی و باودا دژ و پێچەوانەیە، لەسەرەتادا وەك دژ و پێچەوانە بەدیدەکرێت، بەڵام لە خودی خۆیدا هونەرێکی دەربڕینە بۆ زیاتر چێژ لێوەرگرتن و دەرکەوتنی مەبەستی شاعیر.[192]

مەولانای ڕۆمی دەڵێ:

چو دانستی، که دیوانه شدی، عقل است این دانش

چو می دانی، که تو مستی، پس اکنون هوشیاری تو[193]

واتە کاتێك ئاگاداری بە شێتی خۆت، ئەوە عەقڵ و ژیری و زانینە، چونکە عەقڵت هەیە، کە شێتی، کاتێك ئاگاداری، کە تۆ مەست و بێ هۆشی، ئەوە هۆشیاری و بەئاگابوونە، چونکە هۆشت هەیە، کە بێهۆشی.

مەولەوی تاوەگۆزی دەڵێ:

بەدی نیکیەن، نیکی بەدنامی

فامای شێتیەن، شێتی پڕ فامی[194]

بەدی: خراپە. نیکی: چاکە. فامای: تێگەیشتن.

واتای وێنەی نیوە بەیتی یەکەمی مەولانا، لە نیوە بەیتی دووەمی مەولەویدا ڕەنگی داوەتەوە. لەوەش بگەڕێ، کە هەر لەسەر بنەمای چەمك و زاراوەکەی ئێمە

---

[192] تقی وحیدیان کامیار، متناقض نما (paradox) در ادبیات، نشریه ٔ دانشکده ٔ ادبیات و علوم انسانی دانشگاه فردوسی مشهد، سال بیست و هشتم ١٣٧٦ هـ.ش، شماره ٔ ٤ و ٣. ل٢٧١.

[193] جلال الدین محمد بلخی، مولانا. غزلیات شمس تبریزی، مقدمه گزینش و تفسیر: محمد رضا شفیعی کدکنی، جلد دوم. انتشارات سخن – تهران، چاپ سوم، ١٣٨٧ هـ.ش. ل٣٠٦.

[194] دیوانی مەولەوی، سەرجەم هۆنراوەکانی ئەم بابەتە وەرگیراون لە (دیوانی مەولەوی، کۆکردنەوە و لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس، سنندج، انتشارات کردستان، ١٣٨٩)، ل٥١٩.

بەیتی هەردوو شاعیرەکە دارێژراون، بەڵام ئەوەی بە تایبەتمەندی بۆ مەولەوی تاوەگۆزی دەگەڕێتەوە، ئەوەیە، کە نەهاتووە دەقاودەق کۆپی بەیتەکەی مەولانا بکات، بەڵکو دژیەکی (بەدی و نیکی) هێناوە، کە لە ڕووی قووڵی و فراوانیی واتاکەیەوە ئەگەر لە (دانایی و نەدانی) قووڵتر نەبێت، ڕووکەشتر نییە.

دەتوانین گەلێك نموونەی تر بۆ هەمان مەبەست بهێنینەوە، لە شوێنێکی تردا مەولانای ڕۆمی دەڵێت:

اول نظر، ارچه سرسر بود سرمایه واصل دلبری بود

گر عشق و بال و کافری بود آخر نه بەروی آن پری بود ؟

زان رنگ تو گشتەایم بی رنگزان سوی خرد هزار سنگ[١٩٥]

مەولانا باس و حەقیقەتی (عیشق) دەخاتەڕوو، کە ئەگەرچی تیلەنیگای یەکەمی عاشق بۆ ئەویندارەکەی سەرسەریانەیە، بەڵام هەر ئەوە سەرمایەی سەرەتایی و خودی دەستپێکی ئەوینداربوون و دڵ لەدەستدانە...

پاشان لە دوا دێڕدا، کە مەبەست و ئامانجی ئەم خاڵەی ئێمەیە، مەولانا ڕوو لە (عیشق) دەکات و دەڵێ: لە جوانی ڕەنگی تۆدا و لە ڕەنگاوڕەنگی و جوانیتدا ئێمە (بێ ڕەنگ) بووین، بێ ڕەنگبوون بە واتای (سپی بوون) و پاکبوونەوە، یاخود داڕنینی ڕەنگی جیاواز و خاکیبوون لە جیهانی (عیشق)دا[١٩٦]. لە نیوەی کۆتایی دوادێڕدا دەڵێ: لەو جیهان و شوێنەی، کە بە هەزاران میل لە عەقڵەوە

---

[١٩٥] جلال الدین محمد بلخی، مولانا. غزلیات شمس تبریزی، مقدمه گزینش وتفسیر: محمد رضا شفیعی کدکنی، جلد اول. انتشارات سخن – تهران، چاپ سوم، ١٣٨٧ هـ.ش. ل٢٦١.

[١٩٦] احمد گلی، متناقض نمایی در شعر صائب، فصلنامه پژوهشهای ادبی سال ٥، شماره ٢٠، تابستان ١٣٨٧ هـ.ش. ل١٥٤.

دووره واته (جیهانی عیشق)، چونکه له فەرهەنگی عارفاندا (عەقڵ و عیشق) وەك دوو جیاوازی دژ سەیردەکرێن و لەوبارەوە شاعیرە عارفەکانی ئەم ناوچەیە بەتایبەتی مەولانا زۆر هۆنراوەی سەبارەت بە دژبوونی (عەقڵ و عیشق) هەیە. ئەوەی لێرەدا کرۆکی مەبەست و ئامانجی ئێمەیە، هەمان دەربڕینی نیوەی یەکەمی دوادێڕی هۆنراوەکەیە، کە دوالیزمی دژیەکی دروستکردووە، چونکە دەڵێ: له جوانی ڕەنگی تۆدا ئێمە بێ ڕەنگ بووین.

تێبینی: ئەم دەربڕینی (ڕەنگ و بێ ڕەنگی)یەی مەولانای ڕۆمی بە جۆرێکی، بەڵام بۆ هەمان مەبەستی هونەری دوالیزمی دژیەك لەڕووی ناوەڕۆکەوە، لای مەولەوی تاوەگۆزیش باسکراوە، وەك پاش ئەم نموونەیەی مەولانای ڕۆمی دێینە سەر باسی نموونە لای مەولەوی تاوەگۆزی. هەروەها لە نموونەیەکی دواتردا ڕوونمان کردووەتەوە، کە (بێ ڕەنگی) لە فەرهەنگی عارف و سۆفیدا (درکە)یە بۆ پایەداری و نەگۆڕی.[197]

مەولانا لە هۆنراوەیەکی زۆر پڕمانای دیکەدا دەڵێ:

گم شدن در گم شدن دین من است

نیستی در هست آین من است[198]

واتە: ونبوون لەناو ونبووندا باوەڕی منە، نەبوون لە هەبووندا ئایینی منە.

واتە جۆرە ونبوونێك، کە مرۆڤ تەنانەت هەست بە ونبوونی خۆیشی ناکات، لەگەڵ بوون و بەهرە وەرگرتن لە هەبووندا بەجۆرێك دووربکەویتەوە لە حەز و ئارەزووەکانی مرۆڤ، کە هیچ کاریگەری و پاشماوەیەکیان لات نەمێنێت. بەم

---

[197] دیوانی مەولەوی، ل١١٤.

[198] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج١، ل٢٩١.

جۆرە هەم بوونە هەم نەبوون.[١٩٩] هەر لەم بارەیەوە مەولەوی تاوەگۆزی دەڵێت:

وەش ڕەنگی بازەم سادەی بێ رەنگی
شادی باوەس بۆ وەختەن دڵ تەنگی[٢٠٠]

مەولەوی لەم هۆنراوەیەدا و لە دوو بەیتی بەراییدا بە ئاراستەی "چەواشەی چەپکەرد"، کە مەبەستی (قەدەر) و ڕووداوە خۆش و ناخۆشەکانی ژیانە، دەدوێ و دواتر لە باسیدا و لە نیوەدێڕی یەکەمی ئەم بەیتەی سەرەوەدا دەڵێ: (جوان و ڕەنگاوڕەنگ، یاخود ڕەنگی جوانت لەخۆگرتووە)، بەڵام بەردەوامە و دەڵێ: (بازەم) لەهەمانکاتدا سادەیەکی بێ ڕەنگی.

ئەم گوزارشتە، کە لە یەك کاتدا ڕەنگ جوان و سادە و بێ ڕەنگیشە، گوزارشتێکی واتاییە، کە لەڕووی ناوەڕۆکەوە دوالیزمێکی دژیەکی گرتووەتە خۆی، چونکە لەڕووی لۆژیکی واقیعییەوە چۆن دەبێت لەیەك کاتدا جوانی و فرەڕەنگی و بێ ڕەنگی کۆبکرێتەوە، بەڵام دیارە شاعیر مەبەستی لە ژیانە، کە خۆشی و ناخۆشی لەخۆگرتووە.

تێبینی: لە شیکاریی دیوانەکەی مەولەویدا و لەهەمان لاپەڕەدا، مامۆستا مەلاعبدالکریمی مدرس مانای واتای (بازەم) بە (وازم لێبێنە)، یاخود (لێم گەڕێ) لێکداوەتەوە، بەڵام لەڕاستیدا (بازەم) لە هەورامی خۆرهەڵاتی

---

[١٩٩] کریم فیضی، (غزلیات شمس تبریزی بە روایت دکتر دینانی)، جلد اول، انتشارات اطلاعات، چاپ اول، ١٣٨٩ هـ.ش. ل٣٠.

[٢٠٠] دیوانی مەولەوی، ل١٧٢.

کوردستاندا واتە (لەهەمانکاتدا) و ئەگەر کۆی واتای هۆنراوەکەش بگرین بە واتای دووەم ماناداردەبێت.

لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێ:

پەشێوی وەنەزم لوو لووی ئەسرین دا

پەروین دائیرەی خورشید تەزیین دا[٢٠١]

لەڕووی لۆژیکی جوانییەوە و لە واقیعدا (پەشێوی) نابێتە هۆی (تەزیین) واتە جوانی ڕازاندنەوە، بەڵام مەولەوی دەڵێ: ئەو دەنکە فرمێسکانەی نازداران، کە ئەوسا بە ڕێکی وەك ڕشتەی مرواری دەهاتە خوارەوە، ئێستا بە ناڕێکی و پەشێوی دەڕژێتە خوارەوە و بە دەوری ڕوویاندا دەڕژێ دائیرەی ڕوویان دەڕازێنێتەوە. لەڕاستیدا لەڕووی ڕواڵەتی وشەکانەوە دژەکە: (پەشێوی× نەزم)ە، بەڵام -وەك وترا- پەشێوی و بێسەروبەری -وەك باوە- نیشانەی جوانی نەبووە. لێرەدا هەر لەڕووی دژیەکییەوە، واتایەکی تر لەخۆدەگرێت، ئەویش گەڕانی (خۆشیی) جارانە بە (ماتەم)ی ئێستا،..کەواتە لە چەند ڕوویەکەوە شاعیر هونەری نواندووە بۆ نیشاندانی هەست و سۆزی.

### ٢-١-أ-٢/ دوالیزمی دژیەکی جوانناسی:

بەشێوەیەکی تایبەت تەنها یەکێکە لە شێوازەکانی ناساندن و ناسینەوە و ئەفراندنی (جوانی زمانی)یە و هیچ پەیوەندییەکی بە کرۆك و چەمکی دژیەك بوونەوە نییە. واتە لە واتادا دژیەکبوون نییە، بەڵام لەو دەربڕینەدا

---

[٢٠١] دیوانی مەولەوی، ل١٤٠.

دەستەواژەو زاراوەی ئەوتۆی تێدایە، کە لە واتایەکدا پێکەوە دەبنە دژیەك، بەڵام بە مانا و واتایەکی دیکە دژیەك نین.[٢٠٢]

دوالیزمی دژیەکی جوانناسی بەپێی لایەنەکانی ڕەوانبێژی بەشێوەیەکی گشتی و سەرەکی دابەشدەبێت بەسەر دوو لایەنی: ڕوونبێژی و جوانکاری (بدیع).

ئەو جۆرە دوالیزمە دژیەکەی، کە لەسەر بنەمای لایەنی هونەری ڕوونبێژییە، دابەشدەبێت بۆ پێنج جۆر، کە ئەمانەن:

### ٢-١-أ-٢-١-أ/ لەسەر بنەمای خواستن:

لەم جۆرە دوالیزمە دژیەکەی جوانناسیدا، لێخواستراو، کە (لەوچووە) بەجۆرێك هەڵدەبژێردێت، کە لەگەڵ زاراوە و وشەیەکی ناو هۆنراوەکەدا دژیەك دروستبکات و بە لابردنی لێخواسترا و دژیەکبوونەکە (یاخود ئەوەی، کە بە دژیەك دەزانرێت و وا بەدیدەکرێت) نامێنێت.[٢٠٣]

جێگای ئامازەبۆکردنە، کە (خواستن) لەڕووی پێناسەی زاراوەییەوە لە ڕەوانبێژیدا: "ئەوەیە، کە ناوی لایەکی دوو لاکەی چواندن (چوێنراو و پێچوێنراو) بهێنی و مەبەستت لەلاکەی تر بێت و واش پیشانی بدەیت، کە چوێنراو چووەتە ڕەگەزی پێچوێنراوەوە و تایبەتمەندییەکانی پێچوێنراوی تێدا بچەسپێت"[٢٠٤] با نموونە بۆ شیکاریی ئەم جۆرە دوالیزمە بهێنینەوە، لەوبارەوە مەولانای ڕۆمی دەڵێت:

---

[٢٠٢] تقی وحیدیان کامیار، متناقض نما (paradox) ل٢٨٤.

[٢٠٣] تقی وحیدیان کامیار، متناقض نما (paradox). هەمان لاپەڕە.

[٢٠٤] ابو یعقوب سکاکی، مفتاح العلوم، مطبعة مصطفى البابي الحلبي، القاهرة، ١٩٧٣، ل١٨٠.

گر قالبت در خاك شد، جان تو بر افلاك شد

گر خرقهٔ تو چاك شد، جانِ تورا نَبْوَد فنا[٢٠٥]

جان: واته گیان، رۆح.

قالب: واته قاڵب و چوارچێوه، لێخواستراوه بۆ جهسته.

خرقهٔ: پۆشاکی دهروێشان، لێخواستراوه بۆ جهسته.

واته: ئهگهر (قالبت) جهستهت بچێته ژێرخاك، ئهوا گیانت به بهرزی دهگات، ههروهها ئهگهر جهستهت (خرقهٔ)ت بدڕێت، یان بکهوێت، گیانی تۆ نهمر دهبێت.

لێرهدا (قالب) و (خرقهٔ) لێخواستراوه بۆ جهسته و لاشه و ڕووکاری دهرهوه، لهگهڵ وشهی (جان)دا واته گیان، که دهگونجێ مهبهستی گیان و کرۆك و دهروون بێت، دوالیزمی دژیهکیان دروستکردووه.

تێبینی: مهولهوی تاوهگۆزی شاعیریش ههمان جۆره دهربڕینی ههیه، که دهڵێ:

"قاڵبم بێ ڕۆح، ئهروام نهمهندهن

من دانی حهیات زیندهگیم کهندهن"[٢٠٦]

بهڵام لهبهرئهوهی له شێوازی دووهمی سهرهکی "واته لێکدراو ڕۆنانی"یه، له جۆری (خواستن) وهکو نموونه هێنامانهوه، که له دواتردا دێت.

مهولانا له هۆنراوهیهکی دیکهدا دهڵێ:

این عدم خود چه مبارك جای است

که مدد های وجود از عدم است[٢٠٧]

---

[٢٠٥] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج١، ل١٦٢.

[٢٠٦] دیوانی مهولهوی، ل٤٤.

عدم: ئەم زاراوەیە لای مەولانا واتا و بەکارهێنانی تایبەتی هەیە، بەواتای ڕەهای (نەبوون) نییە، بەڵکو مەبەست لەو جێگە و پێگەیەیە، کە ڕووخسارە دەرەکییەکان ئامادەگییان نییە و سنوورێك نییە، ئەم زاراوەیە، کە تەعبیرێکی ترە لە (عالم غیب) جیهانی شاراوە، شتێك نییە جگە لە (وجود مطلق) بوونی ڕەها، کە لە کرۆکی ئەوەوە هەموو شێوەکان دەردێن.[٢٠٨]

واتە: ئەم جیهانە پیرۆزەی (عدم) – نەبوونی، کە لێخواستراوە بۆ (وجود مطلق) بوونی ڕەها، زۆر پیرۆزە، چونکە هەموو پاڵنەرەکانی (بوون) لەم جیهانە نەبووەوەن. لێرەدا دوالیزمی دژیەکی دروستکردووە واتە وشەکانی (عدم) و (وجود)، کە (عدم) لێخواستراوە بۆ (بوونی ڕەها).

لەم بارەیەوە مەولەوی تاوەگۆزی دەڵێت:

سیاییم ئاوەرد، سفیدیم پێ ڕەشت
هەفتم کەردەوە گرێم دا لە هەشت[٢٠٩]

سیایی: واتە گوناه و تاوان.

گوناه و تاوانم بەسەر خۆمدا هێنا و نامەی کردارم، کە سپیە و خراپەی تێدا نییە، ڕەشم کردەوە، یاخود پڕم کرد لە تاوان‌و گوناه.

وشەی (سیاه) واتە ڕەشی لێخواستراوە بۆ (تاوان، گوناه)، کە وشە لێخواستراوەکە (واتە ڕەشی) دژ دێتەوە لەگەڵ (سفید) واتە سپی بوونی نامەی

---

[٢٠٧] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج١، ل٢٩٣.

[٢٠٨] سەرچاوەی پێشوو.

[٢٠٩] دیوانی مەولەوی، ل٣٣٥.

کردار، ئەگەر (سیاه) لابەرین و مەبەستە بنەڕەتییەکە بهێنین، کە (خراپە و گوناهە) ئەوا دژبوونەکە نامێنێت.

تێبینی: لە نیوەی دووەمی دێڕی هۆنراوەکەدا (هەفت) واتە حەوت دەرگای دۆزەخی بۆخۆی خستووەتە سەر پشت، هەروەها (هەشت) واتە قفڵی لە هەشت دەرگای بەهەشت داوە بەڕووی خۆیدا، دیارە ئەم دوانەش دوالیزمی دژیەکن، بەڵام ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مەبەستە بنەڕەتییەکەیان، ئەمەش تەنها بۆ زانیاری و ئەگەر نا پێچەوانەی خواست ئامانجی ئێمەیە لەم خاڵەدا.

٢-١-أ-٢-١-ب/ لەسەر بنەمای لێچواندن:

لەم جۆرە لە دوالیزمی دژیەکدا (لەوچوو) بە جۆرێك هەڵدەبژێردرێت، کە لەگەڵ زاراوە و وشەیەکی ناو هۆنراوەکەدا دژیەکبوون دروست بکات و بە لابردنی (لەوچوو)ەکە، ئەوەی، کە بە دژیەك دەزانرێت نامێنێت.[٢١٠]

وەك نموونەیەك بۆ ئەم هونەرە، مەولانای ڕۆمی دەڵێت:

دلِ گردون خلل کند چو مَهِ تو نهان شود

چو رسد تیرِغمزه‌ات همعقدها کمان شود[٢١١]

خلل کردن: بە فارسی (زیان دیدن و شکستگی یافتن)[٢١٢] زیان هێنان و پاشەکشێ کردن.

---

[٢١٠] تقی وحیدیان کامیار، متناقض نما (paradox) ل٢٨٤.

[٢١١] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج١، ل٥٦٢.

[٢١٢] حسن عمید، فرهنگ فارسی عمید، مؤسسه انتشارات امیر کبیر، تهران، ١٣٧٩ هـ.ش. ل٥٦٢.

واتە: هەموو دروستکراوەکانی ناوجەرگەی گەردوون پاشەکشێیان کرد، کە مانگی تۆ (واتە تۆی وەك مانگ) دەرکەوت.

کە تیری غەمزەت گەیشت، هەموو قەد و باڵاکان وەکو کەمان چەمینەوە، لە ڕێزی هاتنی تۆدا.

لێرەدا (تیر) و (کەمان) هەردووکیان لێچوون و دوالیزمی دژیەکن، دواتر (غەمزە) و (قەدوباڵا) چوێنراوە بە (تیر و کەمان)، کە مەبەستە بنەڕەتییەکان واتە غەمزە و قەدوباڵا، هیچ دژیەك بوونێکیان تێدا نییە، بەڵکو لێچووەکانیان دوالیزمی دژیەکن.

تێبینی: مەولەوی تاوەگۆزیش هەمان بەکارهێنانی (کەمان) ی هەیە بۆ قەدو پشتی چەماوە، بەڵام چەماوەی (پیری) هەروەها (تیر)ی بۆ (نظر) بەکارهێناوە نەك ناز و غەمزە، کە دەڵێت:

سفیدیت قەڵغان پەی ڕووی سیات بۆ

کەمانیت شەفیع تیری دیات بۆ[٢١٣]

ئێمە ئەم هۆنراوەیەی مەولەوی تاوەگۆزیمان لە جۆرێکی تری ئەم هونەرەدا واتە دوالیزمی دژیەك بەکارهێناوە، کە دواتر دێت.

مەولەوی تاوەگۆزی لەم بارەیەوە واتە لە چوارچێوەی ئەم هونەرەدا دەڵێت:

مەوتەنەکەی چەم دیدەش هانەڕێت

غەریبی تاکەی بۆوە ماوای وێت[٢١٤]

مەوتەن: واتە نیشتمان و شوێنی خۆت.

---

[٢١٣] دیوانی مەولەوی، ل١٣٧.

[٢١٤] سەرچاوەی پێشوو، ل٥٦.

(چاوم)، کە وەکو مەوتنی خۆتە، چاو لەڕێتە، تاکەی (غەریبی) واتە تاکەی دوور لە وەتەن و وڵات بگەڕێوە شوێن و جێگەی خۆت.

(مەوتەن) و (غەریبی) دوالیزمی دژیەکن، چونکە تەعبیرە لە دوو شوێنی جیاو دژ بۆ مرۆڤ، بەڵام لێرەدا (مەوتەن) لەوچووە و لێچووەکەی (چەم) واتە چاوە، کە ئەگەر لەوچوو واتە (مەوتەن) لابەرین دژیەك نامێنێت.

لە هۆنراوەیەکی دیکەدا مەولەوی هەنگاوێك لەمەش زیاتر دەڕوات و دوو لەوچووی دژیەك لە دێڕێك هۆنراوەدا دەهێنێ و دەڵێت:

تۆ وێنەی بوڵبوڵ مەستی هەوای گوڵ

من چون بایەقوش چۆڵی نەوای دڵ[٢١٥]

(بوڵبوڵ) و (بایەقوش) هەردووکیان لەوچوون و دژیەکن، چونکە بوڵبوڵ هێمایە بۆ جوانی و ئاوەدانی و خۆشی، بەڵام بایەقوش هێمایە بۆ ناشیرینی و چۆڵی و شوومیی.

## ٢-١-أ-٢-١-ج/ لەسەر بنەمای وێنەی دوو ڕەهەندی (خواستن و لێچواندن):

لەم جۆرەی دوالیزمی دژیەکی جوانناسییدا، (لێخواستراو) و (لەوچوو) بەجۆرێك هەڵدەبژێردرێن، کە پێکەوە لە هۆنراوەکەدا دژیەك دروست بکەن و بە لابردنی لێخواستراو و لەوچووەکە و گەڕانەوە بۆ مەبەستی بنەڕەتی، دژیەك بوونەکە (یاخود ئەو دژبوونەی، کە وا بەدیدەکرێت) نامێنێت.[٢١٦]

---

[٢١٥] دیوانی مەولەوی، ل.١٥٠.

[٢١٦] تقی وحیدیان کامیار، متناقض نما (paradox) ل٢٨٤.

بۆ ئەم بابەتە مەولانای ڕۆمی دەڵێت:

عقل آمد، عاشقا! خود را بپوش        ای ما، ای وای ما، از عقل و هوش
یا برو از جمع ما، ای چشم و عقل        یا شوم از ننگ تو بی چشم و گوش
تو چو آبی ز آتش ما دور شو        یا در آ در دیگ ما، باما بجوش[٢١٧]

واتە: عەقڵ هات، ئەی عاشق خۆت داپۆشە– وای لە ئێمە، (خۆکۆکردنەوە و خۆداپۆشین و شەرمی ئافرەتان) وای لە تاو عەقڵ و هۆش (لای عارف و سۆفییەکان عەقڵ و عیشق دژی یەکترین، چونکە عەقڵ سەرچاوەی مەعریفی فەیلەسوف و زانایانی کەلامە، بەڵام دڵ و عیشق سەرچاوەی مەعریفی عارفانە).
ئەی عەقڵ یا لەناو کۆمەڵی ئێمەدا مەمێنە و بڕۆ، یان لە داخی پەستی تۆ بێ چاو و گوێ دەبم تۆ ئەی عەقڵ، کە وەکو (ئاو) وایت لە (ئاگر)ی ئێمە دوورکەوە، یاخود وەرە ناو مەنجەڵی عیشقی ئێمە لەگەڵ ئێمەدا بکەوەرە جۆش و خرۆش.

(عەقڵ) وەکو (ئاو)ە... ئەمە لێچواندنە...

(ئاو)، کە (لەوچووە) دوالیزمی دژیەکی دروستکردووە لەگەڵ (ئاگر)دا، کە لێخواستراوە بۆ (عیشق).

مەولەوی تاوەگۆزیش دەڵێت:

چەمم چون شاباز وێڵ شکار بۆ
دایم باڵ پەرواز نەسەر دیار بۆ

واتە: چاوم هەروەك شاباز (کە جۆرێکە لە هەڵۆ و بۆ ڕاوکردن بەکاردێت) وێڵە و بەدوای نێچیرەکەیدا دەگەڕێت و بەردەوام باڵەکانی دەدات بەیەکدا و لە بەرزاییەوە دەڕوانێ بۆ دۆزینەوەی نێچیرەکەی.

---

[٢١٧] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج١، ل٦٦١.

لێرەدا (شابان)، کە وەك لەوچوو هاتووە و لە چاوی شاعیر (چەمم) دەچێت، دوالیزمی دژیەکی دروستکردووە لەگەڵ (شکار)دا، کە (لێخواستراو)ە بۆ خۆشەویست و کەسێکی تایبەت، کە شاعیر بەدوایدا دەگەڕێت. ئەگەرچی شاعیر ئەو کەسەشی بە (شکار) واتە نێچیر چواندووە، بەڵام لەمەی دووەمدا تەنها (شکار) هاتووە، واتە (خواستن)ە[٢١٨].

**٢-١-أ-٢-١-د/ لەسەر بنەمای (درکە):**

لەم جۆرە لە دوالیزمی دژیەکی جوانناسییدا، (درکاو)، (چ وەك زاراوە و چ وەك واتای ئاشکرا) بە جۆرێك هەڵدەبژێردرێت، کە لەگەڵ وشە یان پێکهاتە، یاخود ڕستەیەکی دەربڕینەکەدا دژیەکبوون دروستدەکات، بەڵام بە لابردنی (درکاو)ەکە دژیەك بوونەکە (یاخود ئەوەی، کە وەك دژیەکبوون دەردەکەوێت) نامێنێت.[٢١٩]

مەولانای ڕۆمی لە نموونەی هۆنراوەیەکیدا دەڵێت:

خداوندِ خداوندان و صورتْ سازِ بی صورت!

چه صورت می کشی بر من، تو دانی من نمی دانم[٢٢٠]

صورت ساز: واتە دروستکەر و بەدیهێنەری ڕووخسار و شێوازەکان، لێرەدا (درکە)یە و مەبەستی لە (خوا)یە.

بی صورت: بێ وێنە و بێ ڕووخسار.

---

[٢١٨] دیوانی مەولەوی، ل٣٣.

[٢١٩] تقی وحیدیان کامیار، متناقض نما (paradox) ل٢٨٤.

[٢٢٠] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، چ٢، ل٧٣١.

واتە: ئەی خوای خواکان و ئەی دروستکەری وێنە و ڕووخسارەکان، کە خۆت بێ وێنە و ڕووخساری.

هەر جۆرە ڕووخسار و شێوازێك بدەیتە من، ئەوە تەنها خۆت دەزانی و من نازانم.

(صورت ساز بی صورت) دەستەواژەیەکی لێکدراوە، کە دوالیزمی دژیەکی دروستکردووە.

لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێت:

از "اَسْلَمَ شیطانی" شد نفسِ تو ربّانی ابلیس مسلمان شد، تا باد چنین بادا[٢٢١]

(أسْلَمَ شیطانی) ئاماژەیە بە فەرموودەیەکی پێغەمبەر (خ)، کە دەفەرمووێت: "لكل نفس شیطان.. لكن أسْلَمَ شیطانی بیدي". [٢٢٢]

واتە: نەفسی هەموو مرۆڤێك شەیتانێکی لەگەڵدایە، کە هانی دەدات بۆ خراپە، بەڵام من شەیتانەکەی خۆمم موسڵمان کردووە.

مەولانا دەڵێت: بە بەرەکەتی موسڵمانبوونی شەیتانەکەی پێغەمبەر، تۆش نەفست بووەتە (ربّانی) واتە پاکبووەتەوە، چونکە لە بنەڕەتدا نەفسی (امارة بالسوء) فەرمان بە خراپە دەدات، ئەم کارە واتە موسڵمان بوونی شەیتانەکەی پێغەمبەر و هەر بەو بەرەکەتەش توانایی موسڵمانی ڕەبانی بۆ جڵەوکردنی شەیتان سەرکەوتنە و وەك مسوڵمانکردنی شەیتانە گەورە وایە، کە (ابلیس) و سەرچاوەی هەموو خراپەیە.

---

[٢٢١] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج١، ل٢٠٠.

[٢٢٢] فەرموودەی پێغەمبەر (خ)، مختصر صحیح البخاري، بیروت، دار نوبلیس للنشر، ٢٠٠٨.

لێرەدا (ابليس) (موسڵمان) بوو دواليزمی دژیەکە و (ابليس) (درکە)یە بۆ هەموو خراپەکار و بەدڕەفتارێك و لە بنەڕەتدا (ابليس) مەحاڵە موسڵمان بێت.[٢٢٣]

مەولەوی تاوەگۆزیش لەم بارەوە دەڵێت:

ئامام سەرنیام وە بارەگاوە

غەریو، موو سفید، وە ڕووی سیاوە[٢٢٤]

(موو سفيد) خوازەیە بۆ (پیری)، کە لەگەڵ (ڕەشی) ڕوودا دژیەك، یاخود دواليزمی دژ دروست دەکات، بەڵام بە لابردنی (موو سفيد) و هێنانەوەی (پیری)، کە هاوواتایەتی، دژیەك بوونەکە نامێنێ.

هەروەها لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێت:

"فاتحەی کتاب" دوعام، شەو ئەڕڕۆن

ئیلتیماسی حوسن خاتمەکەی تۆن[٢٢٥]

فاتحە: ئەوەڵ، سەرەتا، دەستپێك

خاتمە: کۆتایی، کۆتا

(فاتحەی کتاب) درکەیەکە مەبەست لە سورەتی فاتیحەیە، کە یەکەمین سورەت و سەرەتای ئەو کتێبەیە، کە قورئانە، بەڵام مەولەوی بەم درکەیە ئەو واتایەمان پێ دەگەیەنێت، کە سەرەتای دوعام لە شەو و ڕۆژدا و پاڕانەوەی بەردەوامم بۆ باشی (کۆتایی) ڕەفتار و تەمەنی تۆیە.

(فاتحە) و (خاتمە) دوو دواليزمی دژیەکن، کە یەکەمیان (درکاو)ە.

---

[٢٢٣] کریم فیضی، شعاع شمس، ج١، ل٢٦٣.

[٢٢٤] دیوانی مەولەوی، ل٣٣٠.

[٢٢٥] دیوانی مەولەوی، ل٥٣.

**٢-١-أ-٢-١-هـ/ لەسەر بنەمای خوازە:**

لەو جۆرەیە، کە لە پێکهاتە و دەربڕینەکەدا لەبری زاراوەیەك، (مرادف) هاوواتاکەی بهێنرێت بەجۆرێك، کە لەگەڵ زاراوەیەکی دیکەدا لە مانا و واتایەکدا دوالیزمی دژیەك دروستبکات، بەڵام لە مانا و واتا بنەڕەتییەکەی زاراوەکەدا دژیەك بوونەکە نەمێنێت.[٢٢٦]

سەبارەت بەم جۆرە مەولانای ڕۆمی دەڵێت:

یك نفسی خموش کن، در خموشی خروش کن

وقت سخن تو خامُشی در خمشی تو ناطقی[٢٢٧]

واتە: بۆ ساتێك بێدەنگ بەو بێدەنگی هەڵبژێرە، لەم بێدەنگیەدا لە ناخ و دەروونتەوە بجۆشێ پڕ هاوار بە و بخرۆشێ. ئیتر لە کات و ساتی قسەکردن و قاڵەقاڵی بێسوودی خەڵکی دیکەدا تۆ بێدەنگێکی، کە بە زمانێکی پوخت و لێزان و پڕواتا دەدوێیت واتە دەربڕینێکی جیاواز لە خەڵکی.

خامُشی: بێدەنگی

سخن: وتە، قسەکردن

ناطق: قسەکەری لێهاتوو

بەگشتی دوو جۆر بێدەنگبوون هەیە: یەکەمیان، بێدەنگی لە وتنی بابەتێك، کە نابێت بگوترێت. واتە وەك دەربڕین دەتوانین دەریبڕین، بەڵام نابێت بگوترێت، چونکە بۆ گوتن ناشێت.

---

[٢٢٦] تقی وحیدیان کامیار، متناقض نما (paradox) ل٢٨٤.

[٢٢٧] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج٢، ل١١٩٤.

دووەم، هەندێك بابەت و مانا هەیە ناگوترێت لەبەرئەوەی، كە بەگشتی بابەتەكە گەورەترە لە كەرەسەكانی دەربڕین، كە زاراوە و وشە و زمانە لێرەدا زۆرجار بێدەنگی نەك دەبێتە قسە و دەربڕین، بەڵكو لە (سخن) دەردەچێ و دەبێتە (ناطق)بوون واتە دەربڕینی جوان، یاخود جوانترین دەربڕین.[228]

لێرەدا (خامُشی) بێدەنگی (ناطق) لە جۆری دەربڕینی جوان، دوالیزمی دژیەكە، (ناطق) (خوازە)یە بۆ ئەو جۆرە بێدەنگیەی، كە جوانترین دەربڕینە (هەروەك پێشتر باسمان كرد).

پێویستە تێبینی ئەوەش بكەین، كە مەولانا بۆ قسەی خەڵكی (سخن) واتە (وتە و قسەكردن) بەكاردەهێنێت، بەڵام بۆ جۆری دووەمیان، كە جوانترین دەربڕینە بە بێدەنگی (ناطق)بوون بەكاردەهێنێت، كە ئاماژەیە بۆ وەسفی دەربڕینەكە، كە بێدەنگ بوونە.

مەولەوی تاوەگۆزیش لەمبارەوە دەڵێت:

دەخیل بیم وە نوتق خەمان لاڵ كەردەم
لالاًم جە خەیاڵ خەم غارەت بەردەم[229]

نوتق: واتە دەنگ و قسەكردن، كە لەبری (زمان) هاتووە وەكو هاو واتایەك و لەهەمانكاتدا (خوازە)ی بەرەڵایە و پەیوەندییەكەی لازم و مەلزومی یەكترییە.

مەولەوی دەڵێ:، كە نامەكەت هات دەسەوداوێنی (زمان)م بووم، كە خەم لاڵی كردبوو، هەروەها لالاًمەوە لە خەیاڵم، كە خەم بە تالاًن بردبووی.

---

[228] كریم فیضی، شعاع شمس، ج١، ل٢١١.

[229] دیوانی مەولەوی، ل٣٢٥.

لێرەدا (نوتق) بە واتای دەنگلێهاتن، کە خوازەیە و لەبری (زمان)[٭] هاتووە دوالیزمی دژیەك دروست دەکات لەگەڵ (لاڵبوون)، بە هێنانەوەی وشە بنەڕەتییەکە، کە (زمان)ە و لابردنی (نوتق)، کە دژی (لاڵ)یە، دژیەك بوونەکە نامێنێ.

۲-۱-أ-۲-۲/ ئەو جۆرە دوالیزمە دژیەکەی، کە لەسەر بنەمای لایەنی هونەری جوانکاری واتاییە:

دابەشدەبێت بۆ دوو جۆر، کە ئەمانەن:

۲-۱-أ-۲-۲-أ/ لەسەر بنەمای (فرەواتایی)[*]:

ئەو جۆرەیە، کە لە دەربڕیندا، وشە و زاراوەیەك بەکارببرێت، کە دوو واتا بگەیێنێت واتە دوو مانا و واتای هەبێت بە جۆرێك، کە ئەو زاراوەیە بە یەکێك لەو واتایانە، دوالیزمی دژیەك دروست بکات لەگەڵ زاراوەیەکی دیکەی نێو دەربڕینەکەدا، بەڵام هەمان زاراوە ئەگەر بە واتاکەی دیکەیان بەکاربرێت ئەو دژیەك بوونە نەمێنێت.[٢٣٠]

---

[*] لێرەدا پێویستە ئاماژە بەو تێبینییە بکەین، کە جگە لە (د.ئیدریس عەبدوڵڵا)، کە باسی (فرەواتایی) کردووە و ڕای وایە، کە بابەتێکی نوێ و زانستی ڕەوانبێژییە، پسپۆڕانی دیکەی ئەم بوارە ڕایان وایە، کە (فرەواتایی) بابەتێك نییە لەناو ڕەوانبێژیدا، بەڵکو (بەکارهێنان، ئاراستە، پۆشینی تەورییە) وەك چەند هونەرێکی ڕەوانبێژی هەن، بەڵام ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا فرەواتایی وەك ناونیشانی سەرەکی بەکاردەهێنین و لە ڕافەی شیعرەکاندا سێ چەمکەکەی تر بەکاردەهێنین.

[٢٣٠] تقی وحیدیان کامیار، متناقض نما (paradox) ل٢٨٤.

سەبارەت بەم هونەرەی جوانكاری (ئیدریس عەبدوڵلا مستەفا) دەڵێت: "فرەواتایی، یەكێكی دیكەیە لە هونەرە قەشەنگەكانی جوانكاری، دەچێتە خانەی جوانكاری واتایی، چونكە لێرەدا مامەڵە لەگەڵ وشە و دەربڕین و ڕستەیەك دەكرێت، بۆ زیاتر لە واتایەك ئاساییە و زیاتر لە وێنەیەك درووست دەكەن. ئەم هونەرە بۆ یەكەمجار لە كتێبی (جوانكاری لە ئەدەبی كوردیدا) لەلایەن نووسەری ئەم نامەیە ئامارەی بۆ كراوە و خراوەتە نێو جوانكاری، كە پێشتر هیچ ڕەوانبێژێكی كورد ئامارەی بۆ نەكردووە. بریتیە لە بەكارهێنانی وشە، یان چەند وشە و دەستەواژەیێك، كە بەسەر یەكەوە زیاتر لە واتایەك دەبەخشن".[٢٣١]

مەولانای ڕۆمی لە هۆنراوەیەكیدا و لە چوارچێوەی ئەم بنەمایەدا (لە جۆری هونەری ئاراستە) دەڵێت:

سپاس آن عَدَمی را كە هستِ ما بربود ز عشقِ آن عَدَم آمد جهانِ جان بە وجود
بە هر كجا عدم آید وجودگم گردد زهی عدم، كە چو آمد، از او وجود فزود![٢٣٢]

عدم: واتە (نەبوو) بە پێچەوانەی بوون (وجود)، زۆرجار بەواتای (جیهانی نەبینراو) دێت، بەڵام مەولانای ڕۆمی زۆرجار، بەتایبەتی لەم هۆنراوەیەدا سێ جاریان مەبەستی لە (عدم)، جیهانی بێ وێنە و ڕووخسار، یاخود (وجود مطلق)ە، كە خوای گەورەیە. جارێكیش مەبەستی جیهانی نەبڕاوەی نەبینراوە، كە بەرامبەر جیهانی بینراوە.

بۆیە دەڵێ: سوپاسی ئەو (عدم) خوایەی، كە بوونی ئێمەی بردووە بۆلای خۆی و لە خۆشەویستی ئەو (عدم) خوایەدا، جیهانی گیانەكان هاتووەتە بوون.

---

[٢٣١] ئیدریس عەبدوڵلا مستەفا، لایەنە ڕەوانبێژییەكان لە شیعری كلاسیكی كوردیدا، ل٣٧٦.

[٢٣٢] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی كدكنی، چ١، ل٥٥٢.

ئەگەر (عدم) لێرەدا واتە جیهانی نەبینراو، پەیدا بوو ئیتر جیهانی بوون ون دەبێت، بەڵام ئەم (عدم)ەیان واتە خوای گەورە زیاتر بوون دەخاتە سەر هەبوون.[٢٣٣]

کەواتە لێرەدا، (عدم) و (وجود) دوالیزمی دژیەکیان دروست کردووە، بەڵام (عدم) زیاتر لە واتایەکی گرتووەتە خۆی. بەواتای (نەبوون) دژیەك دروست دەکات، بەڵام بەواتای (خوا) هیچ دژیەکبوونێکی تێدا نییە.

مەولەوی تاوەگۆزیش لە چوارچێوەی ئەم بنەمایەدا و لە هۆنراوەیەکیدا دەڵێت:

شیرینی ئیفتار دڵم تاڵییەن

جام نە جەماعەت دۆسان خاڵییەن[٢٣٤]

"جەماعەت" بە دوو واتا دێت یەکێکیان بە واتای (نوێژ)، واتاکەی دیکەشیان بە مانای (کۆ، کۆبوونەوە، قەرەباڵغی، گردبوونەوە...).

ئەگەر بەواتای دووەمیان بێت واتە گردبوونەوە و قەرەباڵغی ئەوا لەگەڵ وشەی (خاڵی)، یاخود (خاڵییەن)، کە لە کۆتایی نیوە بەیتی دووەمدایە، دوالیزمی دژیەك دروست دەکات، بەڵام ئەگەر بەواتای یەکەمیان واتە (نوێژ) بێت، ئەوا هیچ دژبوونێکی تێدا نییە.

مەولەوی لەو هۆنراوەیەی سەرەوەدا دەڵێ:

دڵم لەباتی شیرینی، بە تاڵی بەربانگ دەکاتەوە، جێگاشم لەناو تاقمی برادەرانا خاڵییە، چونکە لێیان دوورم.

---

[٢٣٣] محمد رضا شفیعی کدکنی، در عشق زنده بودن (گزیدهٔ غزلیات شمس)، انتشارات سخن — تهران، چاپ اول، ١٣٨٨ هـ.ش. ل٥٥٤.

[٢٣٤] دیوانی مەولەوی، ل٧٨.

تێبینی: جێگای ئاماژەیە، کە (شیرینی) و (تاڵی)یش دوالیزمی دژیەکە، بەڵام لێرەدا ئێمە تەنها ئاماژە بە نیوە دێڕی دووەم دەدەین، کە مەبەستەکەی ئێمەی تێدایە.

**٢-١-أ-٢-٢-ب/ لەسەر بنەمای ڕۆچوون (موبالەغە):**

ئەم جۆرە دوالیزمی دژیەکبوونە، لە دەرئەنجامی زۆر ڕۆچوونی شاعیر دێت لە وەسف و باسکردنی بابەتێکدا.[٢٣٥]

مەولانای ڕۆمی لەمبارەیەوە دەڵێت:

تو خود دانی که من بی تو عدم باشم عدم باشم
عدم خود قابل هست است از آن هم نیز کم باشم[٢٣٦]

واتە: تۆ خۆت دەزانی، کە من بەبێ تۆ بە (عدم)م لێرەدا بەواتای (نەبوو)، یاخود (غەیبی)م نەك ئەوە، بەڵکو (عدم) بەواتای (غەیبی) ئەگەر ئاشکرابوون و دەرکەوتنی هەیە، بەڵام من لەوەش کەمترم.

واتە لە (نەبوون)یش کەمترم، هێندە بوونم بێ بەها و بایەخە.

ئەمە ڕۆچوونی تێدایە لەلایەن شاعیرەوە، کە دوالیزمی دژیەکی دروستکردووە، چونکە هەبوونی خۆی بە کەمتر دەزانێت لە نەبوون.

لە دێڕی کۆتایی هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێ:

نیست شو نیست از خودی زیرا بدتر از هستی ات جنایت نیست[٢٣٧]

---

[٢٣٥] تقی وحیدیان کامیار، متناقض نما (paradox) ل٢٨٤.

[٢٣٦] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج٢، ل٧٤٢.

[٢٣٧] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج١، ل٣٢٤.

واتە: با بوونت نەمێنێت و ببەرە نەبوو، نەبوو لە خودی خۆت، چونکە هیچ تاوانێك هێندەی بوونت خراپ نییە. بەکورتی بچۆرە دۆخی نەبوون، چونکە بوونت خراپترین تاوانە.

ئەم جۆرە دەربڕینە، حاڵەتی دەروونی تایبەت بە عارف و سۆفییەکانە، کە نەفسی مرۆڤ و بوونی خواستە دنیاییەکانی بە خراپترین و گەورەترین دوژمن دەزانن و پێویستە کاربکەن و هەوڵ بدەن بۆ بەجێهێشتنی (خود) و هەبوونی ئارەزووەکان، کە لە خودی خۆیدا تاوانە، بۆ نەبوون و جیهانی بێ خودی عیشق، کە (من)ەکان نامێنن، ئەم ئارەزووکردنەی (نەبوون) و بە تاوان و خراپ زانینەی (بوون) جگە لەوەی دوالیزمی دژیەکە، ڕۆچوونی تێدایە لە دەربڕیندا.

مەولەوی تاوەگۆزیش دەڵێت:

جەو بێ قیمەتی وە قیمەت یاوام

وە پایەی ڕوتبەی عالی سەرساوام[٢٣٨]

لە نیوە دێڕی یەکەمدا مەولەوی دەڵێ: لەو بێ نرخی و بێ قیمەتییەوە گەیشتمە پلەی بەقیمەتی و خاوەن نرخ و بایەخ و گەیشتمە پایەی بڵند.

(بێ قیمەتی) و (قیمەتدار بوون) دوالیزمی دژیەکە و شاعیر بە دەستەواژەی بێ قیمەتی زۆر ڕۆچووە لە بێ بەهاکردنی خۆی و کەسێکیش، کە بیەوێت بە بەها و پلە بەرزە مەعنەوییەکان بگات.

لە ڕەوشی پەروەردەیی ئەهلی تەسەوف و عارفاندا، هاوکێشەیەك هەیە، کە بریتیە لەوەی هەرکەس پلەی بەرزی لای خوای دەوێت دەبێت بە نرخی ژیان و

---

[٢٣٨] دیوانی مەولەوی، ل٢٩٤.

بچووکبوونەوە و خۆداڕنین لە هەموو (خۆ بەگەورەگرتن)ێك، ڕازی بێت وەك لە فەرموودەیەکدا هاتووە (من تواضع لله رفعه الله).

**٢-١-ب/ ئەو گوزارشتە واتاییانەی، کە لە پێکهاتەی ڕووکاریاندا دژیەك بەدیناکرێت:**

لەم چەشنەدا وشە و زاراوەی دژیەك بوونی نییە، بەڵکو هاوکات لەگەڵ ئەوەی گوزارشتە واتاییەکەمان مەبەستە، دژیەك بوونەکەش لە کڕی واتای هۆنراوەکەدا وەك واتا یان وێنە، یاخود بابەتێکی دژ لەگەڵ لۆژیك و نەریتی ژیانی باودا دێتەوە.

ئەمەش وەك چەشنی یەکەم دەکرێتە دوو جۆر: ناوەڕۆکی و جوانناسی

**٢-١-ب-١/ دوالیزمی دژیەکی (ناوەڕۆکی):**

لەڕاستیدا مەولانای ڕۆمی بەگشتی و بەتایبەتی لە چوارچێوەی ئەم خاڵەدا، هێندە نموونەی بەرز و چێژبەخشی هەیە (لە یەك دێڕی و چوارینە و چامە...)، کە مرۆڤ سەرسام دەکەن و دەرفەتی خستنەڕووی زۆریانمان نییە، بەڵام وەك سەرەتا و چوونە ناوەوەیەك ئەم سێ نموونەیە دەخەینەڕوو:

مەولانا لە هۆنراوەیەکیدا دەڵێ:

داد جاروبی به دستم آن نگار گفت: ك "ز دریا برانگیزان غبار"[٢٣٩]

جاروبی: گسك

---

[٢٣٩] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج١، ل٦٠٥.

واتە: ئەو نیگارە شۆخ شەنگەم گسکێکی دایە دەستم و پێی گوتم: "تۆز و خۆڵ لە دەریا هەستێنە و بەرزکەرەوە"!!

چۆن تۆز و غوبار لە دەریا بەرزدەبێتەوە؟!

لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێ:

مپرس از کشتی و دریا، بیا بنگر عجایب ها

که چندین سال من کشتی در این خشکی همی رانم[٢٤٠]

واتە: لەبارەی کەشتی و دەریاوە پرسیار مەکە و وەرە سەیری ئەوە بکە، کە مایەی سەرسوڕمانە، کە چەندین ساڵە من لەم وشکانیەدا کەشتی لێدەخوڕم.

کەشتی چۆن لە وشکانیدا دەڕوات؟!

مەبەست لەم دوو بەیتە، کە (تۆز لە دەریا هەڵسێنێ) و (لە وشکانیدا کەشتی بگێڕێ)، هەوڵدانی مرۆڤە بۆ گەیشتن بە (پەی پێ نەبراو). ئەم دوو بەیتە گەڕان و هەوڵی گەیشتن بە پلە بەرزەکانی مرۆڤی بەدوای ڕاستی گەڕاودا و بە ناخی خۆدا ڕۆچوون و لە (هونەر)دا گەیشتن بە (کەماڵ)، بیری مرۆڤ دەخەنەوە، جگە لەو کارامەییەی، کە مەولانا لە (بە وشە) نیگارکێشاندا نیشانیداوە و وێنەکانی هێندە بەرچاو و هەستپێکراون، کە لە زەین و بەردیدەی مرۆڤدا ڕۆشن و دیارن.

لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێ:

اگر یك دم بیاسایم، روان من نیاساید

من آن لحظه بیاسایم، که یك لحظه نیاسایم[٢٤١]

---

[٢٤٠] سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ل٧٣١.

واتە: ئەگەر بۆ ساتێکیش ئاسوودە بم، ئەوا ناخ و دەروونم ئاسوودە نابێت. من ئەو ساتە ئاسوودە دەبم، کە بۆ ساتێکیش ئاسوودە نەبم. ئەم بەیتەش هەر تەواوکەری دوانەکەی پێشووە بۆ مرۆڤێکی عەودالّی راستی، کە ساتێ ئارامیی دەروونیی بەخۆوە نەدیوە.

ئەمانە هەموو وێنەی دژیەك و دوالیزمی دژیەکین، لە خوێندنەوە و سەیرکردنی یەکەمدا، دژدەوەستنەوە لەگەڵ لۆژیکی باودا، بەڵام دەربڕینێکی چێژبەخشن و دوالیزمی دژیەکن لەڕووی ناوەڕۆکەوە ئەگەرچی لە ڕووکاردا وشەی دژیەك نابینرێت، هەروەها بەگشتی و بەتایبەتی دوو دێڕی یەکەم دوو وێنەی سوریالیزمی جوانیان پێکهێناوە.[٢٤٢]

لەم چوارچێوەیەدا مەولەوی تاوەگۆزیش دەڵێت:

دەفنت نە پەهلووی مەیخانە کەردەن

وە سەرخاکتدا سەبووی مەی مەڕدەن[٢٤٣]

پەهلوو: تەنیشت

سەبوو: کووپە

داوا و وەسیەتت کردووە یان ویستراوە، کە لە تەنیشت (مەیخانە)وە (قەبرت) بۆ هەڵکەنرێ و بنێژرێیت؟!

یاخود کوپەی شەراب بەسەر قەبرەکەتدا بشکێنن؟!

---

[٢٤١] سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ل٧٤٧.

[٢٤٢] دکتر سید حسین فاطمي، تصویرگری غزلیات شمس، مؤسسە انتشارات امیر کبیر – تهران، ١٣٧٨ هـ.ش. ل٢٣٧.

[٢٤٣] دیوانی مەولەوی، ل٨٢.

گۆڕهەڵکەندن لە تەنیشت مەیخانە و شکاندنی شووشەی مەی لەسەر گۆڕی کەسێك نەك تەنها لەگەڵ بەهاکانی ئایینی ئیسلامدا دژە و ئەگەر بە ڕواڵەت سەیری بکەین، دەڵێین: چۆن ئەم دەربڕینە لە کەسێکی وەك مەولەوی دەوەشێتەوە، بەڵام ئەوەی لێرەدا پێویستی بە ڕاڤەکردن هەیە، ئەوەیە، کە زاراوەی (مەیخانە) و (مەی) لە کۆی ئەدەبیاتی سۆفییەکان و عیرفانی کوردی و ئەم ناوچەیەدا ئاماژەیەکی ڕەمزییە و لە فەرهەنگی تایبەتی عارفاندا واتا و بەکارهێنانی تایبەتی خۆی هەیە، بۆ نموونە:

مەیخانە: بە پلە و مەقامی لاهوت و حەزرەتی زاتی تاك و تەنها دەڵێن، کە پیاڵە و جامی هەموو خاوەن پێگە و مەقامەکانی بوون، لە بادەی ئامادەی ئەو مەیخانەیە لێوانلێو کراوە.

مەی: مەبەست لە (تجلیات الهی)یە.

سەبوو: بەوجۆرە عیشقە دەوترێت، کە بگاتە پلەیەك، کە لە مەیخانەی یەکتاپەرستی خواییدا زاڵ ببێت بەسەر هەموو عیشقە خودییەکاندا.[٢٤٤]

تایبەتتر لەسەر ئەم بابەتە لای مەولەوی تاوەگۆزی، ئەنوەر قادر محەمەد نووسیویەتی: "مەی لە سەرجەم شیعری ڕۆژهەڵاتدا دیاردەیەکی باو بووە. شاعیرە سۆفییەکان ئەم بابەتەیان بەشێوەیەکی فراوان پەرەپێداوەو لە کۆڕی مەی و مەیخواردنەوە گەلێ ڕەمز و وێنەیان بۆ دەربڕینی بیری فەلسەفیی

---

[٢٤٤] یوگنی ادوارد ویچ بیرتلس، وەرگێڕانی بۆ فارسی: سیروس ایزدی، تصوف و ادبیات تصوف، ل١٦٥.

خۆیان نەخشاندووە، بابەتی مەی لە بەرهەمی شاعیرانی کورددا هەیە، لای مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی بە مانا سۆفییەکەی هەیە".[٢٤٥]

هەروەها دەڵێت: "هەرچەندە غەزەلی سەربەخۆ بۆ مەی، وەك بابەتێکی بەرچاو و دیار لای مەولەوی نییە، بەڵام لە زۆربەی بابەتەکانی تریدا مەی و وێنەی ساقی دیاردەیەکی بەرچاون، بۆنموونە: (٢٢) جار لە نامە شیعرییەکانیدا، (١٤) جار لە لیریکای شەخسی و (٩) جار لە لاواندنەوە و (٧) جار لە وەسفدا هەیە. جارێکیش لە سەرەتای غەزەلێکیدا پەنا بۆ ساقی دەبات. مۆتیڤی مەی و ساقی بەمانا سۆفییەکەی و لەکاتی باری ئاڵۆزی دەروونیی خۆیدا بەکاردێنێ و بەو هیوایە، کە مەی کول و کەسەری گیان و دڵی سارێژ بکات و مەست و دڵخۆشی بکات".[٢٤٦]

ئەوەی دەشێ هەر لەم ڕووەوە بوترێ، کە زۆرجاریش لە دنیای فیکر و لۆژیکدا ئاماژەی پێکراوە ئەوەیە: مرۆڤ نابێ هەر بە ڕوواڵەت حوکم لەسەر شتەکان بدات، بەڵکو هەمەلایەنە لێیان بکۆڵێتەوە، تەنانەت لەم سیاقەی ئێمەشدا شاعیرێکی دیندار، داوای ناشتنی ئازیزێکی لای (مەیخانە)دا بکا و کووپەی شەرابی بەسەردا بکرێ، دیسانەوە دەچێتەوە سەر (دوانەی دژ)، بەڵام نەك بە شێوەیەکی قووڵ و تەتەڵەکردنێکی ورد، بەڵکو هەر بە ڕوواڵەت و خوێندنەوەیەکی سەرپێی.

---

[٢٤٥] ئەنوەر قادر محەمەد، لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی سێهەم، سلێمانی، ٢٠٠٧ز. ل١٨٣.

[٢٤٦] سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٤.

**٢-١-ب-٢/ دوالیزمی دژیەکی جوانناسی**

**هەروەك جۆری دووەمی چەشنی یەکەم، دوالیزمی دژیەکی جوانناسی بەپێی لایەنەکانی ڕەوانبێژی بەشێوەیەکی گشتی و سەرەکی دابەشدەبێت بەسەر دوولایەن: - ڕوونبێژی و جوانکاری- دا.**

**٢-١-ب-٢-١/ ئەو جۆرە دوالیزمە دژیەکەی، کە لەسەر بنەمای لایەنی هونەری ڕوونبێژییە:**

**دابەشدەبێت بۆ پێنج جۆر، کە ئەمانەن:**

**٢-١-ب-٢-١-أ/ لەسەر بنەمای خواستن:**

**مەولانای ڕۆمی لە چوارچێوەی ئەم هونەرە ڕوونبێژییەدا دەڵێت:**

چندان بنالم نالەها، چندان بر آزم رنگ ها

تا بر کَنَم از آینهٔ هر مُنکر من زنگ ها

بر مَرکَبْ عشقِ تو، دل می رانَد واین مَرکَبَشْ

در هر قدم می بگـذرد، زان سوی جان فرسنگ ها

بنماتو لَعْلِ روشنت، بر کوريِ هر ظلمتي

تا بر سرِ سنگين دلان، از عرش بارد سنگ ها[٢٤٧]

**رنگ ها: ڕەنگەکان، لێرەدا مەبەست لە جۆرە جیاوازەکانی هاوارکردنە.**

**آینهٔ: ئاوێنەی دەرخەری وجود و حەقیقەتی بوونی مرۆڤ.**

**آینهٔ منکر: ئاوێنەیەك، کە پیس بووە و حەقیقەتی مرۆڤ ناداتەوە.**

---

[٢٤٧] مولانا جلالالدین محمد بلخی، کلیات شمس تبريزي، انتشارات اشـارات طلايـی، چـاپ اول، ١٣٩٠ هـ.ش. ل٨٤.

زنگ ها: واتە ژنگ ئەو دەرهاویشتەی لە ئاسن دەردێت و خراپی دەکات[٢٤٨]

لَعْلِ روشنت: واتە حیکمەت و گوتار و فەرموودەکانی، کە مایەی ڕووناکیە[٢٤٩]

واتە: هێندە بنالێنم و هاواربکەم، کە نالە و هاوارم بە چەندین ڕەنگ و جۆر دەربێت، تا لە ئاوێنەی بوونم، کە دەرئەنجامی (ژەنگ) گرتن پێوەی پیس بووە، ئەو ژەنگ و پیسیە هەڵگەنم.

دڵ، سواری کەشتی (عیشق) بووە و دەبیات، بە هەموو هەنگاوێکی چەندین ڕێگای دوور دەبڕێ بەرەو ئەولاتر و ئەودیوی گیان.

حیکمەت و گوتەکانت، کە ڕووناکیین بیان نوێنە بەڕووی هەر جۆرە کوێریەك، کە دەرئەنجامی تاریکیە، تا لە عەرشی خواوە بەرد ببارێت بەسەر ئەوانەدا، کە دڵیان وەك بەردە.

(ئاوێنە) و (ژەنگ)، هەروەها (لعل روشن) و (ظلمت)، دوالیزمی دژیەکیان دروستکردووە ئەمە جگە لەوەی (ئاوێنە) لێخواستراوە بۆ (حەقیقەتی بوونی مرۆڤ)، (ژەنگ) بۆ (گوناه و تاوان) (لعل روشن) بۆ (حیکمەت و ژیری))، (کوری ظلمت) تاریکی نەزانی، یاخود کوێری تاریکی.

بەگشتی (ئاوێنە) لە فەرهەنگی سۆفی و عارفاندا، مەبەست لە حەقیقەتی بوونی مرۆڤە، کە دەبێت وەك ئاوێنە ڕەنگدەرەوەی ئەودیوی بوونی مرۆڤ بێت، بەڵام دەرئەنجامی تاوان ژەنگ دەیگرێ دەبێتە ئاوێنەی (منكر)، کە کاری بنەڕەتی خۆی ناکات و پێویستی بە کۆششی سۆفی هەیە تا پاکی بکاتەوە.[٢٥٠]

---

[٢٤٨] حسن عمید، فرهنگ فارسی عمید، ل٦٩٣.

[٢٤٩] کریم فیضی، شعاع شمس، ل١٤٥.

[٢٥٠] سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٣.

تێبینی: مەولەوی تاوەگۆزیش ئاوێنەی وەك هەمان ڕەمز و بۆ هەمان مەبەست بەکارهێناوە، کە ئێمە ئەو هۆنراوەیەمان لەهەمان بابەت و لە هونەرێکی دیکەدا بەکارهێناوە، کە دواتر بەرچاوتان دەکەوێت.

مەولەوی تاوەگۆزیش لەم بابەتەدا دەڵێت:

وەی گشت ئایرەوە خەیاڵم خامەن

بەختم ناپوختەن فامم نەفامەن[٢٥١]

(ئایر) واتە (ئاگر)، کە مەبەست لە دوورییە واتە (خواستن)ە لەبری وشەی (دووری).

خام: کاڵ و نەبرژاو.

واتە مەولەوی دەڵێت: بەم هەموو ئاگری دوورییەوە، یاخود بەم دوورییەتەوە، کە لە ئاگر دەچێت لە ناخ و دەروونمدا، هێشتا خەیاڵاتی سەرم و خەونەکانم خەیاڵی خام و خاو و نەبرژاون، لەگەڵ بوونی ئاگرێکی زۆردا، (کاڵ) بوونی خەیاڵم؟!

لێرەدا (ئاگر) و (کاڵ)بوون دوالیزمی دژیەکن، بەڵام ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ واتە بنەڕەتیەکەی، کە (ئاگر)ی وەکو لێخواستراوێك بۆ وەرگیراوە، کە وشەی (دووری)یە لە ئازیز، ئەوا دژیەك بوونەکە نامێنێت.

تێبینی: نیوەدێڕی دووەمیش بابەتی دوالیزمی دژیەك دەگرێتە خۆی، بەڵام نیوەدێڕی یەکەم لە چوارچێوەی ئامانج و بابەتەکەی ئێمەدایە.

---

[٢٥١] دیوانی مەولەوی، ل٥٧٧.

**٢-١-ب-٢-١-ب/ لەسەر بنەمای لێچواندن:**

**مەولانای ڕۆمی بۆ ئەم بابەتەی هونەری ڕوونبێژی دەڵێت:**

ببین، که عالم دام است و آرزو دانه

به دام او مشتاب و هوای دانه مکن[٢٥٢]

**دام: داو**

**دانە: گەنم و دانی باڵندە**

**واتە: بزانە، کە ژیان و جیهان وەکو (داو) تەڵە وایە و ئارەزووی مرۆڤیش وەکو گەنم و دان و خواردنی باڵندە، کە بۆی دەخرێتە بەردەم داوەکەوە.**

**هەڵپە مەکە و ڕامەکە بەرە و داوەکە و ئارەزووی ئەو هەوەس و خواردنە مەکە.**

**لێرەدا (عالم) و (ئارەزوو)مان هەیە، کە چوێنراوە بە (داو) و (گەنم و دان)، کە ئەم دوانەی دوایی وەکو دوو لەوچوو، دوالیزمی دژیەکیان دروستکردووە (ئەم جۆرە لێچواندنە، لێچواندنی وێنە بە وێنەیە).**

**لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێ:**

باز بر آورد عشق سر به مثالِ نهنگ

**تاشکند زورق عقل به دریای عشق**[٢٥٣]

**واتە: وا جارێکیتر هەروەك نەهەنگ، عیشق سەری دەرهێنا تا لە دەریای عیشقدا کەشتی بچووکی (عەقڵ) تێکبشکێنێ.**

**(عشق) لێچووە، (نهنگ) لەوچووە.**

**(عقل) لێچوو، (زورق) بەلەمی بچووك، لەوچووە.**

---

[٢٥٢] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج٢، ل١٠٣٥.

[٢٥٣] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج١، ل٦٧٨.

لەو چووەکان، دوالیزمی دژیەکیان دروست کردووە، بەهەمانشێوە ئەم جۆرەشیان لێچواندنی وێنە بە وێنەیە.

مەولەوی تاوەگۆزیش دەڵێ:

گیای پەژموورِدەی تەژنەکەی بێ شۆم

چەمە ڕای وارای هەوری لوتفی تۆم[٢٥٤]

مەولەوی لەم هۆنراوەیەدا زۆر بەکورتی دەڵێ: من چاوەڕوانی لوتفی تۆم، کە ئەمە زۆر ئاساییە و هیچ دژیەکبوونێکی تێدا نییە، تەنها باسی کەسی (یەکەم) و (دووەم)ە واتە (من و تۆ)، بەڵام کاتێك لێچواندن دێتە ناو بابەتەکەوەو (من) دەچوێنرێت بە گیای ژاکاوی (تینوو) و (لوتفی تۆ)ش دەچوێنرێت بە (هەوری باران)، ئیتر لێرەدا دوالیزمی دژیەك، یاخود ئەوەی، کە وەك دژیەك خۆی دەنوێنێ دروست دەبێت، بەڵام ئەگەر هونەری لێچواندنەکە لابەرین و دەربڕینە ساکارەکەی سەرەتا بەکاربەرین ئەوا دژیەکبوون نامێنێ.

لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێ:

بەڵکەم شەرارەی نائیرەی فیراق

نەسۆچنۆ تەمام سەوزەی ئیشتیاق[٢٥٥]

واتە:، بەڵکو (فیراق) و دووری تۆ، کە وەکو (ئاگر) وایە، لەمە زیاتر شەوق و تاسەم بۆ بینینت، کە وەکو (سەوزایی) جوان و تەڕو پاراوە، نەسوتێنێت.

دوو لەوچووەکە، کە (ئاگر) و (سەوزایی)یە دوالیزمی دژیەکیان دروست کردووە.

---

[٢٥٤] دیوانی مەولەوی، ل٣٥١.

[٢٥٥] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٩.

**٢-١-ب-٢-١-ج/ لەسەر بنەمای وێنەی دوو ڕەهەندی (خواستن و لێچواندن):**

**لە هۆنراوەیەکیدا مەولانای ڕۆمی بۆ ئەم بابەتە دەڵێت:**

ایشان چو ما زاول خفاش بوده اند

خفاش شمس گشت از آن بخشش و عطا[٢٥٦]

**خفاش: واتە شەمشەمەکوێرە، هەروەها (لەوچووە).**

**شمس: واتە خۆر، بەڵام لێرەدا (لێخواستراوە) بۆ شێخ و پیرێکی تەریقەت، کە بە پلەی کەماڵ گەیشتووە و ڕووناکی پەخش دەکاتەوە، هەروەها ئاماژەیشە بە شێخەکەی خۆی، کە (شمس تبریز)ی یە.**

**واتە: ئەوانیش وەك ئێمە لە سەرەتادا وەك شەمشەمەکوێرە وابوون (کە توانای سەیرکردنی ڕووناکیان نەبوو و حەزیان لە تاریکی دەکرد).**

**بەڵام ئەم شەمشەمەکوێرەیە بووە (خۆر) دەرئەنجامی بەخشش و ڕووناکی بەخشینەوە.**

**کەواتە: شەمشەمەکوێرە و خۆر، کە لەهەمانکاتدا (لەوچوو) و (لێخواستراو)ن، دوالیزمی دژیەکیان دروستکردووە، ئەمە جگە لەوەی شاعیر دەڵێت: شەمشەمەکوێرە بووە خۆر! !**

**مەولەوی تاوەگۆزیش دەڵێت:**

"مەعدوومی"! کردەی بەدی هەزار تەرز

زانووی ئومێدت ناوەرۆ ئەو لەرز

ئەو کەس مزانوو سەتارەن ئارۆ

---

[٢٥٦] کلیات شمس تبریزی، ل١٤٦.

جەو بوزورگتەرەن شەو ئەو ڕۆت نارۆ
سفیدیت قەڵغان پەی ڕووی سیات بۆ
کەمانیت شەفیع تیری دیات بۆ[٢٥٧]

مەولەوی لەم سێ دێڕە هۆنراوەیەدا باسی خۆی دەکات و جگە لە جوانی دەربڕین و بوونی چەندین هونەری دەربڕین و جۆری تری دوالیزمی دژیەك، لە کۆتا نیوەدێڕی دا:

(کەمانیت) واتە چەماوەیت، کە وەکو کەمان وایە، وشەیەکی لێخواستراوە بۆ (پیری) ئەم وشەیە واتە (کەمان)، کە (لێخواستراوە) دەبێتە دوالیزمی دژیەك لەگەڵ (تیر)، کە ئەم وشەیەش (لەوچووە) و (لێچوو)ەکەی (دیات)ە واتە سەیرکردن و ڕوانینی حەرام، ئەمەش ناوەڕۆکی لەو فەرموودەی پێغەمبەر (خ) وەرگرتووە، کە دەفەرموێت: "النظرة سهمةٌ مسمومة من سهام إبليس".[٢٥٨]

کەواتە (تیر) و (کەمان) دوالیزمی دژیەکن لەو هۆنراوەیەدا، بەڵام یەکەمیان وەك لێخواستراو هاتووە و دووەمیان وەك لەوچوو، ئەگەر بە واتا بنەڕەتییەکانی خۆیان بێت، کە (ڕوانین) و (پیری)یە، ئەوا دژیەکبوون نامێنێت.

### ٢-١-ب-٢-١-د/ لەسەر بنەمای (درکە):

مەولانای ڕۆمی دەڵێت:

بربند دو چشم عیب بین را بگشار دو چشم غیب دان را[٢٥٩]

---

[٢٥٧] دیوانی مەولەوی، ل١٣٧.

[٢٥٨] فەرموودەی پێغەمبەر (خ)، مختصر صحيح البخاري، بيروت، دار نوبليس للنشر، ٢٠٠٨.

[٢٥٩] كليات شمس تبريز، ل١٢٢.

واته: هەردوو چاوەکانی سەرت، کە هەمیشە جیهانی عەیب و عار و بچووکی دەبینن (کە جیهانی ماددەیە) ببەستە.

چاو و بینایی (سیڕ) واتە ئەو چاوەی دەروون، کە نهێنییەکان دەبینێ، ئەو چاوانەت بکەرەوە (چاوی بەصیرەتیشی پێ دەوترێت).

لێرەدا چاوی (غیب دان) هەمان (دیدەی سڕ)ی مەولەوی تاوەگۆزییە، کە درکەیە – دواتر دەیهێنینەوە– لەگەڵ دوو چاوی ئاساییدا دوالیزمی دژیەکیان دروستکردووە.

لە هۆنراوەیەکی تری زۆر جواندا دەڵێ:

بشستم دست از گفتن، طهارت کردم از منطق

حوادث چون پیاپی شد وضوی توبه شکستم[٢٦٠]

واتە: دەستم شتووە لە گوتن، خۆم پاککردووەتەوە و (تارەتم) گرتووە لە (لۆژیك)، دەرئەنجامی ڕووداوی یەك لەدوای یەك دا دەستنوێژی تەوبەم شکاندووە.

(بشستم دست) دەستم شتووە، درکەیە بۆ قسەنەکردن و بێدەنگبوون، کە دژە لەگەڵ (گفتن) گوتن (طهارت کردم) خۆپاککردنەوە، لە شتی پیسە نەك (لۆژیك).

مەولەوی تاوەگۆزیش لە هۆنراوەیەکیدا و لە چوارچێوەی ئەم بابەتەدا دەڵێت:

وەر تۆ بینایت پەردەش هانە سەر

ئەوتۆ موینۆ جە تۆ زەریفتەر[٢٦١]

[٢٦٠] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج٢، ل٧٣٥.

[٢٦١] دیوانی مەولەوی، ل١٠٣.

مەولەوی دەڵێ: ئەگەر تۆ چاوەکانت پەردەی لەسەرە، ئەمەش (درکە)یە و بەو واتایە دێت، کە ئەگەر تۆ سنووری بینینت دیاری کراوە و توانای بینینی (معشوق)، واتە خوای گەورەت نییە و تەنانەت بینینی چاوەکانت هێندە سنووردارە، کە حەقیقەتی خودی خۆیشت نابینیت، ئەوا ئەو واتە خوای گەورە (معشوق) حەقیقەتی تۆ دەزانێ و دەیبینێ لە خۆت باشتر و جوانتر. دوو جۆر بینایی و بینین، کە دوالیزمی دژیەکیان دروستکردووە، یەکەمیان کورت بینە (پەردەی لەسەرە) و دووەمیان توانای بینینی خوای گەورەیە، کە هەموو شت دەبینێ.

ناوەڕۆکی ئەم هۆنراوەیە لە فەرموودەیەکی پێغەمبەر (خ) وەرگیراوە، کە دەفەرمووێت: "الأحسانُ أن تعبد الله كأنك تراه فأن لم تكن تراهُ فإنهُ يراك".[٢٦٢]

مەولەوی لە هۆنراوەیەکی دیکەدا، باسی دوو جۆر بینایی و (دیدە) دەکات، کە (دیدەی سەر) واتە چاوەکانی سەر و (دیدەی سڕ)ە واتە چاوی دڵ، یاخود چاوی (باطن)، کە چاوی (عارف بالله)یە و جیهانی نهێنی و وردەکارییەکانی پێ دەبینێ، وەکو دوالیزمی دژیەك باسیان دەکات و دوای ئەوەی (دیدەی سڕ) وەکو (درکە)یەك دەخاتەڕوو. لە دێڕەکانی تری هۆنراوەکەدا تایبەتمەندییە دژەکانیان دەخاتەڕوو، کە چەندین دوالیزمی دژیەکی تێدایە، بەڵام ئێمە تەنها مەبەستمان نیوەی یەکەمی دێڕی یەکەمە وەکوو بەڵگەیەك بۆ ئەم خاڵە و نیودێڕە دێڕەکانی تر تایبەتمەندییە جیاواز و دژەکانی ئەو دوو (دیدە)یەن.

مەولەوی دەڵێ:

دیدەی سەر ئەرشی دیدەی سڕ کافین

ئێد دای مونافین ئەو دەوای شافین

---

[٢٦٢] فەرموودەی پێغەمبەر (خ)، مختصر صحيح البخاري، بيروت، دار نوبليس للنشر، ٢٠٠٨.

ئید وەزیفەی گڵ، ئەو لەتیفەی دڵ

ئەو چوون مەنزڵەن، ئێد بێ چوون مەنزڵ

ئەو بە قاش نییەن، فەناش تاقییەن

ئێد عەتای تاقی و باقی و لاقییەن"[٢٦٣]

**واتە: ئەگەرچی چاوەکانم کوێربوون و بینایی و دیدەی سەرم نەما، بەڵام چاوی دڵم بەسە، کە هەموو نهێنییەکان دەبینێ و باشترە و گەلێ قازانجی زیاترە، لەوانە: چاوی سەر، چونکە حەرامی پێ سەیر دەکرێ وەکو دەرد و پەتا وایە، بەڵام چاوی دڵ، کە زیکری خوای پێ دەکرێ وەکو دەرمان و شیفا وایە. چاوی سەر سەیری شتی ماددی پێ دەکرێ، بەڵام چاوی دڵ خەریکی ئەرکی مەعنەوی خۆیەتی. چاوی سەر جێگای مادیاتە و ئەو شتانەیە وێنەی هەیە، بەڵام چاوی دڵ ماوا و مەنزڵی خوای بێ وێنەیە، وەك لە فەرموودەدا هاتووە: "قلب المؤمن عرشُ الرحمن"،[٢٦٤] واتە: دڵی باوەڕدار عەرشی پەروەردگارە.**

**٢-١-ب-٢-١-هـ/ لەسەر بنەمای خوازە:**

**مەولانای ڕۆمی لە هۆنراوەیەکیدا دەڵێت:**

الا ای قادر قاهر، زتن پنهان بەدل ظاهر

زهی پیدای پنهانم تورا خانە کجا باشد؟[٢٦٥]

---

[٢٦٣] دیوانی مەولەوی، ل١٥٥.

[٢٦٤] فەرموودەی پێغەمبەر (خ)، مختصر صحیح البخاری، بیروت، دار نوبلیس للنشر، ٢٠٠٨.

[٢٦٥] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج١، ل٣٧٢.

تن: واتە جەستە، بەڵام لێرەدا خوازەیە بۆ (چاو)، چونکە دەڵێ (زتن پنهان) لە جەستە شاراوە واتە لە چاو شاراوە و بە چاو نەبینراو.

بە دل ظاهر: بە دڵ ئاشکرا.

بەگشتی واتاکەی: ئەی بەتوانا و خاوەن دەسەڵات، کە لە چاوان شاراوەیت و لای دڵ ئاشکراو دیاریت.

تۆ ئەی بینراوی نادیارم، تۆ ئیتر جێگە وماڵت بۆچیە و لەکوێیە؟

جگە لەوەی نیوەدێڕی دووەم دوالیزمی لە جۆری (ترکیب) ڕۆنانی، یاخود لێکدراوی تێدایە (کە دواتر وەکو نموونە باسی دەکەین)، لە نیوەدێڕی یەکەمدا (تن) و (دل) واتە جەستە و دڵ دوالیزمی دژیەکن، چونکە (جەستە) لەوێدا خوازەیە بۆ (چاو).

مەولەوی تاوەگۆزیش دەڵێت:

ئیسە سۆچیای گەرمیی دڵسەردیم

سەودایی سارای دەردی بێ دەردیم[٢٦٦]

لە هەردوو نیوەدێڕەکەدا زۆر بەشێوەیەکی جوان و کارامە، دوالیزمی دژیەك بەکارهاتووە، بەڵام ئەو نموونەی نیوەدێڕی دووەم لەوجۆرەی دوالیزمەی دژیەکە، کە (ترکیب– ڕۆنانی)یە و لە شوێن و کاتی خۆیدا وەك نموونە باسی دەکەین.

لەم نیوەدێڕەی یەکەمدا مەولەوی دەڵێت:

ئێستا سوتاوی گەرمای دڵ ساردیم، (سوتاو)ی و (دڵ ساردی) دوالیزمی دژیەکە و لێرەدا (سوتاو) خوازەیە واتە (عاشق)، یاخود (کوژراو)ی دڵ ساردی

---

[٢٦٦] دیوانی مەولەوی، ل١٥٨.

و بێ باکی یارم، که ئەگەر بە واتا بنەڕەتیەکەی خۆی بهێنرێت ئەوا دژیەکبوون نامێنێت.

**٢-١-ب-٢-٢/ ئەو جۆرە دوالیزمە دژیەکەی، کە لەسەر بنەمای لایەنی هونەری جوانکاری واتاییە:**

دابەشدەبێت بۆ دوو جۆر، کە ئەمانەن:

**٢-١-ب-٢-٢-أ/ لەسەر بنەمای فرەواتایی (لە جۆری ئاراستە):**

مەولانای ڕۆمی لە هۆنراوەیەکیدا دەڵێت:

بی خط و بی خال تو این عقل أمّی بُود

چون ببیند آن خطت را، می شود خط خوان چرا؟[٢٦٧]

واتە: بەبێ خەت و خاڵی تۆ، ئەم عەقڵە نەخوێندەوارە، کاتێك، کە خەتی تۆ دەبینێ خێرا دەبێتە (خوێندەوار) خەت خوێنەوە، بۆچی؟

(خط و خال) واتە خەتوخاڵ بە دوو واتا هاتووە، یەکێکیان بە واتای نووسین و خەتی نووسین و سەروبۆر و خاڵبەندی نووسین، دووەمیان بە واتای خاڵی دەموچاو و خەتی مووی (برۆ) یان دەموچاو، کە بەگشتی بە جوانی دەمووچاو دەوترێ خەتوخاڵ.

لێرەدا ئەگەر بە واتای (نووسین)ەکە بێت لەگەڵ نەخوێندەواردا دوالیزمی دژیەکی دروستکردووە.

لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێ:

---

[٢٦٧] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج١، ل٢٢٤.

شطرنج ندیده ایم و ماتیم

یك جرعه نخورده ایم و مستیم[٢٦٨]

واتە: ئێمە یاری و كێبەركێ و ململانێی (شەترەنج)مان نەدیوەو كەچی (مات) بووین، مردووین، قومێك شەرابمان نەخواردووەتەوە و كەچی مەست بووین! !

(مات): بە واتای قۆناغێك لە یاری شەترەنج دێت و بە واتای (مردن)ی هێز و ئیرادەش دێت، كە توانای ململانێی نییە.

بەگشتی دەربڕینەكە دوو وێنە و دەربڕینی دوالیزمی دژیەكی زۆر جوانی تێدایە، كە یاری شەترەنجمان نەكردووە و مات بووین، هەروەها نەمانخواردووەتەوە و مەست بووین.

بەڵام ئەوەی ئامانجی ئێمەیە لەم حاڵەدا (مات) بوونەكەیە، كە دوو واتای هەیە.

هەروەها مەولەوی تاوەگۆزیش لەم بارەیەوە دەڵێت:

خەڵاسیش دا پێت وە یەك پەیمانە

ئازاد بیت جە بەند بەستەی پەیمانە[٢٦٩]

(خەڵاس بوون) واتە (ڕزگاربوون)، كە لێرەدا بە واتای (مردن)یش دێت. واتە ئەوە وشە فرەواتاكەیە، كە بە واتای (ڕزگاربوون) و (مردن)یش دێت، ئەم وشەیە لەگەڵ (بەستە) و تەنانەت (بەند)یش دا دوالیزمی دژیەكی دروستكردووە، بەڵام ئەگەر وشە فرەواتاكە بە مانای مردن بێت ئەوا دوالیزمی دژیەك نامێنێت.

---

[٢٦٨] سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ل٨٢٥.

[٢٦٩] دیوانی مەولەوی، ل٨١.

مەولەوی دەڵێت: بە پیاڵەی شەرابی مەرگ ڕزگاری کردی و لە بەندی پەیمانی لەگەڵ خوادا بەسراوی، ئازادی کردی، کە دەبوو بەپێی ئەمر و نەهی ئەو بجووڵێیتەوە.

**٢-١-ب-٢-٢-ب/ لەسەر بنەمای ڕۆچوون:**

**لەم بارەیەوە مەولانای ڕۆمی دەڵێت:**

هرچند پرستیدن بُت مایهٔ کفر است

ما کافر عشقیم گر این بُت نپرستیم [٢٧٠]

واتە: هەرچەندە پەرەستنی (بت) مایەی کافربوونە، بەڵام ئێمە دەبینە کافری عیشق ئەگەر ئەم بتە نەپەرستین.

لە نیوەدێڕی یەکەمدا ڕاستی و واقیعێکی بەڵگەنەویستمان پێ دەڵێت، کە پاش هاتنی ئیسلام پەرەستشی بتەکان مایەی کافربوونە. لێرەدا بیرمان نەچێت، کە کافرەکان دەیانوت ئێمە بتەکان ناپەرستین، بەڵکو تەنها هۆکارێکن بۆ نزیکبوونەوە لە خوا. لە جیهانی عارف و سۆفییەکاندا، کە خۆیان بە (عاشق) و (خوا) بە (معشوق) دەزانن و شێخ و پیرەکانیشیان بە خۆشەویستی تایبەتی خوا دەزانن و (واتە شێخەکانیان) دەیانکەنە هۆکارێك بۆ شەفاعەت و نزیکبوونەوە لە خوا و ئەمەش بەگشتی بە (طریقەت) دەزانرێ. واتە ڕێگایەك، کە ڕێگای عیشقە، کەسی عاشق دەیبڕێ بۆ گەیشتن بە (مَعشوق) بەهۆی شێخان و عارفان و خۆشەویستانی تایبەت و نزیك لە خواوە، ئەم حاڵەتەی (ئەهلی طریقەت) لای (ئەهلی شەریعەت) زۆر جێگای ناڕەزایەتی و دژایەتی کردنەو بەجۆرێك، کە بە بتپەرستی دەچوێنرێت.

---

[٢٧٠] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، چ٢، ل٧٧٢.

مەولانای ڕۆمیش بە حوکمی ئەوەی خۆی سەرەتا زانایەکی شەریعەتزان بووە، دواتر بووەتە عارف و سۆفی و عاشقی (بتی عیشق) بووە، کە (شمس تبریز)یە ئەم هاوکێشە و قەناعەتەی خۆی بەشێوەی ڕۆچوون لە خۆشەویستی بۆ شێخەکەی دەربڕیوە، کە ئەگەر وەك بت نەیپەرستێ کافر دەبێت! ؟.

هەروەها لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێ:

ای روز ز روی تو، شب سایه ٔ موی تو

چون ماه برآ امشب، ای طالع و فالت خوش[٢٧١]

واتە: ئەی ئەوکەسەی، کە ڕۆژ ڕووناکی لەتۆوەیە، هەروەها شەو و تاریکی و ڕەشی لە سێبەری قژ و پرچە ڕەشەکانی تۆوەیە.

ئەمشەو وەك مانگ دەرکەوە، ئەی ئەوکەسەی دەرکەوتن و ئاوابوونیشت خۆشە.

مەولانا لە وەسفی کەسێکدا زۆر ڕۆدەچێت بە جۆرێك، کە دەڵێ: ڕووناکی ڕۆژ لەتۆوەیە، ڕەشی و تاریکی شەو لە قژی تۆوەیە.

لەم دوو نموونەیەدا دوالیزمی دژ بۆ ڕەنگ و سێبەرکردنی شیعرەکە بەواتای قووڵ و بۆ سەرنجی خوێنەر ڕاکێشان، سەرسوڕهێنان و هاندانی بۆ بیرکردنەوە و گەڕان لە واتای جوان، مەولانا دوو دژی زۆر ئاشکرا و حاشاهەڵنەگری کۆکردۆتەوە و لەسەر بنەمایان شیعرەکەی داڕشتووە، مەبەستمان لە (کوفر و ئیمان) و (شەو و ڕۆژ)ە، کە هەردووکیان دەشێ ئەگەر بە ڕەنگ ئاماژەیان بۆ بکەین دەبنە (ڕەش × سپی) و لە گەلێ سەرچاوەی ئایینی و کولتووریشدا ئەم دژە هەیە.

---

[٢٧١] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج١، ل٦٤٥.

مەولەوی تاوەگۆزیش لەم بارەیەوە دەڵێت:

پەی چێش مەیلی لەیل پیریش مەحاڵەن؟

سەنەی باڵغیش سەد هەزارساڵەن؟[٢٧٢]

سەنە: ساڵ

واتە:، چونکە خۆشەویستی لەیل پیری هەڵناگرێ و مرۆڤی دڵدار تا دێرزەمان هەر بە منداڵی دەمێنێتەوە و تەمەنی باڵغبوونی عەشق سەد هەزار ساڵە؟!

چۆن تەمەنی باڵغبوون سەد هەزار ساڵە؟! ئەمە ڕۆچوونە و پێچەوانەی لۆژیکی، یاخود سروشتی ژیانە و ئەم گوزارشتە لەڕووی واتاوە دوالیزمی دژیەکە لەگەڵ ڕاستی و نەریتی ژیاندا.

لێرەدا مەولەوی بۆئەوەی خۆشەویستی ڕاستەقینە و حەقیقی دەرخات، پەنای بردۆتە بەر ئەم هونەرە ڕەوانبێژییە و بەهۆیەوە (عەشق)ی بە چەمکی نەمری – ئەبەدییەتەوە– بەستۆتەوە، چونکە نەباڵغبوون (سەد هەزار ساڵە) و نە عەشقی دنیاییش ئەو تەمەنە درێژەی هەیە.. کەواتە دژیەکییەکە، کە جوانکاریی فرەواتاییە، هاتۆتەدی.

دوای ئەوەی لە جۆری یەکەمی دوالیزمی دژیەك – دەربڕینی واتایی، بە هەردوو لقەکەیەوە: ئەوەی لە ڕووکاری دەرەکیدا دژیەك هەیە و ئەوی تریشیان، کە لە ڕووکاریدا دژایەتی نییە، بە هەردوو چڵی تریانەوە بۆ هەریەکیان: ١. ناوەڕۆکی و ٢. جوانناسی. دوایی دێینە سەر (پێکهاتەی لێکدراو) و بە درێژیش لەم لاپەڕانەی دواتردا بەهەمان دابەشکردن دەدوێین.

---

[٢٧٢] دیوانی مەولەوی، ل١٠٧.

**٢-٢/ دوالیزمی دژیەك بە شێوازی لێكدراو، یاخود ڕۆنان:**

لەم هونەرەی ڕوونبێژیدا دوو دیو، یاخود دوو ڕووی یەك پێكهاتەی لێكدراو لەڕووی چەمكەوە دژیەكبوون دروستدەكەن و وەك دوو دژ یەكتری ڕەتدەكەنەوە و دەرئەنجام دوالیزمی دژیەك پێكدەهێنن لە پێكهاتەیەكی كورتی لێكدراودا، كە دەربڕینێكی كورت و جوان و سەرنجڕاكێش و چێژبەخش دەبێت.[٢٧٣]

وەكو لە زمانی فارسییدا: (خامش گویا، غریب وطن، جرم بی گناهی).

لە كوردیشدا: (دەردی بێ دەردی، دەسەڵاتداری بێ توانا، زانای نەزان).

لەم پێكهاتانەدا، كە خراونەتە سەر یەكتری، لەڕووی چەمكەوە دژیەك بوونێكی پێكەوە نەگونجانی تێدایە، كە ئەم شێوازە دەربڕینە ئەگەر لە لۆژیكدا ناڕاست و نەگونجاو بێت، بەڵام لە هونەردا لە ترۆپكی بەرزی و جوانیدایە.[٢٧٤]

ئەم جۆرە هونەر و بەكارهێنانە بەشێوەیەكی كارامە و بەرفراوان لای هەردوو شاعیر (مەولانای ڕۆمی) و (مەولەوی تاوەگۆزی) بەدیار دەكەوێت:

بۆ نموونە مەولانای ڕۆمی دەڵێت:

كفرِ من آیینهٔ ایمانِ توست

بنگر اندر كفر ایمان ای پسر

می زنم من نعرەها در خامُشی

آمدم خاموشِ گویان ای پسر[٢٧٥]

---

[٢٧٣] محمد رضا شفیعی كدكنی، شاعر آینەها، (بررسی سبك هنری و شعر بیدل)، كتاب گزیدە، چاپ ششم، ١٣٦٦ هـ.ش. ل٥٤.

[٢٧٤] محمد رضا شفیعی كدكنی، موسیقی شعر ل٣٧.

مەولەوی تاوەگۆزیش دەڵێت:

ئیسە سۆچیای گەرمیی دڵ سەر دیم

سەودایی سارای دەردی بێ دەردیم[٢٧٦]

دوالیزمی دژیەکی لێکدراو، یاخود (ڕۆنان)یش دوو چەشنە:

٢-٢-أ/ ئەو پێکهاتە و ڕۆنانەی، کە لە پێکهاتەی ڕووکاریاندا دژیەك بەدیدەکرێت:

ئەم چەشنە لە دوالیزمی دژیەکیش دەکرێتە دوو جۆر: ناوەڕۆکی و جوانناسی.

٢-٢-أ-١/ دوالیزمی دژیەکی ناوەڕۆکی:

دەگوترێت "تعرفُ الأشياء باضدادها" واتە شتەکان، یاخود هەر شتێك بە دژەکەیدا دەناسرێتەوە، بۆنموونە ئەگەر (گەرما و گەرمی) نەبێت پەی بە (سەرما و ساردی) نابرێت، یاخود ئەگەر (زانین و زانا) نەبێت پەی بە (نەزانین و نەزان) نابرێت.

دیارە ئەم بۆچوون و تێگەیشتنە لە زمانەوانیی تازەدا، بە جەوهەری سیستێمی زمان دادەنرێت، کە پێیوایە مانا لە جیاوازی (difference)ەوە دێتە ئارا و دژیەکیش بەشێکی گرنگی ئەم ڕوانگە زمانەوانییە پێکدێنێ.

لێرەدا بە هێنانەوەی چەند نموونەیەکی شیعری و شیکارییان دەستپێدەکەین، کە سەرەتا لەم بارەیەوە مەولانای ڕۆمی دەڵێت:

---

[٢٧٥] غزليات شمس تبريز، گزينش و تفسير محمد رضا شفيعى كدكنى، ج١، ل٦٠٩.

[٢٧٦] دیوانی مەولەوی، ل١٥٨.

مرا گوید: "مرو هر سو، تو استادی، بیا این سو."

که من آن سوی بی سو را نمی دانم نمی دانم

همی گیرد گریبانم، همی دارد پریشانم

من این خوش خوی بدخو را نمی دانم نمی دانم[٢٧٧]

واتە: بە من دەڵێت: "بە هەرلایەکدا مەڕۆ، تۆ کارامە و شارەزای، وەرە ئێرە"

من ئەولا بێ لایە، یاخود شوێنە بێ شوێنە نازانم نازانم

بەردەوام یەخەم دەگرێ و پەرێشانمە

من لەم جوان ڕەفتاری بەدڕەفتارە نازانم نازانم

لێرەدا (سوی بی سو) واتە لای بێ لا و (خوش خوی بد خو) جوان ڕەفتاری بەدڕەفتار، دوالیزمی دژیەکن.

لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێت:

هله، تا دُوی نباشد، کهن و نوی نباشد

که در این مَقامِ عِشرت من از آنِ جمع فردم[٢٧٨]

واتە: بێگومان، تا دوالیزمبوونی نەبێت، کۆن و نوێ بوونی نییە.

هەر لەم پێگەی پێکەوە بوونەوەیە، کە من کۆی تاکم.

(کۆی تاك) دوالیزمی دژیەکە.

مەولەوی تاوەگۆزیش لە چوارچێوەی ئەم هونەرەدا دەڵێت:

هەرکەسێ دانش نەفامش نە بۆ

بینیی عیرفانشن زو کامش نە بۆ[٢٧٩]

---

[٢٧٧] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، چ٢، ل٧٤٨.

[٢٧٨] سەرچاوەی پێشوو، چ٢، ل٨٢٥.

مەولەوی لە نیوە بەیتی یەکەمدا (کە مەبەست و ئامانجی ئێمەیە) دەڵێت:

هەرکەسێك زانین و مەعریفەی نەزانی نەبێت، یاخود عەقڵ و هۆشی نەفام و بێ عەقڵانی نەبێت، ئەمەش نالۆژیکیە بە پێوەری ئاسایی بیرکردنەوە، بەڵام لە هونەردا جوانییە و دوالیزمی دژیەکە.

لە فەرهەنگی ڕۆشنبیری عارف و ئەهلی تەسەوفدا جۆرێك لە نەفرەتکردنی (عەقڵ) هەیە، کە سەرچاوەی زانستی عەقڵی و فەلسەفیە، بەڵام عارفەکان (دڵ) بە سەرچاوەی وەرگرتنی زانین دەزانن و لەو پێناوەشدا بۆئەوەی (دڵ) کارا بێ دەبێت (عەقڵ) جیهانی موجادەلە و مشتومڕی لۆژیکیانە بەجێبهێڵێت. هەربۆیە هەنگاوی یەکەمی، یاخود مەقام و پلەی یەکەمی عارفبوون دەرچوونە لە جیهانی عەقڵانی بوون و تەسلیم بوونە بە دۆگما.

لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێ:

سەرد بییەن گەرمی شەوقی هام فەردان

گەرمەن سەردی زەوق جەرگەی هام دەردان[280]

لە نیوەبەیتی یەکەمدا (سارد) بووەتەوە (گەرمی) ⟵ (شەوق)

لە نیوەبەیتی دووەمدا (گەرمە) (سارد)ی ⟵ (زەوق)

هەردووکیان دوالیزمی دژیەکن.

نموونەی شیعریی هەردوو شاعیر دەریدەخەن، کە پڕاوپڕ لەگەڵ ئەم چەمکە هونەرییەی دوالیزمی دژدا ڕێکدەکەون.

---

[279] دیوانی مەولەوی، ل٥٢٦.

[280] سەرچاوەی پێشوو، ل٩٧.

**٢-٢-أ-٢/ دوالیزمی دژیەکی جوانناسی:**

هەروەك ڕابردوو دوالیزمی دژیەك جوانناسی بەپێی لایەنەکانی ڕەوانبێژی بەشێوەیەکی گشتی و سەرەکی دابەش دەبێت بەسەر دوو لایەنی: ڕوونبێژی و جوانکاریدا. ئەو جۆرەش لە دوالیزمی دژیەك، کە لەسەر بنەمای لایەنی هونەری ڕوونبێژییە، دابەش دەبێت بۆ چوار جۆر، کە ئەمانەن:

**٢-٢-أ-٢-١-أ/ لەسەر بنەمای خواستن:**

مەولانای ڕۆمی لەم جۆرە و لە چوارچێوەی ئەم بنەمای هونەری دەربڕینەدا دەڵێت:

سایە نوری تو و ما، جملە جهان سایە تو

نورکە دیدەاست، کە او باشد از سایە جدا؟

گاە بود پهلوی او، گاە شود محو در او

پهلوی او هست خدا، محودر او هست لقا

سایە زدە دست طلب، سخت در آن نورعجب

تاچو بکاهد، بکشد نور خدای شبە خدا[٢٨١]

سایە نور: واتە سێبەری ڕووناکی، سێبەر جۆرێکە لە ناڕووناکی و پلەیەکە لەنێوان ڕووناکی و تاریکی، کە پاش هەڵهاتنی ڕووناکی، تاریکی و سێبەرەکان ڕووناك دەبنەوە، بەڵام لەدوا سنووری ڕووناکیدا سێبەر دروست دەکات، بەڵام دەستەواژەی سێبەری ڕووناك، یاخود ڕووناکی، دوالیزمی دژیەکی دروستکردووە و هەروەها لێرەدا (نور) لێخواستراوە و لەبری (خودا) هاتووە.

---

[٢٨١] کلیات شمس تبریز، ل٩٣.

بەگشتی مەولانا ڕوو بەشێخەکەی شمس تەبریزی دەڵێت:

هەر بەو شێوازەی تۆ سێبەری خودایت، ئێمەش سێبەری تۆین، تۆ (شمس)یت و پەیوەستی بە خوداوە و ئێمەش لەتۆ جیانین، هەروەك سۆفییەکان دەڵێن: "المتصل الی المتصل، الی متصل، متصلٌ" واتە گەیشتوو بە گەیشتوو بە گەیشتووە گەیشتووە.

هەندێکجار (عاشق) لە کەنار (معشوقە)وەیە و هەندێکجاریش لەودا (محو)ە واتە دەتوێتەوە، کە هەردووکیان گرنگن، چونکە لە تەنیشت ئەوبوون باس و زیکری ئەوە و باسی بەیەك گەیشتنە، بەڵام (محو)بوون خودی بەیەکگەیشتنە.

لە دوادێڕیدا دەڵێت: سێبەر، کە درێژ دەبێتەوە بۆلای نور و ڕووناکی و خواستی ئەوەی هەیە، کە ببێتە ڕووناکی و دوعا دەکات لە سێبەربوون دەرچێت و ببێتە ڕووناکی.[٢٨٢]

تێبینی: مەولەوی تاوەگۆزی بۆ هەمان بابەت و بەهەمان زاراوە و دەربڕین هۆنراوەیەکی هەیە، کە دەڵێ:

ئەی گرد مەوجوودێ جە تۆ گرت مایە- مەوجوود هەر تۆنی، ماسیوا سایە[٢٨٣].

مەولانای ڕۆمی لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێ:

دَی را بهار بخشد، شب را نهار بخشد
پس این جهان مرده زندەست از آن جهانش[٢٨٤]

---

[٢٨٢] کریم فیضی، شعاع شمس، ل٢٣٦.

[٢٨٣] دیوانی مەولەوی، ل٦٠.

[٢٨٤] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج١، ل٦٦٣.

واتە: مانگی (دی)، کە چلەی زستانە، بەهار دێنێ، هەروەها ڕۆژی بەخشیوەتە شەو کەواتە ئەم جیهانە مردووی زیندووە لەجیهانێکی دیکەدا.

(مردە زندە) مردووی زیندوو، دوو وشەی لێکدراوە، کە دوالیزمی دژیەکی دروستکردووە.

تێبینی: هەمان دەربڕین لەو هۆنراوەی مەولەوی تاوەگۆزی دا بەکارهاتووە، کە دواتر لەهەمان خاڵ و بنەمای هونەری دا بەکاریدەهێنین پاش ئەم نموونەی مەولانای ڕۆمی.

مەولەوی تاوەگۆزیش دەڵێت:

تۆ مەردەی شەهید زیندەی بێ باکی

من زیندەی مەردەی دەشتی خەمناکی[٢٨٥]

(زیندەی مەردە) واتە (زیندووی مردوو)، لێرەدا وشەی (مردوو) (خواستن)ە بۆ مرۆڤێك، کە هیچ لە توانایدا نییە و بێ جوڵە و بێدەسەڵاتە لەسارا و دەشتی خەمناکیدا. ئەم دوو وشەیە واتە (زیندووی مردوو) پێکهاتەیەکیان دروستکردووە، کە دوالیزمی دژیەکە، بەڵام ئەگەر وشەی خواستن واتە مردووەکە بگێڕینەوە بۆ بنەڕەتەکەی خۆی ئەوا دوالیزمی دژیەك نامێنێت.

مەولەوی دەڵێ: تۆ مردوویەکی شەهیدیت لەبەر ئەوە زیندووی و ترست نییە، بەڵام منیش، کە ماوم و بەسەر زیندووم، مردووی دەشتی خەمباری و بێ دەسەڵاتی و داماویم.

---

[٢٨٥] دیوانی مەولەوی، ل١٦٥.

**٢-٢-أ-٢-١-ب/ لەسەر بنەمای لێچواندن:**

**لە چوارچێوەی بنەمای لێچواندندا مەولانای ڕۆمی دەڵێت:**

مرا آن صورت غیبی، به ابرو، نکته می گوید

که غمزەی چشم و ابرو رانمی دانم نمی دانم[٢٨٦]

**صورت: واتە (ڕووخسار) شکڵ، بۆ بوونێکی ماددی (محسوس)ی بینراو دەبێت.**

**غیبی: واتە نەبینراو، شاراوە نا (محسوس).**

**لێرەدا (صورت) و (غیبی) دوو وشەی لێکدراوە، کە دوالیزمی دژیەکیان دروستکردووە هەوڵدراوە (غیبی) شتێکی نەبینراو بە (محسوس) و شتێکی بینراو بچوێنرێت، کە (صورت)ە واتە (ڕووخسار)ە.**

**واتە: ئەو، کە ڕووخسارێکی نەبینراو و (غەیبی) هەیە، بە برۆکانی نوکتە دەگێڕێتەوە، کە من لەغەمزەی ئەم جۆرە چاو و برۆیە حاڵی نابم و نازانم.**

**تێبینی: هەر لەم نموونە، یاخود خاڵەدا، لە نموونەی شیعری مەولەوی تاوەگۆزی دا ئەو هۆنراوەی، کە بە نموونە هێناومانەتەوە لەم جۆرە دەربڕینەی تێدایە، بەڵام بەو جیاوازیەی، کە مەولەوی تاوەگۆزی دەڵێت: (چهرەی خەیاڵ) واتە لەبری نەبینراو (غەیبی) وشەی خەیاڵی بەکارهێناوە.**

**لە هۆنراوەیەکی دیکەدا مەولانای ڕۆمی دەڵێت:**

آتش در آب گشته نهان وقتِ جوشِ آب

چون آب آتش آمد، الغوث زاتشان[٢٨٧]

---

[٢٨٦] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج٢، ل٧٤٨.

[٢٨٧] سەرچاوەی پێشوو، ج١، ل١٠٢٥.

واتە: ئاگر لەناو ئاودا خۆی حەشارداوە، کاتێك، کە ئاو گەرم بووە و دەکوڵێ ئەو کاتەی ئاو وەك ئاگری لێدێت، هاوار بۆ مرۆڤەکان دەکات.

(ئاو) وەکو (ئاگری) لێدێت دوالیزمی دژیەکە و (ئاگر) لێرەدا لەو چووە و ئاو بە ئاگر چوێنراوە.

هەروەها مەولەوی تاوەگۆزیش دەڵێت:

چون چیهرەی خەیاڵ ڕووخسارەکەی وێش

نە تۆی پەردەی دڵ "مەعدومی"ی دڵڕێش[٢٨٨]

چیهرە: واتە (ڕوو) (ڕووخسار) بۆ بوونێکی ماددی (محسوس) دەبێت، بەڵام (خەیاڵ) خۆی بوونێکی ماددی نییە و (محسوس) نییە، بە واتایەکی تر (چیهرە) و (خەیاڵ) وەکو دوو بوونی (محسوس) و نا (محسوس) دوالیزمێکی دژیەکیان دروستکردووە و (خەیاڵ) چوێنراوە بە شتێك، کە ڕووخساری هەبێت، بۆیە (چیهرەی خەیاڵ) دوالیزمی دژیەکە.

ئەگەر وشەی (چیهرە) بگۆڕین ئەوا دوالیزمی دژیەك نامێنێ.

لەهەمانکاتدا مەولەوی وێنەی نازدارەکەی، کە ڕووخساری خۆیەتی (ڕووخساری وێش) بەرامبەر و بەراورد دەکات لەگەڵ (ڕووی خەیاڵ) خۆشەویستەکەی لە زەین و خەیاڵدایە و وێنەکەی زەینی خۆی بە جوانتر دەزانێت. ئەمە تێکەڵکردنی ئەو هەست و چێژەیە، کە دڵدارێك ئێزافەی جوانییە هەستپێکراوەکەی دەکات، هەمیشە کەسێك مەیلی بۆ هەر جوانییەك هەبێت و هۆگری ببێ، مەودای جۆراوجۆر دەدا بەو جوانییە،... چونکە لە دڵ و دەروونیدا سەرەڕای جوانییە

---

[٢٨٨] دیوانی مەولەوی، ل٢١٤.

هەستپێکراوەکەی ڕووخساری یار، ئەزموونی نزیکیی و تاسەی دڵدارەکەشی بووەتە پارسەنگێکی زیادە و دیار، ئەمەش لە زەینی کەسەکە، یاخود شاعیردایە.

**٢-٢-أ-٢-١-ج/ لەسەر بنەمای درکە:**

**لەم بارەیەوە مەولانای ڕۆمی لە هۆنراوەیەکیدا دەڵێت:**

در نقش بی نقشی ببین، هر نقش را صد رنگ و بو

در برگ بی برگی نگر هر شاخ را باغ ارم[٢٨٩]

واتە: لە نەخش و ڕازاوەییدا بێ نەخشی ببینە، کە هەر نەخشێك سەد ڕەنگ و بۆنی هەیە لە بەرگی بێ بەرگی بڕوانە، کە هەر شاخێکە بووەتە دەشت و باخی ئیرەم.

بێ بەرگی: لە فەرهەنگی سۆفی و عارفاندا بەواتای خۆداڕنینە لە هەموو بەرگێکی دونیایی و خۆیەکلاکردنەوەیە بۆ خوای گەورە.[٢٩٠]

واتە (بێ بەرگی) درکەیە بۆ ئەو مەبەستە، بەڵام بەرگی بێ بەرگی، دوو وشەی لێکدراوە، کە دوالیزمی دژیەکی دروستکردووە.

مەولانا لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێت:

خشم شکلی، صلح جانی، تلخ روی، شکّری

من بدین خویشی ندیدم در جهان بیگانه‌ای[٢٩١]

---

[٢٨٩] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمّد رضا شفیعی کدکنی، ج٢، ل٧١٤.

[٢٩٠] سەرچاوەی پێشوو.

[٢٩١] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج٢، ل١٢٦٨.

**واتە: لە ڕووخساردا تووڕەیت و گیانت پڕە لە ئاشتی، ڕوو تاڵی و شەکری، من لە جیهاندا ئاوا بێگانەیەکی ئاشنا و ناسراوم نەدیوە ! !**

**تلخ روی: واتە دەموچاو تاڵ، یاخود ڕوو تاڵ، کە (درکە)یە بۆ تووڕەیی، ئەم وشەیە دوالیزمی دژیەکی دروستکردووە لەگەڵ (شکری) واتە شەکری و شیرینی و خۆشەویستی.**

**مەولانا لە هۆنراوەیەکی هاوشێوەی یەکەمدا دەڵێ:**

رنگ بی رنگی ست، از رخسار عاشق آن صفا

آن وفا و آن صفا و لطف خوش رخسار تو؟[٢٩٢]

**واتە: ڕەنگی بێ ڕەنگیە (واتە سپی ڕەنگ) بە ڕووخساری عاشقەوە، کە ئاوا سەفای هەیە، کوانێ ئەو وەفاداری بە سەفای ڕووخسار جوان؟**

**(بی رنگی) درکەیە بۆ (سپیەتی) و مانەوە و پایەداری لەسەر یەك جۆر.[٢٩٣]**

**تێبینی: هەمان دەستەواژەی (بی ڕەنگی) لای مەولەوی تاوەگۆزی بەکارهاتووە، کە لەسەر بنەمای درکە لە دوا هونەری ئەم بابەتەدا وەکو نموونە باسمانکردووە، کە دەڵێ:**

بولبولێ گوڵشەن بی نام و نەنگی تە زەرووی سەرسەر و باغچەی بێ ڕەنگی[٢٩٤]

**هەروەها مەولەوی تاوەگۆزی لە هۆنراوەیەکی تریدا دەڵێت:**

وادەی سفیدی شکۆفەی پیرین

شکۆفەی باخچەی پیری دڵگیرین[٢٩٥]

---

[٢٩٢] **سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٩٨.**

[٢٩٣] **احمد گلی، متناقض نمایی در شعر صائب، ل١٤١.**

[٢٩٤] **دیوانی مەولەوی، ل١٠٤.**

شكۆفه: چرۆ، گۆپكەی درەخت، كە تازە پشكووتبێ.

شكۆفه: دركەیە بۆ هەموو دەسپێكی تەمەنی ڕووەكێك لە گوڵی دار، یاخود هەر گوڵی ئاسایی و گوڵی میوەكان.

گرنگ ئەوەیە بە بیستنی وشەی (شكۆفه) سەرەتا و دەسپێكی ژیانی بوونەوەرێكمان لە زەین و خەیاڵدا بۆ دروست دەبێ، كە دەتوانین بە سەرەتای ژیان و لەدایكبوونی سەرەتایی ناوزەدی بكەین، بەڵام، كە دەڵێین (شكۆفەی پیری) وەك ئەوە وایە بڵێین منداڵی پیری، بەڵام لێرەدا (دركە)یە بۆ دەستپێكی پیری.

واتە: كاتی سپی بوونی مووەكانی سەرم و پشكووتوویی داری پیرییە و ئەو گۆپكە پشكووتووەی باخچەی پیری مایەی دڵگیری و خەفەتبارییە. ئەمەش نموونەیەكی دانسقەی شیعرییە، كە مەولەوی نەخشاندوویەتی و چەمكی دوالیزمی دژی بە هونەری دركە ئەفراندووە.

٢-٢-أ-٢-١-د/ لەسەر بنەمای خوازە:

مەولانای ڕۆمی لە چوارچێوەی بنەمای خوازەدا دەڵێت:

عاشق خموش خوش تر، دریا به جوش خوش تر

ضون آینەست خوش تر، در خامُشی بیان ها

خامُشی: بێدەنگی

بیان ها: دەربڕینەكان، گوتنەكان

---

[٢٩٥] سەرچاوەی پێشوو، ل٥٠٧.

مەولانا لەو هۆنراوەیەدا دەڵێت: عاشقی بێدەنگ باشتر و خۆشترە هەروەك چۆن دەریاش لە ناخەوە جۆش و خرۆشی بێت خۆشترە. لە بێدەنگیدا جۆرە دەربڕینێك هەیە و هێندە بەهێزە، کە هەروەك ڕوونی و جوانی نیشاندانی ناو ئاوێنە وایە.

(خامُشی) لەم هۆنراوەیەدا خوازراوە بۆ حاڵەتی زیکر و فیکری دەروونی سۆفی، کە لەلای سۆفییەکان بیرکردنەوە لە ناخ و خود و زیکرکردن، بەهێزترینی دەربڕینەکانی مرۆڤە پەی بە نهێنییەکانی بوون دەبات.

(خامُشی) و (بیان ها) واتە (بێدەنگی) و (دەربڕین)، یاخود (دەربڕینەکان) دوالیزمی دژیەکی لێکدراوە، بەڵام وەکو ئاماژەمان پێدا (خامُشی) وەکو وشەیەکی خوازرا و هاتووە و لە حاڵەتێکدا ئەگەر وشە بنەڕەتیەکە بهاتایە، کە زیکر و فیکرە ئەوا بێگومان لەونێوانەدا دوالیزمی دژیەکی تێدا نەبێت[٢٩٦].

مەولەوی تاوەگۆزیش لە چوارچێوەی بەکارهێنانی هونەری خوازەدا دەڵێت:

شابی شێخی عەشق یەکتای فەردم ڕۆ

وە ناکام مەردەی دڵ پڕ دەردم ڕۆ[٢٩٧]

شابی: واتە (لاوی)

شێخ: واتا بنەڕەتی و فەرهەنگیەکەی واتە (پیر) پێچەوانە و دژی لاو.

(شابی شێخ) واتە لاوی پیر!، کە ئەمەش دوالیزمی دژیەکە، چونکە لەڕووی واقیع و لۆژیکەوە ناگونجێ لاو و پیریش بێت، بەڵام لێرەدا (شێخ) (خوازە)یە بۆ پێشڕەوی عارفان و تەریقەت، چونکە دەڵێ شێخی عەشق.

---

[٢٩٦] مولانا جلالالدین محمد بلخی، کلیات شمس تبریزي، ل١٤٤.

[٢٩٧] دیوانی مەولەوی، ل٣٢٦.

بەوجۆرە بۆمان ڕووندەبێتەوە، کە پێشڕەوی ڕێبازی عیرفان و جیهانی عەشق و دڵی مەبەستە و ئەگەر لەبری وشە خوازراوەکە وشە بنەڕەتییەکە بێت، کە پێشەوا و پێشڕەوە، ئەوا هیچ دژبوونێك نامێنێت.

واتای دێڕە هۆنراوەکە دەڵێ: لاوە بێ هاوتاکەم ڕۆ، کە پێشەوابوو لە ڕێبازی عەشقی خوایی دا.

**٢-٢-أ-٢-٢/ پێکهاتەی لێکدراو، کە لە ڕواڵەتدا دوالیزمی دژیەك هەیە، لەسەر بنەمای لایەنی هونەری جوانکاری واتاییە:**

**٢-٢-أ-٢-٢-أ/ لەسەر بنەمای ڕۆچوون:**

لێرەدا تەنها یەك جۆرمان ڕەچاو کردووە لە دوالیزمی لێکدراوی، یاخود ڕۆنانی، کە سەر بە لایەنی هونەری جوانکاری واتایی بێت، کە ئەویش لەسەر بنەمای ڕۆچوونە.

وەك نموونەی هۆنراوە لە چوارچێوەی بنەمای ڕۆچووندا، مەولانای ڕۆمی دەڵێت:

زین واقعه مدهوشم، باهوشم و بی هوشم

هم ناطق و خاموشم، هم لوح خموشانم[298]

واتە: من لەم واقیعە مەدهۆشم، هۆشیارێکی بێ هۆشم

هەروەها قسەکەرێکی بێ دەنگم و تابلۆی بێ دەنگانم

ئەم شێوازە دوو دەستەواژەی دوالیزمی دژیەکی تێدایە، کە شاعیر جگە لەوە لەڕووی ناوەڕۆك و واتاوە ڕۆچوونی زۆری تێدایە، کۆبوونەوەی ئەو

[298] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی ج٢، ل٧٦٢.

حاڵەتانە پێکەوە ناگونجێ، چونکە دوالیزمی دژیەکن، بەڵام لەڕووی هونەری دەربڕینەوە شاعیر کارامەیی خۆی سەلماندووە و ڕۆچوونیشی نیشانداوە.

لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێ:

هم خونم و هم شیرم، هم طفلم و هم پیرم
هم چاکرو هم میرم، هم اینم و هم آنم[٢٩٩]

واتە: خوێنم و شیریشم، منالْم و پیریشم
نۆکەر و میریشم، ئەم و ئەویشم

بەهەمانشێوەی هۆنراوەی سەرەوە ڕۆچوونی تێدایە و دوالیزمی دژیەکی دروستکردووە.

هەروەها مەولەوی تاوەگۆزیش دەڵێت:

بێ شەرتیش دۆسی، قارش وەفامەن
مەزەی قین لەزەت، جەفاش سەفامەن
ئەر هەرسات دەردێ دەردێو تەرچەنی
بەیۆ، ماچوون ئاخ پەی دەردێو هەنی[٣٠٠]

قار: ڕقگرتن

واتە: من وا سەرمەست بووم لە بەلای یار، بێ شەرتی ئەو لەلای من دۆستییە، ڕقی وەفایە، مەزەی قین گرتنی لەزەتە بۆم، سزا و ئازاری مایەی خۆشیمە...

---

[٢٩٩] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی ج٢، ل٧٦٢.

[٣٠٠] دیوانی مەولەوی، ل١٠٨.

هەموو ئەمانە پێکهاتەی لێکدراوی جیاجیان و لەهەمانکاتدا دوالیزمی دژیەکن، ئەمە جگە لەوەی شاعیر لە وەسفی خۆشەویستەکەیدا هێندە ڕۆچووە، کە کار و کاردانەوەکانی ئاوەژوو کردۆتەوە، چونکە لە بەرامبەر (بێ شەرتیدا) مرۆڤ هەڵوێست و پەرچەکرداری دۆستی نییە، یاخود بە دۆستایەتی وەرناگرێت. (قار) وەکو (وەفا) و (قین) وەکو (مەزەی لەزەت دار) و (جەفاش) بە (سەفا) مانا ناکرێت!!

لە دێڕی دووەمیشدا ئەگەرچی پڕاوپڕ بەڵگە نییە بۆ مەبەستەکەی ئێمە، ڕۆچوونەکەی دەگاتە ئاستێك، کە دەڵێ: هەر تاوێ دەردێکم تووش ببێ لەوەوە و دەردێکی تریشی لەگەڵا بێ، من هەر دەڵێم ئاخ بۆ دەردێکی تر....

**٢-٢-ب/ ئەو پێکهاتە و ڕۆنانەی، کە لە پێکهاتەی ڕووکاریاندا دژیەك بەدیناکرێت:**

ئەم چەشنەش دەکرێتە دوو جۆر: ناوەڕۆکی و جوانناسی

**٢-٢-ب-١/ دوالیزمی دژیەکی ناوەڕۆکی:**

مەولانای ڕۆمی لە چوارچێوەی ئەم بابەتەدا دەڵێت:

من با تو حدیث بی زبان گویم

وز جمله حاضران نهان گویم

جز گوش تو نشنود حدیث من

هرچند میان، مردمان گویم[٣٠١]

---

[٣٠١] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج٢، ل٨١٤.

حدیث: واتە گوتە، یاخود گوتن، کە بە دەم و زمان دەگوترێت

بی زمان: واتە بێ زمان، یاخود بەبێ زمان

حاضران: ئامادەبووان

نهان: شاراوە

(گوتەی بێ زمان) و (ئامادەی شاراوە) دوالیزمی دژیەکن، واتە هەر دەستەواژەیەکیان بگریت، کە لە دوو وشەی لێکدراو پێکهاتووە دوالیزمی دژیەکی دروست کردووە، چۆن گوتە بێ زمان؟ چۆن ئامادەیە (واتە ئاشکرا و بینراوە بۆیە ئامادەیە)، بەڵام شاراوەیە؟!

بەگشتی واتای هۆنراوەکە: من لەگەڵ تۆدا گوتە و گوتنێکم دەبێت بێ زمان، یاخود بەبێ زمان هەروەها ئەو گوتەیەت لە ناوجەرگەی ئامادەبووانی شاراوەدا پێ دەڵێم.

جگە لە گوێی تۆ کەس گوتەی من نابیستێ، ئەگەرچی لەناو خەڵکیدا پێتدەڵێم.

لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێ:

در غیب هست عودی، کاین عشق از اوست دودی

یك هست نیست رنگی، کز اوست هر وجودی[٣٠٢]

واتە: لە جیهانی (غەیب) نەبینراودا داری عودێك هەیە، کە دەسوتێت، کە عیشقی ئەم جیهانە دەرئەنجامی دووکەڵی ئەوە، بوونێك هەیە، کە بوونی نییە ڕەنگ (هەبووی نەبوو ڕەنگ، یاخود بێ ڕەنگ)، کە هەموو بوون لەوەوەیە.

(هست نیست رنگ) (هەبووی بێ ڕەنگ)، دوالیزمی دژیەکە.

---

[٣٠٢] سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٠٨.

مەولەوی تاوەگۆزی دەڵێت:

هام فەرد ناڵەی دڵ، سەیرانگە ستەم

هام دەرد دووی دەروون، خەم بەرکەر کۆی خەم[٣٠٣]

واتە: هاوڕێم هاوار و ناڵەی دڵمە، ستەم سەیرانگەکە!!

دووکەڵی دەروونم (کە خۆی دەرد و خەفەتە) هاو دەردمە، کۆگای خەم و مەینەت خەفەت دەرکەری دڵمە!!

ئەم دوو نیوەدێڕە هۆنراوەیە لە چوار پێکهاتەی لێکدراو پێکهاتوون، کە ئەگەر وەکوو زاراوە و ڕووکاری دەرەکی دژیەك نەبن ئەوا لەڕووی ناوەڕۆکەوە هەریەکەیان پێکهاتەیەکی دوالیزمی دژیەکی دروستکردووە، چونکە:

(هاوڕێ) ناوزەدی کەسێکی خۆشەویستە چۆن (ناڵەی دەروون)، کە مایەی ئازارە خۆشەویستە؟!

(ستەم) دۆزەخێك دروست دەکات بۆ مرۆڤ چۆن دەبێتە (سەیرانگە)!؟

(دووی دەروون) خۆی دەردەکەیە چۆن دەبێتە هاودەرد؟!

(خەم بەرکەر)، کە خەم ڕەوێنە چۆن خۆی دەبێتە مایەی کۆکردنەوەی خەم؟!

لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێ:

تەرسی بێ سامان زەحمەت جە لای من

جەوری دلبەرەن مەنیەی نە ڕای من[٣٠٤]

---

[٣٠٣] دیوانی مەولەوی، ل١٧٩.

[٣٠٤] سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٨.

(دڵبەر)، یاخود خۆشەویست (ستەم)ی نییە، بەڵکو ئەوین و خۆشەویستی هەیە!!

### ٢-٢-ب-٢/ دوالیزمی دژیەکی جوانناسی

دوالیزمی دژیەکی جوانناسی، بەپێی لایەنەکانی ڕەوانبێژی بەشێوەیەکی گشتی و سەرەکی دابەشدەبێت بەسەر دوو لایەنی: ڕوونبێژی و جوانکاریدا.

### ٢-٢-ب-٢-١/ ڕوونبێژی:

ئەم جۆرەش لە دوالیزمی دژیەك، کە لەسەر بنەمای لایەنی هونەری ڕوونبێژییە، دابەشدەبێت بۆ چوار جۆر، کە ئەمانەن:

### ٢-٢-ب-٢-١-أ/ لەسەر بنەمای خواستن:

مەولانای ڕۆمی لە چوارچێوەی بنەمای خواستندا لە هۆنراوەیەکیدا دەڵێت:

یا چون صَدَف تشنه بگشاده دهان آید
تا قطره به خود گیرد در خویش گهر یابد[٣٠٥]

صدف: گوێچکەماسی، سەدەفی ناو دەریا

تشنه: تینوو

گهر: گەوهەر، مرواری لەناو گوێچکە ماسیدایە

---

[٣٠٥] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج١، ل٣٨٦.

واته:، یاخود وەك گوێچکەماسی تینوو، کە بەردەوام دەمی ڕووەو ئاسمان کردووەتەوە تا دڵۆپەیەك باران بکەوێتە ناودەمی، یاخود لە خۆی بگرێ و بیکا بە مرواری و گەوهەر.

(صدف تشنه) واتە گوێچکەماسی تینوو، دوالیزمی دژیەکە، چونکە چۆن بوونەوەرێکی ناو دەریا، کە لەناو ئاودا بە تینوویی دەبێت، بەڵام لێرەدا (تینوو) لێخواستراوە بۆ (تاسەبوون)، تینووی تاسەی بەیەکگەیشتن، کە کەسێك لە تاسەی چاوەڕوانیدایە وەك تینوو وایە.

تێبینی: لە بیروباوەڕی کۆنی ئێرانییەکاندا وازانراوە، کە گوێچکەماسی ناو دەریا دڵۆپە بارانی ئاسمان دەگرێتە خۆی و دەیکاتە مرواری و گەوهەر.[٢٠٦]

هەروەها مەولەوی تاوەگۆزیش دەڵێت:

قاڵبم بێ ڕۆح، ئەڕوام نەمەندەن

من دانی حەیات زیندەگیم کەندەن[٢٠٧]

قاڵب: واتە چوارچێوە، کە شتێکی تێدەخرێت بۆ ئەو مەبەستە دروست دەکرێت، لێرەدا وشەی (قاڵب) لێخواستراوە بۆ (لاشە)، یاخود جەستە، بەڵام (قاڵبی بێ ڕۆح) واتە چوارچێوەی بێ ناوەڕۆك، یاخود جەستەی بێ گیان، دوالیزمی دژیەکە.

واتە: چوارچێوەم، یاخود جەستەم ناوەڕۆك و کرۆکی نەماوە و گیانم نەماوە

من ددانەکانی ژیانم دەرهێناوە و نەمهێڵاوە.

---

[٢٠٦] محمد رضا شفیعی کدکنی، در عشق زنده بودن، ل٣١٨.

[٢٠٧] دیوانی مەولەوی، ل٤٤.

**تێبینی: ئەم جۆرە تەعبیرکردنەی، کە (قالَب) لاشەیە و (ناوەڕۆك) ڕۆحە، زۆرجار لای مەولانای ڕۆمیش دەبینرێ، کە مەولانای ڕۆمی لە هۆنراوەیەکی کورتی پڕماناداا دەڵێ:**

مرگ اگر مرد است آید پیشِ من تا کشم خوش در کنارش تنگ تنگ

من از او جانی برم بی رنگ و بوا و ز من دلقی ستاند رنگ رنگ[٣٠٨]

**واتە: مردن ئەگەر ئازا و مەردە با بێت بۆلای من تا منیش وەك خۆی بیکوژم، من گیان (ڕۆح) لەو دەسێنم، کە بێ ڕەنگ و بۆنە (واتە بە هەستەکان نابینرێت)، بەڵام ئەو (واتە مردن، کە دەمخاتە گۆڕەوە) تەنها زەرف و عەلاگەیەکم لێدەسێنێ، کە ڕەنگاوڕەنگە وەك زرق و برقی دنیا و هیچ بەهای نییە.**

**دلق: واتە زەرف و عەلاگە، کە شتی تێدەخەیت و بەبێ ئەوەی ناوی، کە ڕۆحە هیچ بەهای نییە.**

**٢-٢-ب-٢-١-ب/ لەسەر بنەمای لێچواندن:**

**لە چوارچێوەی هونەری لێچواندن و لەسەر ئەم بنەمایە، مەولانای ڕۆمی دەڵێت:**

<u>خرمنِ آتش</u>، گرفته صحنِ صحراهای عشق

گندمِ او آتشین و جانِ او پیمانەای[٣٠٩]

**خرمنِ: خەرمان. کە ئاماژەیە بۆ زۆر، واتە بڕێکی زۆر، بەڵام خەرمان زیاتر بۆ دەغڵودانی دووراوە و خڕکراوە لە شوێنێکدا بەکاردەهێنرێت.**

---

[٣٠٨] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج١، ل٦٨٥.

[٣٠٩] سەرچاوەی پێشوو ج٢، ل١٢٦٨.

آتش: ئاگر

صحن: پانتایی

صحرای عشق: بیابانی عەشق

واتە: ئاگرێك، كە وەك خەرمان وایە (خەرمانێك لە ئاگر)، پانتایی دەشت و بیابانی عەشقی گرتووە.

گەنمی ئەو ئاگرە و (گیان)یش پێوانەیە و دەفرێكە، كە گەنمەكەی تێ بكرێت!

(خەرمانی ئاگرین) دوالیزمی دژیەكە، چونكە (خەرمان) و (ئاگر) دژیەكن، بەڵام لێرەدا (خەرمان) بەواتای زۆر و بەرفراوان دێت واتە (خەرمان) لەوچووە، چونكە دەڵێ: ئاگرێكە، كە وەك خەرمان زۆرە.

مەولەوی تاوەگۆزیش لەم بارەیەوە دەڵێت:

بۆی گوڵاڵەی دەرد دڵبەر عەزیزەن

مەزەی تامی خەم یاران لەزیزەن[٣١٠]

واتە: دەردی دڵبەر، یاخود بۆنی دەرد و نەخۆشی (كە خراپ و پیسە) دڵبەر و خۆشەویست، وەكو بۆنی گوڵاڵە وایە، كە خۆشی و شادی بەخشە، لێرەدا مەولەوی ئەم هەموو واتایەی لە پێكهاتەیەكی دوو وشەییدا كۆكردووەتەوە، كە (گوڵاڵەی دەرد)ە، لەهەمانكاتدا لەڕووی هونەرییەوە دوالیزمێكی دژیەكی جوانی دروستكردووە.

---

[٣١٠] دیوانی مەولەوی، ل٧٢.

هەروەها دەڵێ: (خەم) ئەگەر هی یاران بێت ئەوا مەزە و تامی خۆشە (مەزەی تامی خەم)، کە ئەمەشیان دژیەك بوونی تێدایە، بەڵام ئێمە زیاتر (گوڵاڵەی دەرد)مان مەبەستە.

لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێ:

نە تۆی جامەی خاك حاڵاتش چۆن بۆ
دەك چەرخە بەختت هەر نیلگوون بۆ[٣١١]

واتە: ئاخۆ ئەو خانمە، کە هێندە ناسك بوو و بەناز پەروەردە کرابوو، بەجۆرێك، کە لە پەڕەی ئاوریشم تەرێزی ئەکرد، ئاخۆ ئێستا حاڵی لەناو (کراسی خاك) و خۆڵا چۆن بێ، دەك چەرخی فەڵەك خوا هەمیشە بەختت تاریك کا وا ئەم پەنەت دا.

(جامە) واتە (کراس) (جامەی خاك) واتە قەبر و خاك، کە وەکو بەرگ و کراسی لێهاتووە بۆی (خاك و کراس) دوالیزمێکی دژیەکی جوانی دروست کردووە.

**٢-٢-ب-٢-١-ج/ لەسەر بنەمای درکە:**

مەولانای ڕۆمی لە هۆنراوەیەکیدا، کە لەسەر بنەمای درکەیە، دەڵێت:

از شاهِ بی آغازْ من پرّان شدم چون باز من
تا جغدِطوطی خوار را در دِیرِ ویران بشکنم[٣١٢]

جغد: واتە کوندەپەپوو، کە ڕەمز و درکەیە بۆ شوومی و وێرانی.

---

[٣١١] سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢٩.

[٣١٢] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج٢، ل٧٠٤.

طوطی: واتە باڵندەی تووتی، کە جوانە لە شوێن ئاوەدان و دارستانی چڕی سەوزدا دەژی.

واتە: لەلایەن ئەو پادشایەوە، کە سەرەتایەك نییە بۆ دەسەڵاتی، هاتووم هەروەك باز تا ئەو کوندەپەپووەی، کە تووتی دەخوات، لەم شوێنە وێرانەیە نەهێڵم.

(جغد طوطی خوار)، کوندەپەپووی تووتی خۆر، دوالیزمی دژیەکە و لێکدراوەو پێکهاتووە لە (کوندەپەپوو) و (تووتی)، کە دژن. هەروەها (جغد) کوندەپەپوو (درکە)یە بۆ شوومی وێرانەیی و (تووتی) دەخوات، کە تووتی لە هەر شوێنێك بێت نیشانەی ئاوەدانییە.

مەولەوی تاوەگۆزیش لەم چوارچێوەیەدا دەڵێت:

ئوستادی تەعلیم دەرسی مەجنوونیم

دەسگیری ڕاگەی سەختی و زەبوونیم[٣١٣]

مەجنون: وەك واتا واتە (شێت)، بەڵام بووەتە (درکە) بۆ (عاشق) بوون و کەسی عاشق.

دەرس: واتە (وانە) و زانست و زانیاری، کە ئەمەش بۆ کەسی ژیر و عاقڵ دەبێت.

(دەرسی مەجنوونیم) (وانەی شێتیم) لێرەدا مەبەستی (وانەی عاشقبوون و عیشقە).

(دەرس) و (مەجنوونی) پێکەوە دوالیزمی دژیەکیان دروستکردووە ئەگەر بوترایە (دەرسی عاشق) ئەوا دژیەکبوون نەدەبوو.

واتە: ئەی مامۆستایەك، کە دەرسی عەشقت فێرکردم...

---

[٣١٣] دیوانی مەولەوی، ل٢٧٢.

لە هۆنراوەیەکی تردا دەڵێ:

بولبولی گولشەن بێ نام و نەنگی

تە زەروی سەر سەر و باغچەی بێ ڕەنگی[٣١٤]

هەرشتێك، کە بوونی ماددی هەبێت ناتوانێت (بێ ڕەنگ) بێت، هەرچۆن بێت ڕەنگێکی هەیە بەتایبەتی (باغچە)، بەڵام (بێ رەنگی) لە فەرهەنگی متصوف و عارفاندا واتە: دامەزراوی و نەگۆڕاوی و ئیستیقامەت، کە لێرەدا وەکو (درکە)یەك بە واتا عارفانەکەی هاتووە.

(باغچەی بێ ڕەنگی) پێکهاتەیەکی لێکدراوە، کە دوالیزمی دژیەکی دروستکردووە.

واتە: تۆ وەکو بولبولی باخی بێ ناویت و بێ باکیت لە هەموو جیهان هەروەها وەك تەزەروی سەرچڵی باغچەی بێڕەنگیت.

تێبینی: مەولانای ڕۆمیش دەستەواژەی (بی رنگی) بەکارهێناوە، کە بەواتای (سپی)بوون و ڕەنگ نەگۆڕان و پایەداری دێت، کە دەڵێت:

رنگ بی رنگی ست، از رخسار عاشق آن صفا

آن وفا و آن صفا و لطف خوش رخسار تو؟[٣١٥]

## ٢-٢-ب-٢-١-د/ لەسەر بنەمای خوازە:

لە هونەری خوازەدا بۆ بەکارهێنانی وەك دەربڕینی دژیەك و لەو چوارچێوە و بابەتەدا، مەولانای ڕۆمی دەڵێت:

---

[٣١٤] سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٤.

[٣١٥] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج٢، ل١٠٩٨.

ور زان كه رَوى، مرو تو باخويش

دريوش نشان بى نشانى[٣١٦]

واته: تۆ، که هەر دەڕۆی و بڕیارت داوه بڕۆی، تۆ لەگەڵ خۆتدا مەڕۆ و خۆت مەبە! ئەو پۆشاکە دەرکە، کە بووەتە شوناست، ئەویش نیشانەی بێ نیشانیە.

نشان: نیشانە، شتێك، کە کەسێکی پێ بناسرێتەوە.

بی نیشانی: بێنیشانەیی، خوازەیە بۆ سادەی و خاکی بوون.

نیشانەی بێ نیشانی، دوالیزمی دژیەکی دروستکردووە.

هەر لەم بارەیەوە مەولەوی تاوەگۆزیش دەڵێت:

پەی کەسێ خاسەن ئەوەڵ دەردش بۆ

ئیبتیدای خێزیای دوودی سەردش بۆ[٣١٧]

خێزیا: هەڵسان، بەرزبوونەوە

دوود: دووکەڵ

سەرد: سارد

له بنەڕەتدا دەگوترێت (هەناسەی سارد)، بەڵام مەولەوی لەم هۆنراوەیەدا دەڵێت (دووکەڵی سارد)... (دووکەڵ) خوازراوە بۆ (هەناسە) و لە بنەڕەتدا چەمکی دووکەڵ وێنەی ئاگر و گەرمیی لە زەینماندا دروست دەکات. (دوودی سەرد) واتە دووکەڵی سارد، ئەمە دوالیزمی دژیەکە، چونکە (دووکەڵ) دەرئەنجامی گەرما و ئاگرە نەك (سارد)ی.

---

[٣١٦] سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ل١٢٦١.

[٣١٧] دیوانی مەولەوی، ل٣٦٦.

واتە: ئارەزووکردنی وەنەوشە بۆ کەسێك باشە، کە سەرەتای دەردەداربوون و هەڵسانی دووکەڵی هەناسەی ساردی بێت.

لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێ:

مەسقەڵچی سەواد ئایینەکەی دڵ

غەواسی دانەی دەریاچەی موشکڵ[٣١٨]

مەسقەڵچی: سپیکەرەوە، (خوازە)یە بۆ کەسێك، کە کاری پاککردنەوە بکات.

سەواد: ڕەشایی.

(مەسقەڵچی سەواد) سپیکەرەوەی ڕەشایی، ئەمە دوالیزمی دژیەکە، چونکە (سپیو ڕەش) هاتووە، بەڵام (سپیکەرەوەی ڕەشی) پێکهاتەیەکی لێکدراوی دوالیزمی دژیەکە.

واتە: سپیکەرەوەی ڕەشایی ئاوێنەی دڵ، دەرهێنەری گەوهەری مانا لە زانستی ئاڵۆزدا.

### ٢-٢-ب-٢-٢/ جوانکاری

ئەو جۆرە لە دوالیزمی دژیەك، کە لەسەر بنەمای لایەنی هونەری جوانکاری واتاییە:

لێرەشدا تەنها یەك جۆرمان ڕەچاوکرد لە دوالیزمی لێکدراوی، یاخود ڕۆنانی، کە سەر بە لایەنی هونەری جوانکاری واتایی بێت، کە ئەویش بریتییە لە:

---

[٣١٨] دیوانی مەولەوی، ل٢٧٣.

**٢-٢-ب-٢-٢-أ/ لەسەر بنەمای فرەواتایی:**

**لە چوارچێوەی بنەمای فرەواتاییدا و بەکارهێنانی وەک دژەیەکێک، مەولانای ڕۆمی دەڵێت:**

ای آن، که بزادیت چو در مرگ رسیدید
این زادنِ ثانی ست، بزایید، بزایید[٣١٩]

**زادنِ ثانی: واتە لەدایکبوونی دووەم، وەک لە هۆنراوەکەی مەولەوی تاوەگۆزیشدا ڕوونمان کردووەتەوە، (زادن) بە دوو واتا دێت ئەگەر بەواتای (لەدایکبوون) بێت واتە هاتنە جیهان، ئەوا مرۆڤ تەنها یەکجار لەدایکدەبێت و لەڕووی لۆژیکییەوە ناگونجێت مرۆڤ لەدایکبوونی دووەمی هەبێت، بەڵام لای عارف و سۆفییەکان (زادن) لەدایکبوون بە واتای خۆدۆزینەوەو پەیبردنە بە حەقیقەتی خوایی و دەرئەنجام خۆناسین و خواناسین.**

**لێرەدا (لەدایکبوونی دووەم) ئەگەر بەواتای یەکەم وەربگرین، ئەوا دوالیزمی دژیەکە و هەردوو وشەکانی لەدایکبوون و دووەم، دوالیزمێکی دژیەکی لێکدراویان دروستکردووە.**

**واتای گشتی هۆنراوەکە: ئەی ئەو کەسەی، کە پاش لەدایکبوونت بە مەرگ دەگەیت، واتە لەدایکبوونی سروشتی، بەڵام (مەرگ) مەبەستی لە مردنی ئاشکرا و چوونە ناو گۆڕ نییە، بەڵکو مردنی ئارەزوومەندانەی (عارف باللە)یە، کە پێویستە هەموو پابەندییە دونیاییەکانی و هەوەسە مرۆڤینەکانی بمرێنێت.... بۆیە دواتر دەڵێت: ئەم مردنەتان لەدایکبوونی دووەمە لەدایکبن، لەدایکبن.**

---

[٣١٩] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج٢، ل٧٠١.

لە فەرموودەی قودسیدا هاتووە کە: "لن یلج ملکوت السموات والارض من لم یولد مرتین" هەر کەسێك دووجار لەدایکنەبێت پلەکانی مەلەکوتی ئاسمان و زەوی نابڕێت، واتە ڕاستییەکانی بوون نازانێت مەگەر لەدایکبوونی دووبارەی هەبێت.

ئەم دەربڕینە لای فەیلەسوفێکی وەکو ئەرستۆش هاتووە، کە ئەو بە (فطرت ثانی) سروشتی دووەم ناوی دەبات، کە مەبەستی ئەوەیە: تێپەڕاندنی نەریت و باو و مردن لە مەسەلە (معمول)یەکان و گەیشتن بە مەعقولی دووەم[٣٢٠].

مەولانای ڕۆمی ئەم دەربڕینەی لە زۆر هۆنراوەدا بەکارهێناوە بۆنموونە:

زاده اولَم بشد زاده عشقم این نفس

من ز خودم زیادم، زان، که دوبار زاده ام[٣٢١]

واتە: لەدایکبوونی یەکەمم تێپەڕاند و ئێستا لەدایکبووی عەشقم.

من لە خۆم زیادەم، چونکە دووبارە لەدایکبووم.

هەروەها دەڵێت:

مانند طفلی در شکم، من پرورش دارم ز خون

یك بار زاید آدمی من بارها زاییدەام[٣٢٢]

واتە: هەروەك منداڵێکی ناوسکی دایکی، من بە خوێن پەروەردەکراوم، مرۆڤ یەکجار لەدایکدەبێت من چەندینجار لەدایکبووم.

هەروەها دەڵێت:

---

[٣٢٠] کریم فیضی، شعاع شمس، ج٢، ل٢٣٧.

[٣٢١] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج٢، ل٧٢٩.

[٣٢٢] سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ل٧٠١.

صد بار جان بدادم وز پای درفتادم

بار دگر بزادم، چون بانگ تو شنودم[٣٢٣]

واتە: سەدان جار گیانمدا و مردم، جارێکی تر لەدایکبوومەوە، چونکە بانگی تۆم گوێ لێ بوو.

تێبینی: جێگای ئاماژەپێکردنە، هەمان دەربڕینی مەولانای ڕۆمی (تولد ثاني)، یاخود (زادنی ثاني) بەهەمانشێوە و مانا و بۆ هەمان مەبەستی هونەری لای مەولەوی تاوەگۆزی بەکارهاتووە، کە لەو دەستەواژەیەی (تەوەللود دووبارە) بەکاردەهێنێت وەك ئاماژەی پێدەکەین.

مەولەوی تاوەگۆزیش دەڵێت:

هەرکەس تەوەللود دووبارەش نییەن

ئەڵبەت سەعادەت ستارەش نییە[٣٢٤]

(تەوەللود دووبارە) لەدایکبوونی دووبارە، یاخود دووبارە لەدایکبوون.

(لەدایکبوون) ئەگەر بە واتای هاتنە ژیان و جیهان بێت ئەوا لەگەڵ (دووبارە)بووندا ناگونجێ و سروشتی ژیان و لۆژیکی عەقڵ قبوڵی ناکات، بەڵام ئەگەر بەمانا عیرفانیەکەی وەریگرین (کە بەواتای خۆدۆزینەوە و پەیبردن بە حەقیقەتی ژیان و بوون، کە ئەمە لای عارفەکان بە لەدایکبوونی ڕاستی ناودەبرێت) ئەوا هیچ دژیەکبوون و نەگونجانێکی تێدا نامێنێ.

---

[٣٢٣] غزلیات شمس تبریز، گزینش و تفسیر محمد رضا شفیعی کدکنی، ج٢، ل٨٨٥.

[٣٢٤] دیوانی مەولەوی، ل٢٩٥.

**کەواتە (تەوەللود) بەواتای (لەدایکبوون) بە دوو واتا دێت، کە ئەگەر بە واتایەکیان وەریگرین ئەوا دوالیزمی دژیەك دروست دەکات لەگەڵ (دووبارە)دا، چونکە پێکهاتەیەکی لێکدراوە، کە پێکەوە واتایان دژ دێتەوە.**

## ٣/ دوالیزمی دژیەکی شیعری مەولانا و مەولەوی لەڕوانگەی ئیستاتیکییەوە

ئەگەرچی لە بەشی یەکەمی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا، ئاماژەمان دا بەوەی، کە (دوالیزمی دژیەك) هونەرێکی ڕازاندنەوەی دەربڕینە و دەستپێکی بوونی لە چوارچێوەی هونەری ڕەوانبێژیدا بووە، کە دەرئەنجام ڕازاندنەوە و جوانکاری لە دەقدا دوا وێستگەو ئامانجییەتی، بەڵام لەم بەشەی لێکۆڵینەوەکەدا (ئیستاتیکا) دەکەینە زەمینە و خولگەی بەدواداچوونی بابەتی دوالیزمی دژیەك بە هیوای نیشاندانی لایەنە ئیستاتیکییەکانی ئەم هونەرە.

سەرەتا پێویستە ئەگەر بەکورتی و ڕاگوزەرانەش بێت ئاماژەیەکی کورت بدەین بە پێناسە و بابەت و بەگشتی سروشتی بابەتی ئیستاتیکا، پاشان پەیوەست بە هونەری دەربڕین و بابەتی عیرفانیانەی مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزییەوە لە دیدی ئیستاتیکاوە بدوێین.

### ٣-١/ ئیستاتیکا، پێناسە و بابەت و سروشتی:

هیگڵ دەربارەی یەکێك لە بابەتەکانی فەلسەفە بە هەق جوانی نووسیوە: "ناتوانین پێشەکی دەربارەی لۆجیك بدوێین، کە ئاوایە، تەنیا لە داڕشتن و ڕانانیدا زانیاری دەربارەی پەیدا دەبێ" لە ئیستاتیکاشدا هەر وەهایە، هێڵکاری

تەواوی سنووری ئەم زانستە تەنیا بە دارشتنی بەرفراوانی زانستەکە دەکریّ"[٢٢٥].

لەم روانگەیەوە، پیّناسەکردن و چوارچیّوە بۆ کیّشانی وەك بابەتیّك کاریّکی ئاسان نییە و سەختە، چونکە: "میّژووی ئیستاتیکا بۆ چەندەها سەدە لەمەوبەر دەگەریّتەوە. لە رەوتی گەشەسەندنی ئەم زانستەدا نەك هەر روانگەکانی ئیستاتیکا، بەڵکو کیّشە و پرسیارەکانیش، هەروەها بابەت و ئەرکەکانیشی گۆرانیان بەسەردا هاتووە..."[٢٢٦].

لەرووی باس و بابەتەکانیشییەوە: "بابەتی ئیستاتیکا هەموو جیهان دەگریّتەوە، ئەگەر لە گۆشەنیگای بایەخ، نرخی دیاردەکەوە بۆ مرۆڤایەتی سەیری بکەین"[٢٢٧].

ئیستاتیکا- زانستیّکە دەربارەی جەوهەری مەرجداری میّژوویی، بەها گشتییە مرۆڤایەتییەکان، هیّنانەکایەیان، پەسندکردنیان، نرخاندن و رۆشنکردنەوەیان. ئەمە زانستیّکی فەلسەفییە دەربارەی پرینسیپە هەرە گشتییەکانی روونکردنەوەی جیهان بە یاسا و ریّساکانی جوانی لە پرۆسەی کار و چالاکیی مرۆڤدا. لەپیّش هەموو شتیّکیشەوە لە هونەردا، کە شیّواز دەگریّ و

---

[٢٢٥] کەرەسەی کۆرسی دووەمی دکتۆرا بۆ خویّندکارانی ئەدەب (٢٠١١ – ٢٠١٢ن) بەشی کوردی، کۆلیژی زمان، زانکۆی سلیّمانی،، کە بەشیّکە لە کتیّبی (ئیستاتیکا)ی (یوری بۆریڤ)، کە بەزمانی رووسی نووسراوەو لە مۆسکۆ ساڵی ١٩٨١ چاپی سیّهەمی بۆکراوە و لەلایەن (ئەنوەر قادر محەمەد)ەوە وەرگیّردراوە و ئامادەکراوە وەك کەرەسە و بابەتی کۆرس. ل٥.

[٢٢٦] سەرچاوەی پیّشوو.

[٢٢٧] سەرچاوەی پیّشوو.

دەخەملیّ و بەهیّزدەبیّ و دەگاتە لووتکەی کاملبوونی ئەنجامەکانی ئەو جۆرە رۆشنکردنەوەیەی جیهان.

سرووشتی ئیستاتیکی و شیّوازی جیای لە واقیع و لە هونەردا، پرینسیپەکانی پەیوەندیی ئیستاتیکیی مرۆڤ لەگەلّ جیهان، جەوهەر و یاسا و ریّساکانی هونەر مەسەلە بنەڕەتییەکانی ئەم زانستە ئەمانەن. ئەم زانستە سیستمی روانگەی ئیستاتیکیی کۆمەلّ دەردەبڕیّ، ئەوانەی، کە جیّ پەنجەی خۆیان بە رووخساری مادی و گیانیی چالاکیی خەلّکەوە دەنەخشیّنن.

. ئیستاتیکا بۆ هونەرمەند پیّویستە. ڕاستییەکەشی ڕەنگە هونەرمەند بەشیّوەیەکی چالاک یاساکانی بەکاربهیّنیّ ئەگەر چی بەشیّوەی تیۆری نەیزانیّ...

ئیستاتیکا تەنیا بۆ ئەو هونەرمەندە پیّویست نییە، کە تابلۆیەکی کیّشاوە، تەنانەت بۆ بەرگدروویەك، کە جل و بەرگ دەدووریّ، بۆ دارتاشیّك، کە دۆلابیّك دروستدەکات، هەروەها بۆ ئەو ئەندازیارەی ئۆتۆمبیلیّك دروستدەکات. بۆ ئەمانیش جیهان هەر بەیاسا و ڕیّساکانی جوانی دابین و مسۆگەر دەکریّ. ئیستاتیکا تیّکەلّی کار و بوون، هۆشیاریی مرۆڤی ئەم سەردەمە دەبیّ، ئەو (گیانی) داهیّنانەی تیّدا دەخەملیّنیّ، کە سەرەتاکانی (مرۆڤایەتی) دامەزراندووە.

ئیستاتیکا بۆ ئەو خەلّکەش پیّویستە، کە (چیّژ) لە هونەر وەردەگرن– جەماوەری خویّنەر، بینەر و گویّگر...

بیّگومان وەك ئاماژەمان پیّداوە (ئیستاتیکا) هیّندەی بەرفراوانی میّژوو و بە پانتایی شوناسە جیاوازەکانی مەعریفە، یاخود بەکورتی لەڕوانگەی هەر ترادسیۆنیّکەوە، شوناسی خۆی هەیە. ئیّمە لەم لیّکۆلّینەوەیەدا پیّویستە ئەوەمان لەیاد نەچیّت، کە باس لە هونەریّکی دەربڕینی شیعری عیرفانی

دەکەین، بۆیە پێویستە دووربکەوینەوە لە شووناسە مۆدێرنەکەی ئیستاتیکا و دید و ڕوانگە کلاسیکی و عیرفانییەکان بخەینەڕوو، کە ئەنوەر قادر لە بابەتەکەیدا ناوی (پارادیگمی ڕەنگدانەوەی یەزدان، یان بیری ڕەها)ی، لێناوە لە شت و دیاردە کۆنکرێتییەکاندا، وەك یەکەمین جۆری پارادیگمی تیۆریی بەدەستهێنانی جوانی[٣٢٨].

**٣-١-أ/ پارادیگمی ڕەنگدانەوەی یەزدانی و (مکاشفە)، یاخود عیرفانی بۆ ئیستاتیکا (ئەفلوتین وەك سەرەتا و نموونەیەك):**

بابەتی (ئیستاتیکا چییە؟)، یەکێك بووە لەو پرسیارە بنەڕەتییانەی، کە بەردەوام ئەفلاتون عەودالّی بووە. بۆیە بەردەوام بەدوای جوانی سەرەکی، یاخود بنەڕەتیدا گەڕاوە. واتە ئەو شتەی، کە لە خۆیدا جوانە و سەرچاوەی جوانییەکانە، بۆیە جارێك پەیوەستی دەکاتەوە بە (چاکە)وە و جارێکیش بە (عیشق)ەوە. دواجار ڕای وایە، ناکرێت جوانی جارێك، یاخود لە گۆشە نیگایەکەوە جوان بێت و جارێکیتر، یاخود لە گۆشە نیگایەکی دیکەوە جوان نەبێت، واتە نیسبی نییە، بەڵکو ڕەهایە. "شتێکە لە خۆی دا و بۆ خۆی، کە بەردەوام بەوجۆرە دەمێنێتەوە و گۆڕانکاری وەرناگرێت و هەموو شتە جوانەکانی دیکە تەنها لەبەرئەوە جوانن، کە بەهرەیەکیان لە جوانی ئەو وەرگرتووە...."[٣٢٩]، ئەمەش بێگومان دیدێکی ئایدیالیستیە بۆ جوانی.

---

[٣٢٨] بڕوانە: یۆری بۆریف، ئیستاتیکا، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٥.

[٣٢٩] بابك احمدی، حقیقت و زیبایی، (مدارس های فلسفه هنر)، نشر مرکز – تهران، چاپ بیستم، ١٣٩٠ هـ.ش. بڕوانە لاپەڕەکانی ٥٠ – ٥٧.

ئەگەرچی دواتر ئەرەستۆش لە زۆر ڕوانگەوە هاوڕایە لەگەڵ ئەفلاتوندا، لە تێڕوانینیان بۆ ئیستاتیکا، بەڵام لەهەمانکاتدا تایبەتمەندی و جیاوازیش هەیە. ئەرەستۆ بیری لە کاریگەرییەکانی تاکەکەسی و دەروونی هونەر دەکردەوە و وەك هاوواتای (کاتارسیس) واتە پاککردنەوە و دەروون پاکژکردنەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکرد. کاتارسیس لای ئەرەستۆ بەو واتایە بوو، کە هونەر گیان و ڕۆحی مرۆڤ پاکژ دەکاتەوە و خراپەی لێ دووردەخاتەوە. بە زمانی عارفەکان، هونەر دەبێتە هۆکاری (تزكية النفس) پاککردنەوەی دەروون. ئەم تێڕوانینە پڕ لە ستایشە دەبێتە هۆی ئەوەی، کە ئەرەستۆ، نەك تەنها لە هونەری (فاسد) و کاریگەری وێرانکاری ئەو بدوێت، بەڵکو باسی هونەر بکات وەك هۆکارێکی پێشکەوتن و سازگاری ڕۆح[٢٣٠].

ئەم دید و تێڕوانینە بۆ ئیستاتیکا، لای ئەفلوتین زیاتر دیدێکی عارفانە و (مکاشفە)یی وەرگرت و لە کتێبەکەیدا بەناوی (انئادها)، کە چەندین بابەتی جۆراوجۆری لەبارەی مێژووی فەلسەفە ووژاند و هەندێك لەو بابەتانە کاریگەری قووڵی هەبوو بۆ سەر عیرفانی ئیسلامی، لە پەیامی شەشەمی (انئاد)ی یەکەمدا باس لە جوانی دەکات. هەروەها لە پەیامی هەشتەمی (انئاد)ی پێنجەمدا لەبارەی جوانی مەعقول، یاخود هەست پێ کراو دەدوێت[٢٣١].

ئەفلوتین پاش ئەوەی پرسیار لەوەدەکات، کە هۆکاری جوانی چییە؟ وەڵام دەداتەوە، کە ڕۆح، یاخود گیانی ئێمە "بەپێی سروشتی خۆی پەیوەستە بە

---

[٢٣٠] سەرچاوەی پێشوو، ل٦٤.

[٢٣١] سەرچاوەی پێشوو، ل٦٩.

جیهانی مەعقول و بوونی حەقیقی"[٣٣٢]، کەواتە هەرکاتێك لەگەڵ شتێکدا ڕووبەڕووببێتەوە، کە ئاشنای ئەو بێت ئەوا پێی شادومان دەبێت "دەکەوێتە بزوان و بەئاگا دێتەوە لە پەیوەندی ئەو شتە لەگەڵ خودی خۆیدا، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ خۆی و خودی خۆی و ئەو شتەش، کە بەشێکە لە خۆی دەهێنێتەوە یاد."[٣٣٣]. کەواتە بابەتەکە لێرەدا ئەمەیە، لە نێوان شتە جوانە هەستپێکراو و جوانە مەعقولەکاندا چ لێکچوونێك هەیە؟ (ئەفلۆتین) وەڵام دەداتەوە: جوانی شتە هەستپێکراوەکان سەرچاوەی لەو بەهرەوەیە، کە ئەو شتانە لە ئایدیای جوانییەوە وەریانگرتووە، "جەستەی جوان لەڕێگەی بەهرە وەرگرتنەوەیە لە هێزێکی وێنە بەخش، کە لە وێنەی خواییەوە دێت و بوون پەیدا دەکات"[٣٣٤]، ئەمە سەبارەت بە جوانی هەستپێکراو، بەڵام جۆرێکیتر لە جوانی هەیە، کە هەستەکانی ئێمە پەی پێ نابات، واتە بە چاوی بینراو و گوێی بیستن، ناکرێت پەی پێ بەرین. ئەمە جوانی حەقیقی و واتایی (معنوی) ڕۆحانیە. لێرەوەیە، کە ئەفلۆتین دەگاتە ئەو خاڵ و دەرئەنجامەی، کە جوانی بەند و پەیوەستە بە ڕۆحی مرۆڤەوە، ئەوە (ناشیرینی)یە، کە زیاد دەکرێت بۆ (ڕۆح) ئالودەی دەکات. جوانی هەمان ژیانی ڕاستی ڕۆحە و گیانی مرۆڤ ئەگەر بەتەنها بێت ئەوا لە ناشیرینییەکان قوتار دەبێت. هەر بۆیە هەموو فەزیلەتێك حوکمی پاك کردنەوەی هەیە.

---

[٣٣٢] فلوطین، دوره آثار، برگردان م.ح.لطفی، انتشارات مرکز – تهران، ١٣٦٦ هـ.ش. ل١١٢.

[٣٣٣] سەرچاوەی پێشوو، ل١١٣.

[٣٣٤] فلوطین، دوره آثار، ل١١٤.

له بەشی شەشەمی هەمان پەیامدا، چەمکی (چاکە) وەك هاوواتای (جوانی) دێتە پێشەوە: "جوانی و چاکە وەك یەکن"[٣٣٥]، لێرەوە ئەرکی ئەخلاقی و لەڕاستیدا دەتوانین بڵێین ئەرکێکی (عیرفانی)مان لە ئەستۆ و لەبەردەمدایە. بۆ گەیشتن بە چاکە و جوانی پێویستە ڕوو لە (جوانی ڕەها) بکەین و ببینە (سالك) دەروێش و ڕێبواری ڕێگەی بڕین و پەی پێ بردنی ناخ و دەروونی خۆمان و بەچاوی (باطن) سەیری جیهان و (بوون) بکەین. ڕۆح ئەگەر خۆی جوان نەکات ناتوانێت جوانی ببینێت[٣٣٦]. ئەم پلە عیرفانیە دوانگەی ئێمەیە بۆ بابەتی جوانی و ئێمە لەم جیهانەدا دیدگای جوانیمان دەخەینەڕوو.

### ٣-١-ب/ بنەمای ئەزموونی ئیستاتیکیی لای مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزی:

له سەرەتای ئەم بەشەدا پاش ئەوەی باسی سروشتی ئیستاتیکامان کرد، دواتر ئاماژەماندا بە جۆرێك لە پارادیگماکان، کە پارادیگمای ڕەنگدانەوەی یەزدانی و (مکاشفە)یە.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم باس لەو بنەما سەرەکیانە بکەم، کە بووەتە بناغەی ئەزموونی ئیستاتیکیی لای مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزی. ئەم پێشەکییانەش وەك دەروازەیەك بۆ خستنەڕووی (دوالیزمی دژیەك) وەك هونەرێکی دەربڕینی جوان بۆ شیعری عیرفانی، کە ڕێچکەی لێکۆڵینەوەکەی ئێمەیە.

---

[٣٣٥] سەرچاوەی پێشوو، ل١١٧.

[٣٣٦] بابك احمدی، حقیقت و زیبایی، بڕوانە لاپەڕەکانی ٧٠ – ٧٥.

لەهەمانکاتدا پێویستە ئەو ڕاستیەش بخەینەڕوو، کە هەریەك لە مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزی خاوەنی ئەزموونی ئیستاتیکیی خۆیانن و هەریەکەیان تایبەتمەندی خۆی هەیە، چ وەك هەندێك جیهانبینی و لایەنی بیرکردنەوە و تایبەتمەندیەتی عیرفانی چ وەك هونەری دەربڕینی شیعری، بەڵام لەهەمانکاتدا جگە لەوەی بەگشتی لێکچوونی زۆر لەنێوانیاندا هەیە، لە ئەزموونی ئیستاتیکایشدا بنەما و زەمینەی هاوبەش و بەرفراوان هەیە، کە هاوشێوەیی دەداتە ئەزموونەکەیان.

توێژەرێکی ئەم بوارە دەڵێ: "جوانناسی، یاخود جوانبینی و جوانی لەڕاستیدا جۆرە دید و تێڕوانینێکە، کە لە ناخی ئایینپەروەری و ئەزموونی عیرفانییەوە سەرهەڵدەدات"[۲۳۷]. تێڕوانینی مەولانا و مەولەوی لەم بارەوە، دەربڕینی ئەزموونێکی کارەکی و ڕەفتاری و دەروونی ئەوانە. لەم جۆرە ئەزموونەی جوانناسی مەولانا و مەولەوی دا (خوا) تەنها لەسەرەوەی (جوانی ڕەها)، یاخود (حسن مطلق)دا نییە، بەڵکو (جوانی) هەنگاوی یەکەمی (عیشق)ە. (عیشق)یش گرنگترین پەیامی عیرفانییە و کەسی عارفیش (جوان) بینینی (خوا) لەناو دڵی ئەزموونی عاشقانەی خۆیدا بەدی و بەرجەستە دەکات. تەنها پەیبردن بە (جلوە) خۆ نمایان کردنی خۆشەویستی خوایی، کە لە ڕاستیدا دەرئەنجامی ئەزموونێکی عیشقی گەورەیە، ڕێنمایی (عاشق) دەکات بۆ پەیبردن بە پلەکانی جوانیی یەزدانی. ئەگەر دیاریکردنی جوانناسی و جوانی لە دیدی دوو عارف و عاشقی وەك مەولانا و مەولەوییەوە وەك بابەتێکی دەروونی

---

[۲۳۷] عبدالحسین زرین کوب، پله پله تا ملاقات خدا، انتشارات علمی – تهران، چاپ ششم، ۱۳۷۳هـ.ش. ل۵۸.

گرنگی و بایەخی هەبێت، بەهۆی ئەوەیە، کە (عشق) ئەزموونێکی کەسی و کاردانەوەیەکی دەروونیە.

لەم ڕوانگەوە لە ئەزموونی مەولانا و مەولەویدا، جوانی بەر لە لێکدانەوەی وەك دەرکەوتەیەکی دەرەکی، لە دیدی چۆنیەتی پەی پێ بردنی خودی مرۆڤەکانەوە مایەی هەڵوێستە لەسەرکردن و چۆنیەتی ڕەنگدانەوەیە. ئەمەش هەمان چەمکی ڕێژەیی بوونە لە پەیبردندا بۆ ناشیرینی و جوانی. لێرەدا گریمانە و ڕاستی ئەوە بەرچاو دەکەوێت، کە ناشیرینترین و دزێوترین دیاردەش ڕاڤەی جوانی بۆ بکرێت، ئەمە دیدی دەروونی عارفێکە، کە ناخی پڕە لە جوانی و وێنای جوان بینانە بۆ دەرەوەی خۆی و هەرئەمەش بنەڕەتی دید و هەڵوێستی عیرفانی و عارفانەیە، کە دەرئەنجام ئەفراندنی جۆرە دوالیزمێکی دژیەکی لێوانلێوە لە جوانی.

بەشێوەیەکی گشتی، جیهانی ئەزموونە مەعنەوییەکان، مرۆڤ کەمەندکێش دەکات بۆ یەکبوون و یەکگرتن لەگەڵ بابەتە ئەزموون کراوەکەدا. لە بالاترین نموونەی ئەم ئەزموونانەش ئەزموونی (عیشق)ە، قسەکردن لە بابەتی یەکبوونی عیشق و عاشق، بابەتێکی نوێ نییە، عارفەکان هەر لە کۆنەوە لێی دواون[٣٣٨].

ئەوەی لێرەدا مەبەست و بابەتی ئێمەیە، ئەزموونی عیشقی و یەکبوونی عیرفانیە لای مەولانا و مەولەوی، کە دەرئەنجام سەری لە ئەزموونێکی

---

[٣٣٨] مژده احمد زاده. تحليل تجربه ٔ زيبانگرى در مولوى، فصلنامه پژوهشهاى ادبى، شماره ٤، تابستان ١٣٨٣ هـ.ش.

ئیستاتیکییەوە دەرکردووە و دواتریش ئەدەبیاتێکی پڕ لە دەربڕین و واتای جوانی لێ کەوتووەتەوە.

لەمبارەوە سەبارەت بە مەولانا، دەوترێت: "ئەزموونی عیشقی لای مەولانا هێندە بڵند و قووڵە، کە ئەو یەکبوون لەگەڵ مەعشوقەکەیدا (شەمسی تەبریزی) بە واقیع ئەزموون دەکات، لای مەولانا گەیشتن بە هەستکردن بە (وحدت) ئیتر چ (وحدت شهودی)، کە بە مانای دیدار و بینین دێت، یاخود (وحدت وجودی)، کە هەستکردنە بەو بۆشاییەی، کە زاڵە بەسەر چۆنیەتی بیرکردنەوەی مەولانادا، بەگشتی گەیشتن بە پلەی یەکیەتی و یەکبوون..."[٣٣٩].

سەبارەت بە مەولەویش ئەنوەر قادر دەڵێت: "مەولەوی جاروبار ماریفەت و داب و ڕەوشتی تەریقەتی نەقشبەندی و چەمکی خۆشەویستی سۆفیانەی وەکو یەکگرتن و توانەوە لە جوانی نەمردا، بەشێوەیەکی تر پەرەپێدەدا و لایەن و بیری سۆفییەتەکەی دەخاتە چوارچێوەیەکی ترەوە و ناوەڕۆکێکی دیاریکراوی ژیانمان بۆ بەبەردا دەکات"[٣٤٠].

لەڕاستیدا: "هیچ وەسفێکی تر بە هێندەی (وحدت)، جوانبینی ناکێشێتە ناو ئەزموونە قووڵەکانی دەروونەوە"[٣٤١].

"لە عیرفانی تیۆریدا، (خوا)، جوانی (حسن)ی ڕەهایە و هەرچی جوانی دیکە هەیە وەك جوانێك، پەیوەستن بەو جوانە ڕەهایەوە و لەوەوە سەرچاوە

---

[٣٣٩] کریم زمانی، میانگر عیشق، (شرح موضوعی مثنوی معنوی مولانا جلال الدین محمد بلخی) نشر نی – تهران، ١٣٨٢ هـ.ش. ل٤٩.

[٣٤٠] ئەنوەر قادر محەمەد، لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، ل١١٦.

[٣٤١] مژده احمد زاده، تحلیل و تجربه زیبانگری در مولوی، ل٣٩.

دەگرن"[٣٤٢]. یان یەکێك لە ڕابەرە دامەزرێنەرەکانی سۆفیزم دەڵێ: "ئەگەر باش، یاخود چاك بیربکەیتەوە، دەبینی، کە هەمووان خوازیاری (حسن) جوانین و هەوڵ دەدەن خۆیان بە جوانی بگەیەنن. جوانییەك، کە خواستی هەمووانە، ئاسان نییە پێی بگەیت، چونکە گەیشتن بە جوانی تەنها لەڕێگەی عیشقەوەیە و عیشقیش ڕێگەی بۆ هەمووکەس کراوە نییە و لە هەموو جێگەیەك نیشتەجێ نابێت..."[٣٤٣]. هەروەها زانایەکی گەورەیتر دەڵێ: "جوانی (لطیفە)یەکە، کە لە زاتی مەعشوقدا بوونی هەیە و لێی جودا نابێتەوە..."[٣٤٤].

بەمجۆرە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی، کە (حسن) جوانی، تەنها (حسن الهی) جوانی خواییە، (لطیفە)یەکە وەك ئەوەی لە (قوللەی قاف) بێت، زۆر دوورە و گەیشتن پێی ئەستەمە، بەڵام ڕاستییە و چەندین پلە و وێستگە (مەنزڵگە)ی هەیە، کە پەی پێ بردنی بۆ هەمووان ئاسان نییە: "پەی پێ بردن بە هەر پلەیەکی ئەم جوانیە پەیوەستە بە پەی پێ بردنی بە (تجلی) مەعشوقی خواوەندەوە"[٣٤٥].

هەمان شارەزا بەردەوام دەبێ و دەڵێ: "لەم ڕوانگەیەوە جوانی خوایی و ڕووخساری دڵڕفێنی خواوەند، تەنها دەتوانرێت لە ئاوێنەی عیشقی عیرفانیدا، بدۆزرێنەوە. لە بنەڕەتدا گەورەترین (کشف) دۆزینەوەی عارفەکان، هەر

---

[٣٤٢] سەرچاوەی پێشوو.

[٣٤٣] سوهرەوەردی، مجموعە مصنفات شیخ الاشراق، تصحیح سید حسین نصر أنجمن، فلسفە ایران و انستیتوی ایران و فرانسە، چاپ دوم، ١٣٥٥، هـ.ش. ل٨٥.

[٣٤٤] احمد غزالی، سوانح، تصحیح: نصرالله پورجوادی، بنیاد فرهنگ ایران – تهران، ١٣٥٩هـ.ش. ل٨٣.

[٣٤٥] مژدە احمد زادە، تحلیل و تجربە زیبانگری در مولوی، ل٤٠.

ئەوەیەکە توانیویانە پەی بە جوانی (خوا) بەرن و لەمبارەوە بدوێن. پێشکەشکردنی وێنەی پڕ لە جوانی لەبارەی (خوا)وە گرنگترین بەرهەم و بەرەکەتی عیرفانی عاشقانە. خواوەند لە شێوەی مەعشوقێکی جوان و خۆشەویستدا (جلوە)ی کردووە لە دڵ و خەیاڵدانی عارف دا..."[٢٤٦].

ئەگەرچی لەوانەیە لەم بابەتی ئەزموونی ئیستاتیکییەی لای مەولانا و مەولەوی، وا جوانتر بێت، کە بۆ هەر پەرەگرافێك بەڵگەی شیعری لای هەردوو شاعیرەکە بهێنینەوە، بەڵام لەپێناو درێژ نەبوونەوەی بابەتەکە، بەم دوو نموونە شیعرییەی هەردوو شاعیر خۆمان دەبوێرین لە زۆر نووسینەوەی نموونەی شیعری. ئەمە جگە لەوەی ژیانی عیرفانی هەردوو شاعیر و کۆی هۆنراوەکانیان بەڵگەیە لەسەر ئەم ئەزموونە ئیستاتیکییەی عیشقی عیرفانی.

مەولانای ڕۆمی لە نموونەی هۆنراوەیەکیدا دەڵێت:

سایهٔ نوری تو و ما جمله جهان سایهٔ تو
نور، کە دیدەست، کە او باشد از سایە جدا[٢٤٧]

واتە: هەموومان لە سەرچاوەی جوانی و (نوری) تۆوە بوونمان هەیە بەجۆرێك وەك سێبەری جوانی تۆ واین.

مەولەوی تاوەگۆزی زۆر ڕوونتر دەڵێت:

ئەی گرد مەوجوودێ، جە تۆ گرت مایە
مەوجوود هەر تۆنی، ما سیوا سایە
پەنهان بی تەنها، وەحدەتت مەوج وەرد

---

[٢٤٦] مژده احمد زاده، تحلیل و تجربه زیبانگری در مولوی، ل٤٢.

[٢٤٧] مولانا جلال الدین رومی، کلیات شمس تبریزی، ل١٨٠.

پەی شناسایی زهورێوەت کەرد
بەوێت، جەعالەم بێ بەقای ناسووت
ئەر وەی گرد جیلوەی وەرین نەشناسووت
بەسەد جیلوەی تر بێ چوون و چەنی
شناسایی تۆم نمە بۆ، هەنی[٣٤٨]

ڕاستیەکی دیکەی زۆر گرنگ هەیە، کە پێویستە ئاماژەی پێ بدەین، ئەویش ئەوەیە، کە ئەزموونی جوانناسیانەی مەولانا و مەولەوی تەنها لە شێوازی دەروونیدا (کە ئەزموونی دۆزینەوەی خواوەندە) ناوەستێت، بەڵکو ئەم ئەزموونە بوونێکی دەرەکیشی هەیە، کە هەموو دیاردەکانی هەبوون دەگرێتەوە، بەواتایەکی تر تێڕوانینی جوانی ئەم دوو شاعیرە هەموو دیاردەکانی (آفاق) و (انفس)ی گرتووەتەوە، کە لە خودی خۆیدا ئەوە خواستێکی قورئانی و عیرفانیە.

ئەنوەر قادر محەمەد لەمبارەوە ئاماژە بە گوتەی ڕۆژهەڵاتناسێکی ڕووسی دەکات و دەڵێت: "هەر دەربارەی سۆفیزم و جیاوازیی ڕێبازەکانی، ڕۆژهەڵاتناسی سۆڤییەتی یی. س. براگینسکی دەڵێ: "... لەم باس و دەمەتەقێیەدا دەتوانین سێ ڕێبازی بنەڕەتی چەمکی سۆفی (یەزدانی گەردوونی) دیاری بکەین: مۆنیستی (تاکییەتی گەردوون)، کە سۆفی بە ڕاستی گەیشتوو، دەبێتە دوومانی یەزدان، ئونیڤێرسالی (سەرجەمیەتی، هەمەکی)، کە سۆفی لەگەڵ زاتی خوادا، کە لە گەردووندا بڵاوبووەتەوە، دەتوێتەوە..."[٣٤٩].

---

[٣٤٨] دیوانی مەولەوی، ل٣١.

[٣٤٩] ئەنوەر قادر محەمەد، لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، ل٢٤٤.

لە کۆتایی ئەم بەشەدا، کە ئامانجمان ڕانانێکی خێرای دیدی عیرفانیانە بوو بۆ ئیستاتیکا و زۆر بەکورتیش ئاماژەمان دا بە ئەزموونی ئیستاتیکیی مەولانا و مەولەوی، کە لەسەر زەمینە و بنەمایەکی مەعریفەی عیرفانیە، دەڵێین، جوانناسی جۆرە تێڕوانینێکی بڵند و باڵایە، کە لەو پێگەی خۆیەوە چاودێری دەکات و لەو بڵندییەوە دەڕوانێتە جیهان و دیاردەکانی و لەم ڕوانگەوە سروشتی ژیان و مرۆڤ و مرۆڤایەتی شیکاری بۆ دەکرێت. ئەوەش بە ڕای من هەمان بابەتی (شکۆمەندی – بەرزی)یەیە، کە وەك کاتیگۆرییایەکی ئیستاتیکیی باسی کردووە: "لەگەڵ ئەمەشدا لە بیر و بۆچوونەکانی پسیڤدۆ – لۆنگیندا مۆرکی ئایینی بە ماریفەتی شکۆمەندی ئەوەوە دیارە. لە شکۆمەندیدا ئەو هێز و توانا و مەزنیی یەزدان لە هێزەکانی سروشتدا دەبینێ..."[350].

"شکۆمەندی بەگوێرەی پسیڤدۆ – لۆنگین، مرۆڤ تا ئاستێکی یەزدانی بەرز دەکاتەوە، نەمری دەکا..."[351].

"جوانناسی، یاخود جوانبینی، بەڵگەی ئاشکرای هەنگاو هەڵگرتنی کەسایەتی مرۆڤە لە پلەیەکی نوقسانەوە بۆ پلەی کامڵبوون"[352].

لە بەشی دواتردا بەشێوەیەکی کۆنکرێتی پەیوەست بە هونەری (دوالیزمی دژیەك) باس لە جوانی شیعر دەکەین.

---

[350] ئەنوەر قادر محەمەد، ئیستاتیکا، کەرەسەی کۆرسی دووەمی دکتۆرا بۆ خوێندکارانی ئەدەب، ٢٠١١ – ٢٠١٢، ل٤٢.

[351] سەرچاوەی پێشوو.

[352] عبدالکریم سروش، بسط تجربهٔ نبوی، مؤسسهٔ فرهنگی صراط، تهران، ١٣٧٨هـ.ش. ل١٨٢.

## ٢-٣/ هۆکانی جوانی شیعر (پەیوەست بە دوالیزمی دژیەك)ەوە:

جوانی لە دەربڕیندا تایبەت نییە بە سەردەمێك، هەروەك چۆن (خوێ) لە هەموو کات و شوێنێکدا بۆ تام و چێژ بەخشین بە خواردن پێویستە، بەهەمانشێوە جوانی ڕۆڵی هەیە لە چێژ بەخشین بە چۆنیەتی دەربڕین. شیعر وەك باڵەخانە و کۆشکێك وایە، کە جوانکاری جۆراوجۆر دەیڕازێنێتەوە و جوانتری دەکات لەوەی، کە هەیە.

پرسیاری بنەڕەتی لێرەدا ئەمەیە، ئەو هۆیانە چین، کە دەبنە مایەی جوانی بەخشین بە شیعر؟ لە وەڵامدا دەڵێین، هۆکانی جوانکردنی شیعر زۆرن. "لەڕاستیدا ئەوەی، کە گوتە و دەربڕین لە سنووری زمانی ئاساییەوە دوور دەخاتەوە و لە چوارچێوەی شیعری نزیك دەکاتەوە، هەر ئەوەیە، کە پێشینان ناویان ناوە پاراوی و ڕەوانی. پاراوی لەڕوانگەی (لفظی) وشە و چۆنیەتی دەربڕینەوە، یاخود کەرەسەکانی دەربڕینەوە، ڕەوانیش لەڕوانگەی واتای (معنوی)ەوە. پاراوی لەپێشترە لە ڕەوانی، چونکە هەر دەربڕینێك نەگاتە پلەکانی پاراوی، مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی بۆ سنووری ڕەوانبێژی نییە"[٣٥٣]. هەر هەمان زانا لەسەر بۆچوونەکانی بەردەوام دەبێ و دەڵێ: "لەبارەی پاراوییەوە گوتوویانە، گوتەی پاراو ئەوەیە، کە هیچ عەیبێکی نەبێت. ئەزیەتی گوێی بیسەر نەدات، بەکارنەهاتبێت بەجۆرێك، کە زۆر باو بێت، بێزاریەك لە ڕیزبەندی پیت و وشەکاندا بەدینەکرێت، دەرئەنجام پێویستە گوتەیەك بێت دلگیر و خۆش ئاواز و مایەی

---

[٣٥٣] محمد فشارکی، نقد بدیع، سازمان مطالعه وتدوین کتب علوم انسانی دانشگاهها، مرکز تحقیق و توسعهٔ انسانی، چاپ چهارم، ١٣٧٩، هـ.ش. ل١٥٨.

تێگەیشتن و سازگار و ساکار و پاراو بێت. پاش ئەوە بابەتەکانی (ڕەوان)بوون دێتە پێشەوە. دەربڕین و گوتن بەجۆرێك، کە لەو حاڵەتەدا پێویست بکات و وەڵامدانەوەی خواستی چۆنیەتی دەربڕینی حاڵەتێکی دیاریکراو، ئەوە بابەتی بنەڕەتی ڕەوانی بوونە و هەروەها دەربڕینی واتایەك بە چەندین شێوازی جیاواز، ڕوویەکی دیکەی ڕەوانبێژی بوونمان بۆ دیاری دەکات"[٣٥٤]. هەردوو بابەتی پاراوی و ڕەوانی، هەریەکەیان بە چەندین جۆر و شێواز ڕۆڵیان هەیە لە گواستنەوەی گوتەی ئاسایی بۆ شیعر و کاریگەریان هەیە لە جوانکردنی هۆنراوەدا، بەڵام ئەوەی لێرەدا پەیوەستە بە بابەتەکەی ئێمەوە دوالیزمی دژیەکە وەك هونەرێکی جوانکاری دەربڕین لە هەردوو بابەتی پاراوی و ڕەوانیدا.

لەم چوارچێوەیەدا بابەتی دوالیزمی دژیەك، وەك هونەرێکی جوانکاری شیعر و جۆرێك لە دەربڕینی ئیستاتیکایانەی شیعری عیرفانی، چەندین ڕۆڵی بنەڕەتی لە ئەستۆیە، کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەشێوەیەکی کۆنکرێتی، کە پەیوەندیی بە بابەتەکەمانەوەیە ڕەهەندی ئیستاتیکیی (دوالیزمی دژیەك) باس دەکەین و دواتریش هەر پەیوەست بە دوالیزمی دژیەکەوە لەبارەی ڕەهەندە جوانکارییەکانی میوزیکی شیعری و (خەیاڵ) دەدوێین.

### ٣-٢-أ/ دوالیزمی دژیەك و سەرنجێکی ئیستاتیکییانە:

گونجاندنی ئەوەی، کە هەیە، جۆرێکە لە ڕێکخستن و پێکهێنان و هاوئاهەنگی نێوان چەند شتێك. مرۆڤ چێژ لە هەر جۆرە ڕێکخستن و گونجاندنێك وەردەگرێت و بەپێچەوانەشەوە خۆشی لە پرژوبڵاوی و ناڕێکی

---

[٣٥٤] سەرچاوەی پێشوو.

نایەت، هەر لەبەرئەوەیە، کە زەینی مرۆڤ بەردەوام بەدوای دۆزینەوەی پەیوەندی و پەیوەست کردنەوە و هاوئاهەنگی دایە لەنێوان دیاردەکاندا[٢٥٥].

وەك (ئەرێك نیوتن) دەڵێت: "گومان لەوەدا نییە، کە ئەگەر مێشکی مرۆڤ تینوویەتییەکی هەیە ئەوا ئەو تینووبوونەی بۆ پەیبردنە بە هەقیقەت و ڕاستییەکان و دۆزینەوەی پەیوەندییە لەنێوانیاندا"[٢٥٦].

زەینی مرۆڤ بەردەوام لە هەوڵی دۆزینەوەی پەیوەندی و گونجاندنایە لەنێوان دیاردەکاندا، لەنێوان هەموو دیاردەکاندا، تەنانەت لەنێوان (فیل و مێروولە)، (ڕووناکی و تاریکی)...هت بەکورتی گونجاندن و پەیوەستکردنەوە، یەکێکە لە هۆکارەکانی جوانی...

ئەبو ڕەیحانی بیرونی باوەڕی وایە: "دەروونی مرۆڤ مەیلی هەیە بۆ هەر شتێك، کە گونجاندنی تێدا بێت و بێزارە و ڕوو وەردەگێڕێت لە هەر شتێکیش، کە نەگونجان و ناڕێکی تێدا بێت.."[٢٥٧].

هەندێك لە زانایان بنەڕەتی جوانی دەگێڕنەوە بۆ هاوئاهەنگی گونجان. گونجان واتە پەیبردن بە ڕێکخستن و پەیوەندی نێوان دیاردەکان. لەو ڕوانگەوە مایەی شادی و چێژ بەخشینە بە مرۆڤ.

بە گوتەی دکتۆر (خانلری): "هەر جۆرە گونجاندن و بەرامبەر یەك دانانی دوانەیەك بۆ بەراوردکردن، لەنێوان دیاردە و پارچە جیاوازەکاندا، جۆرێك لە

---

[٢٥٥] تقی وحیدیان کامیار، بدیع از دیدگاه زیباشناسی، چاپ چهارم، ١٣٨٨هـ.ش. ل٥٤.

[٢٥٦] اریك نیوتن، معنی زیبایی، ترجمه‌ٔ پرویز مرزبان، بنگاه ترجمه ونشر کتاب – تهران ١٣٤٢ هـ.ش. ل٦٤.

[٢٥٧] محمد رضا شفیعی کدکنی، موسیقی شیعر، ل٩٥.

یەکبوون و یەکییەتی دروست دەکات، کە دەرئەنجام پەیبردن بە هەموو بەشە جیاوازەکان، خێراتر و ئاسانتر دەکات و هەمان هۆکار دەبێتە مایەی هەستکردن بە ئارامی و چێژ وەرگرتن"[٢٥٨].

هونەرەکانی جوانکاری لە جۆرەکانی گونجاندن و پێکەوە ڕێکخستن و هاوئاهەنگی زۆرن، بەڵام ئەوەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا، ئێمە وەك نموونەیەکی باڵای ئیستاتیکیی باسی لێوە دەکەین دوالیزمی دژیەك و جۆرەکانیەتی، کە لێرەدا بە چەند تەوەرەیەك ئاماژەی پێ دەکەین:

**ڕۆشنگەری:**

دوالیزمی دژیەك لە ڕوانگەی ناسینەوەی دیاردە و بابەتەکاندا، گەورەترین ڕۆڵی هەیە. لە بنەڕەتدا یەکێك لە هۆکارەکانی ناسینی دیاردەکانی جیهان، ناسینی دژەکەیەتی. بۆ نموونە ئەگەر (تاریکی) نەبووایە (ڕووناکی) هیچ مانایەکی نەبوو، یاخود ئەگەر (مەرگ) نەبووایە (ژیان) هیچ بەهایەکی نەبوو.

مەولانای ڕۆمی دەڵێت:

هر نور را ناری بُوَد، با هر گُلی خاری بُوَد
بهرِ حَرَس ماری بُوَد بر گنج هر ویرانه‌ای
ای گلشنت را خار نی، با نورِ پاکت نار نی
بر گرد گنجت مار نی، نی زخم و نی دندانه‌ای[٣٥٩]

---

[٢٥٨] پرویز ناتل خانلری، وزن شعر فارسی، انتشارات سخن تهران، ١٣٥٢ هـ.ش. ل٦.

[٣٥٩] کلیات شمس تبریزی، ج٢، ل١١٧٩.

مەولانا لەم هۆنراوەیەدا حەقیقەتی ژیانی دەردەخات، کە پێکەوەبوونی دژەکانە: (هەموو ڕووناکییەك ئاگرێکی هەیە)، (هەموو گوڵێك دڕکێکی هەیە)، (لەسەر هەموو کوپەڵەیەکی ئاڵتونی ژێر زەوی وێرانەیەك، مارێکی لەسەرە)....هتد

مەولەوی تاوەگۆزیش هەمان هاوکێشەی بوون و ژیان دەخاتەڕوو، کە پێکهاتەیەکە لە دژەکان و دەڵێت:

حەیات جە زوڵمات جیا نمە بۆ
کاوە وەبێ بەرگ سیا نمە بۆ[٣٦٠]

واتە: ئاوی حەیات (وەك لە ئەفسانەی کۆنیشدا هاتووە) لە زوڵماتدایە، واتە لەناو چەندین پلە و قۆناغی تاریکیدایە، (میسك)یش، کە بۆنی خۆشە لە کیسەیەکی ڕەش دایە.

لەم ڕوانگەوە، شاعیر بۆ ڕوونکردنەوەی بابەتەکان، سەرەتا خودی بابەتەکان دەخاتەڕوو، پاشان ئاماژە بە دژەکەی دەکات، چونکە گوێگر (یاخود خوێنەر) هەموو بابەتێك بە تەنیشت دژەکەیەوە دەبینێت و دوو وێنەی ڕوون، یەکێکیان ئەرێنی و ئەوی دیکەیان نەرێنی لە زەینیدا دەردەکەوێت، دەرئەنجام دەتوانێت بە ئاسودەیی بیر لەوانە بکاتەوە و بڕیار بدات بەبێ ئەوەی پێویستی بەوە بێت شاعیر، یاخود نووسەر لەبری ئەو بڕیار بدات یان ئامۆژگاری بکات، یاخود فەرمانی بەسەردا بکات، لەبەرئەوەی هونەری دوالیزمی دژیەك دەبێتە مایەی ئەوەی، کە مرۆڤ خۆی بڕیار بدات و دەرفەتی بیرکردنەوە و هەڵسەنگاندن و گەیشتنە دەرئەنجامی پێ دەدات.

---

[٣٦٠] دیوانی مەولەوی، ل١٤٢.

**ئاسودەیی:**

ئامادەبوونی دیاردەیەك لە زەینی مرۆڤدا لەسەر بنەمای (دژیەك بوون)، دەبێتە هۆی بانگهێشت و ئامادەکردنی (دژەکەی)، بەواتایەکی تر زەینی مرۆڤ پەیوەندی دروستدەکات لەنێوان دیاردەیەك و دژەکەیدا. ئەم پەیوەندی دروستکردنە ئەگەر (نوێ) بێت مایەی شادی و ئاسوودەییە، بۆ نموونە کاتێك بیر لە بچووکی (مێشوولە) دەکەینەوە، ئەگەری ئەوە هەیە، کە وێنەی (فیل) لە زەینماندا دروست ببێت. مەولانای ڕۆمی دەڵێت:

کو خمرِ تن؟ کو خمرِ جان؟ کو آسمان؟ کو ریسمان؟

تو مستِ جامِ اَبْتری، من مستِ حوضِ کوثرم[٣٦١]

(شەرابی جەستە، شەرابی گیان)، (ئاسمان و ڕێسمان)، (جام ابتر، حوض کوثر) جامی نەزۆك و حەوزی کەوسەری بەهەشت، ئاماژەیە بە سورەتی (الکوثر)، کە (ابولهب) تانەی لە پێغەمبەر (خ) دەدا، کە نەزۆکە و کوڕی نییە (أبتر)، بەڵام (خوا) لەو سورەتەدا وادەی (حەوزی کەوسەر) بە پێغەمبەر (خ) دەدات و (ابولهب) بە (أبتر) ناوزەد دەکات، چونکە هیچ کەس شوێن بیروباوەڕی ئەو ناکەوێت.

هەروەها مەولەوی تاوەگۆزیش لە هۆنراوەیەکیدا چەندین دوالیزمی دژیەکی ڕیز کردووە و دەڵێت:

یەکێوەن جە لام شادی و ڕەنجووری

کەیفی و بێ کەیفی و نزیکی و دووری

---

[٣٦١] کلیات شمس تبریزی، ج١، ل٧١٠.

وەشي و ناوەشي تەفاوت زانۆ

مەلىّ نەزانۆ هەر پەلىّ شانۆ

مەيل و قين هەردوو هەر جە شەخسێوەن

جەريمە و خەلآت شێوەی كەسێوەن[٣٦٢]

**جەخت كردنەوە:**

**دواليزمی دژيەك دەتوانێت جۆرێك لە جەخت كردنەوە بێت.**

**مەولانای ڕۆمی لە هۆنراوەيەكيدا دەڵێت:**

خُم، كه در و باده نيست، هست خُم از باد پُر

خُم پر از بادكی، سرخ كند روی ها؟

هست نهی خارها، نيست درو بوی گُل

كور بجويد ز خار، لطفِ گُل و بوی ها؟[٣٦٣]

**جەختكردنەوەكە لە چوار جار هێنانی (هست) و (نيست) دايە، كە هەمووی جەختكردنەوەيە لە حاڵەت و كردارێك.**

**مەولەوی تاوەگۆزيش دەڵێت:**

زيا بينايم، نوری چەمانم

سەرمايەی حەيات، دين و ئيمانم

**(سەرمايەی ژيان، كە ماددەيە و سەرمايەی قيامەت، كە دين و ئيمانە، هەردووكی جەختكردنەوەيە بۆ خۆشەويستی).**

---

[٣٦٢] **ديوانی مەولەوی، ل٢٠٧.**

[٣٦٣] **كليات شمس تبريزی، ل١٥٠.**

مەدیە وە تۆمار کردەی ویەردەم

بدیە وە زەردیی ڕووخسار ئاوەردەم[٣٦٤]

(مەدیە) و (بدیە)، یاخود (ویەردەم) و (ئاوەردەم)، دوالیزمی دژیەکن بۆ جەختکردنەوە.

**بەرجەستەکردن و ڕووخسار بەخشین بە سۆز و چەمکەکان:**

دوالیزمی دژیەك وێڕای ڕۆشنکردنەوە و تیشك خستنەسەر چەمك و واتاکان توانای بەرجەستەکردن و ڕووخسار بەخشینی هەیە و ئەم ڕۆڵەش لەڕوانگەی ئیستاتیکاوە، گرنگترین ڕۆڵ و دەرئەنجامە.

"سارتەر" فەیلەسوف و ڕەخنەگری ئەدەبی فەرەنسا، بابەتێکی تێروتەسەلی لەبارەی (شیعر)ەوە هەیە، پەیوەست بەم خاڵەی ئێمەوە لەبارەی شیعرەوە دەڵێت: "لە شیعردا وشەکان دەبنە شتانێکی هەستپێکراو. هەر وەك چۆن مرۆڤ لەبەردەم بابەتە ماددییەکاندا دەوەستێ و بە هەستەکانی هەستیان پێ دەکات و لەگەڵیان دەژی... وشەکانی نێو شیعریش پێویستە هەڵگری هەمان چۆنییەتی بن. نووسینی ناو ڕۆژنامەیەك بەراورد بکەن لەگەڵ شیعری شاعیرێکدا، بۆ نموونە هەواڵێك لە ڕۆژنامەیەکدا دەخوێنیتەوە، پاش چەند ساتێك دوای لابردنی ڕۆژنامەکە هەواڵەکە و نووسینەکەت لەیاد دەچێت، بەڵام ناتوانیت لەگەڵ شیعردا بەوجۆرە ڕەفتار بکەیت.."[٣٦٥].

---

[٣٦٤] دیوانی مەولەوی، ل٩٢.

[٣٦٥] سارتەر، ادبیات چیست، ترجمه ابوالحسن نجفی، و مصطفی رحیمی، انتشارات نی – تهران، ١٣٥٢ هـ.ش. ل١٦٣.

مەولانای ڕۆمی (لە ڕاستیدا نازانم کام هۆنراوەی وەك نموونە بنووسم، چونکە هەموو هۆنراوەکانی مەولانا، وێنەی بەرجەستەیە) لە هۆنراوەیەکیدا دەڵێت:

جمله یارانِ تو سنگ اند و تویی مرجان چرا ؟
آسمان با جملگان جسم است و با تو جان چرا ؟
چون تو آیی جزو جزوم جمله دستك می زنند
چون تو رفتی جمله افتادند در افغان چرا ؟[٣٦٦]

واتە:

یارانی هاودەستەی تۆ وەك (بەرد) وان، بەڵام تۆ وەك (مەرجان)ی بۆچی؟
ئاسمان لەگەڵ هەمووواندا وەك (جەستە) وایە، بەڵام لەگەڵ تۆ وەك (گیان) وایە بۆچی؟
کە تۆ دێیت هەموو پارچەکانم، یاخود بەشەکانی جەستەم بەگشتی خۆشی و شادیانە
بەڵام، کە تۆ دەڕۆی، هەموویان بە دەستە و بەگشتی، هاوار و گریانیانە

مەولەوی تاوەگۆزیش لە هۆنراوەیەکدا هەموو بابەت و حاڵەتە دەروونییەکان لە نیوە بەیتی دواتردا بەرجەستە دەکات و دەڵێت:

من شەویٚ ناڵەم جۆش ئاوەردە بۆ
سەگی ئاسانەت بێدار کەردە بۆ (ناڵەی من و خەوتنی سەگی ئاسانەت)
یا ناستە بۆ سەیل دیدەم، نەفەسیٚ
نەسیم گەرد پات بەرۆ پەی کەسیٚ (سەیلی دیدەی من و گەردی پای تۆ)

---

[٣٦٦] کلیات شمس تبریزی، ج١، ل٢٢٤.

جەمینت زەحمەت نیگام کێشابۆ

کەفی پات وەخار دیدەم ئێشابۆ[٣٦٧] (جەمینت زەحمەتی نیگام، کەفی پات و خاری دیدەم)

## هێنانەکایەی سەرسووڕمان، دەربڕینێکی چاوەڕوان نەکراو و لەناکاو:

هەندێ لە فەیلەسوف و زانایانی ئیستاتیکا لەوباوەڕەدان، کە جوانی و بەهای دەقی ئەدەبی لە سازدانی سەرسووڕماندایە. فۆرمالیستە ڕوسەکانیش لەسەر ئەو ڕایە بوون، کە ئەوەی زمانی هەواڵ دەگۆڕێت بۆ زمانی ئەدەب دۆزینەوەی نوێ و هێنانەناوی سەرسووڕمانە، چونکە زمانی هەواڵ، زمانێکە دووبارە بووەوە و ئاسایی و ناسراو و کۆن، کە تەنها هۆکارێکە بۆ جێبەجێکردنی پەیوەندی و گەیاندنی هەواڵ.

لەم بارەیەوە وتراوە: "دەربڕین هەرچەند زیاتر نامۆیی و داهێنان و چێژی تێدا بێت و خەیاڵ و ئەندێشەی زیاتر پێویست بێت، ئەوا زیاتر دەبێتە مایەی کاردانەوەی دەروونی مرۆڤ لەچاو ئەو جۆرە گوتە و دەربڕینەی، کە پلە بە پلە و ناغافلگیرانە دێت و گوتن و هاتنی پێشتر زانراوە. هەربۆیە گوتە و دەربڕینێك، کە یەکەمجار بەرگوێ بکەوێت چێژبەخشە و پاشان لەگەڵ زۆر دووبارەکردنەوەی چێژی نامێنێت"[٣٦٨].

---

[٣٦٧] دیوانی مەولەوی، ل٣٤.

[٣٦٨] نصیرالدین طوسی، اساس الأقتباس، بە تصحیح مدرس رضوی، دانشگاه تهران، ١٣٢٦ هـ.ش. ل٥٩٠.

دکتۆر عبدالکریم سروش، لەم چوارچێوەیەدا و لەبارەی جوانی دوالیزمی دژیەکەوە دەڵێت: "ئەمە سنعەتێکی چێژبەخشە، نهێنی چێژ بەخشیەکەشی نزیکە لەوەدا بێت، کە پێچەوانەی نەریت و لۆژیکە، واتە دوو بابەت، کە بە ڕووکەش پێکەوە دژن، کۆدەکاتەوە و هەر ئەمەش مایەی کەمەندکێشکردنی زەینە و گرێدانی دەربڕینە بە ناخی خودی تاکەکانەوە، هەر دەڵێی ڕۆچوون لە بابەتەکانی، کە ناتەبایە لەگەڵ لۆژیك و نەریت دا، عادەتی زەینە، کە بێگومان هەر جۆرە عادەتێك مایەی غافڵبوونە، هەربۆیە هەرکات ڕووبەڕووی بابەتێك دەبێتەوە، کە جیاواز و ناکۆکە لەگەڵ نەریت و باودا، خێرا ڕادەچڵەکێ و هۆشیار دەبێتەوە و بە گوێ قوڵاخبوون و وریایی زیاترەوە گوێ بۆ گوتەکان هەڵدەخەیت. لە ڕاستیدا ڕۆڵی دوالیزمی دژیەك و پارادۆکس، وروژاندنی سەرسوڕمانە لەڕێگەی پشت بەستن بە بابەتانێکی ناتەبا و جیاواز لەگەڵ نەریتی باو و لۆژیك"[٢٦٩].

مەولانای ڕۆمی لەم هۆنراوەیەدا دوالیزمی دژیەك دەکاتە چوارچێوەی بابەتە سەرسوڕهێنەرەکان و دەڵێت:

آه چه بی رنگ و بی نشان که منم  
کی ببینم مرا چنان که منم؟!  
گفتی: "اسرار در میان آور."  
کو میان اندر این میان که منم؟  
کی شود این روانِ من ساکن؟

---

[٢٦٩] تقی وحیدیان کامیار، متناقض نما در ادبیات، نشریه دانشکده ادبیات وعلوم انسانی، مشهد، شماره ٣٠٤، ل٢٨٨.

این چنین ساکنِ روان که منم[٢٧٠]

واته: ئای من چەندە بێ ڕەنگ و بی ناونیشان و نادیارم
ئیتر کەوایە چۆن من خۆم وەك خۆم ببینم؟!
گوتت: "نهێنییەکان بهێنەرە ئەم ناوەڕاستە"
کام ناوەند، کە لەم نێوەندەدا من خۆمم؟
ئەم ناخ و دەروونەی من کەی ئارام دەگرێ؟
کە من خۆم بەمشێوەیە نیشتەجێی ناخ و دەروونم
مەولەوی تاوەگۆزیش دەڵێت:

هیچ کەس نەواچۆ وە فەرهاد ڕەندەن
نەقش شیرینش نە رووی سەنگ کەندەن
دەك ڕێزان دەس با وەر جە گیان سەندەن
کێ ئەڵماس نە رووی دیدەی وێش شەندەن[٢٧١]

**<u>دوالیزمی دژیەك گوتە و دەربڕینێکە، کە ناسراوە و ئاشنایە بەزەین و خەیاڵی خەڵکی:</u>**

لەسەر ئاستی زەین و بیرکردنەوەی گشتی و دەربڕینەکەشی، کە بەشێوازێکی مایەی سەرسوڕمانە، دەبێتە مایەی بەرجەستەبوونی زاراوە و واتا، دەبێت سەرەتا لە زین و بیری گشتی خەڵکیدا بناسرێت و شوناسی هەبێت تا لەدەربڕینێکی نوێدا جارێکیتر شوناسێکی نوێی پێ بدرێتەوە.

---

[٢٧٠] کلیات شمس تبریزی، ج٢، ل٩٠٩.

[٢٧١] دیوانی مەولەوی، ل٦٨٢.

مەبەست لە وشە و زاراوەی ناسراو و خاوەن شوناس لای زەینی گشتی هەموو ئەو بابەت و مەسەلانەن، کە دەرئەنجامی بەکارهێنانی بەردەوام بەشێوەیەکی خودیانە بەرپەرچیان دەدەیتەوە، بۆنموونە لەژیانی ڕۆژانەماندا، ئێمە دەڵێین: "قۆڵی بڕیم"، یاخود "سابوونی خستە ژێرپێی"و هیچ کات قسەکەر بیرناکاتەوە، کە چ گوتەیەکی نامۆی وتووە، چونکە قسەکەر وەستان و بیرکردنەوەی بۆ واتای زاراوەکان نییە و کاری بەسەر واتای ڕووکەش و فەرهەنگی وشەکانەوە نییە و پێشوەخت واتاکەی زانراوە[٢٧٢]، بەڵام ئەگەر بڕوانینە ئەم هۆنراوەی مەولەوی تاوەگۆزی، کە دەڵێت:

وەختی چەم نەچەم شێوەت دیاربی
جە لام فەسڵی وەسڵ بەزمی ئەغیاربی
ئیسە لێلایی گرتەن دوو دیدە
خەڵوەتەن، سابۆ ئەی بەر گوزیدە[٢٧٣]

لێرەدا خێرا و ڕاستەوخۆ، کە بۆیەکەمجار هۆنراوەکە دەخوێنینەوە، بەشێوەیەکی خێرا پێی کاریگەر نابین و تێیناگەین وەك ئەوەی خێرا لە (سابوونی خستە ژێرپێی) تێدەگەین، چونکە ئەمەی دووەمیان زمانی ڕۆژانەی قسەپێکردنە، بەکورتی هاوکێشە و دوانەکانی دوالیزمی دژیەك بەزەینمان ئاشنان، بەڵام لە زمانی ئەدەبیدا پێویستی بەبیرکردنەوە و تێفکرانی چێژبەخشانە و قووڵ هەیە بۆ گەیشتن بە مانا و مەبەستەکان.

---

[٢٧٢] تقی وحیدیان کامیار، متناقض نما در ادبیات، نشریه دانشکده ادبیـات و علـوم انسـانی، دانشگاه مشهد شماره ٤، ل٣٦.

[٢٧٣] دیوانی مەولەوی، ل٥٣١.

**واتا و مەبەستی ئەو دوودێڕە هۆنراوەی مەولەوی تاوەگۆزی ئەوەیە کە:**

**کاتێك چاوەکانم دەیبینی و کوێر نەبووبووم، لای من وەرزی وەسڵ و بەیەکتر شادبوون وەك بەزمی دوژمنکارانە و ناحەزان وابوو، چونکە چاوەکانم ڕێگربوون لەنێوان من و تۆدا و تۆ لە چاوەکانمدا دەمایتەوە، بەڵام ئێستا، کە کوێربووم و چاوەکانم نابینن وەرە نێو خەیاڵمەوە تا لەوێ دوو بەدوو خەڵوەتت لەگەڵ بکەم و کەس لەنێوانماندا نەبێت، کە ئەمەیان بەیەکگەیشتنێکی چێژبەخشە!!**

**ناڕوونی:**

**شیعر دەربڕینێکە ناڕاستەوخۆ و هەڵگری ناڕوونییە، ناڕوونی بەو واتایەی، کە ڕاستەوخۆ و خێرا و بەسانایی واتا نادات بەدەستەوە هەر بۆیە پێویستی بە هۆشیاری و وردی و تیژبینی هەیە، کە دەرئەنجام خۆشی و چێژ دروست دەکات.**

**مەولانای ڕۆمی دەڵێت:**

جسم ها را جان کنند و جانِ جاویدان کنند

سنگ ها را کانِ لعل و کفرها را دین کنند

از همهٔ پیداترند و از همه پنهان ترند

گر عیان خواهی به پیش چشم تو تعیین کنند[٣٧٤]

**چۆن جەستە دەبێتە گیان و گیانی نەمر، بەرد دەبێتە کانزای بەنرخ و کوفر دەبێتە دین، چۆن لەهەمووان پەیداترن و لەهەمووان نهێنی..؟!؟!**

**مەولەوی تاوەگۆزیش دەڵێت:**

های نە فەرقش هەن ئەو سەدا و تەئسیر

---

[٣٧٤] **محمد رضا شفیعی کدکنی، غزلیات شمس تبریز، چ١، ل٤٤٧.**

تا ئەو لاونا و ئەو مەزە و ئەو شیر
هەر تفلی بیٚ شك نەی بێشك خەفتەن
جەی دایە بڕیان بەو دایە جفتەن[٢٧٥]

لێرەدا باسی دوو بێشکەیە، کە یەکەمیان بێشکەی ژیانە و دووەمیان قەبرە وەك بێشکە.

<u>دوو ڕەهەندیبوون:</u>

دوالیزمی دژیەك یەکێکە لەو نوێگەری و داهێنانەی لەدەربڕیندا، کە دوو ڕەهەند دەداتە گوتە و دەربڕین، لایەن و ڕەهەندێکی گوتەکە، کە مایەی سەرسوڕمانە و بەئاسانی جێگای باوەڕ نییە، بەڵام ڕەهەندی دووەمی ئەو گوتەیە، ڕاستیەکی لەخۆی گرتووە و ئەمەش مایەی سەرسوڕمانە[٢٧٦].

بۆنموونە وەکو "تاریکتر شدن از چراخان" واتە تاریکتر لە چراخان لەڕووی واتای ڕووکەشەوە هەڵەیە و دژیەکە. چۆن تەنیایی ناوگۆڕ لە چراخان تاریکترە، چونکە چراخان تاریك نییە؟!.

بەڵام ئەو ڕەهەندەی، کە دوالیزمی دژیەك، زەینمان ناچار دەکات زیاتر بیربکەینەوە و ڕەهەندی ڕاستەقینەی هۆنراوەکە بدۆزینەوە، کە ئەم تاریکییە، تاریکی باو و ڕووکەش نییە، بەڵکو تاریکی دڵەکانە، کە دەرئەنجامی تاوانە و بەچراخانیش ڕووناك نابێتەوە.

---

[٢٧٥] دیوانی مەولەوی، ل٤٧٦.

[٢٧٦] تقی وحیدیان کامیار، متناقض نما در ادبیات، نشریه دانشکده ادبیات و علوم انسانی، دانشگاه مشهد شماره ٤، ل٢٩١.

**کورتبڕی:**

بەگشتی لە دوالیزمی دژیەکدا کورتبڕی بەدیدەکرێت، واتە گوتەیەك، کە بەدەربڕین کەمە، بەڵام واتایەکی زۆر دەگەیەنێت. هەندێك بابەت هەن، کە لەچوارچێوەی دوالیزمی دژیەکدا، نەك تەنها کورتبڕی هەڵناگرن، بەڵکو جادوی دوالیزمی دژیەك لەو دەربڕینەدا پێویستی بە درێژەپێدانە، چونکە پێویست و چێژبەخشە[٢٧٧].

بۆنموونە ئەو هۆنراوەی مەولەوی تاوەگۆزی، کە بۆ مەرگی (عەنبەرخاتوون)ی خێزانی گوتوویەتی لەو چامەیەدا چەندەها سیفەتی بەرامبەر و دژیەکی داوەتە پاڵ (ئەو)و (من)، دەڵێ:

شورای عاشوران دیسان بەزمش بەست
(موحەرەم) ئاما (مەحرەم) شی نەدەست
ئەو خەریك نە چۆڵ شاری عەدەمدا
من نە (کەربەلای) سارای ماتەمدا
ئەو (یەزید)ی مەرگ وە ئەسیر بەردە
من زادەی (زیاد) خەم یەخسیر کەردە[٢٧٨]....

چەندین چامەی تری ئاوامان لای مەولەوی و مەولانای ڕۆمیش هەن، کە لێرەدا بە ئاماژەپێکردنی زۆر جێگایان نابێتەوە، بەڵام بە وردبوونەوەیەك لە دیوانی هەردوو شاعیر ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێت.

---

[٢٧٧] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩٢.

[٢٧٨] دیوانی مەولەوی، ل٣٦٨

لەڕاستیدا لەو جۆرانەی دوالیزمی دژیەکدا، کە لەسەر بنەمای دەربڕینن لەجۆرەکانی خوازە، خواستن، یاخود لێکچوون، بەگشتی کورتبڕییان تێدا نییە، بەڵام لەو جۆرە دوالیزمانەدا، کە لەسەر بنەمای کۆی دەربڕینەکەیە، واتە گەیشتن بەواتای بنەڕەتی و ڕاستی دەربڕینەکە پێویستی بەڕاڤەکردن و ڕوونکردنەوە هەیە، لێرەدا و لەم جۆرەیاندا کورتبڕی هەیە[٢٧٩]، بۆ نموونە:

جەو بیٚ قیمەتی وە قیمەت یاوام

وە پایەی ڕوتبەی عالی سەرساوام[٢٨٠]

یاخود مەولانای ڕۆمی دەڵێت:

عجایب اند درختانش، بکر و آبستن،

چو مریمی که نه معشوقه و نه شو دارد[٢٨١]

واتە: دارەکانی مایەی سەرسوڕمانە، لەوەدا، کە کچن (نۆبەرەن) و شیردەرن هەروەك مریەم، کە کچ بوو، بەڵام منداڵی شیردەری هەبوو کەچی نە مێرد و نە پەیوەندی ناشەرعی هەبوو.

ئەم دوو هۆنراوەیە پێویستیان بەڕاڤەکردن و ڕوونکردنەوە هەیە، چونکە یەکەمیان چۆن لەو (بیٚ قیمەتییەوە) گەیشتە ئەو (قیمەت و ڕوتبەی عالیە..)؟!، یاخود لە هۆنراوەکەی مەولانادا چۆن (دار) لە مریەمێکی کچ و شیردەر دەچێت؟!

---

[٢٧٩] تقی وحیدیان کامیار، متناقض نما در ادبیات، نشریه دانشکده ادبیات و علوم انسانی، دانشگاه مشهد شماره ٤، ل٢٩٢

[٢٨٠] دیوانی مەولەوی، ل٢٩٣

[٢٨١] محمد رضا شفیعی کدکنی، غزلیات شمس تبریز، ج١، ل٥٤٥

**وێنەی نوێی ناو خەیاڵ:**

ئەو وێنانەی، کە لە چوارچێوەی دوالیزمی دژیەکدا دێنە بەرهەم، نوێ و نۆبەرە و جوانن. ئاشکراشە، کە ناوەڕۆکی نۆبەرە و نوێ چەندە مایەی چێژ بەخشینە، کە زەینی خوێنەر و خەیاڵی تێردەکات و زۆر زیاتر مایەی پەسەندییە لە ناوەڕۆك و بابەتە کۆن و دووبارەکان، کە زۆرجار دەبنە مایەی تۆراندنی چێژ بەخشین[٢٨٢]. لەو شێوازە نوێیانەی، کە تەڕ و پاراوی و گیان دەبەخشێتە دەستەواژەکان، سودوەرگرتنە لەم ناسازییەی، کە هونەرێکی ڕوونبێژییە لە بەکارهێنانی وشەکاندا بەجۆرێك، کە دەرکەوتن، دەرخستەیەکی تایبەتمان بەرچاو دەکەوێت.

بۆنموونە: مەولانای ڕۆمی لەم هۆنراوەیەدا (ئاو) و (ئاگر)، (بەڵگەو) و (گومان)، کە دوالیزمی دژیەکن، بەجۆرێك بەکاردەهێنێ و واتایان پێدەبەخشێ، کە لەگەڵ لۆژیك و باودا ناکۆك و نەگونجاوە.

هر، که در آبی گریزد، ز امر او آتش شود
هر که در آتش رود از بهرِ او ریحان کند
من بر این، برهان بگویم زان که آن برهانِ من
گر همه شبهەست، او آن شبهه را برهان کند[٢٨٣]

---

[٢٨٢] سید محمد راستگو، خلاف آمد، کیهان فرهنگی، تهران، سال ششم، شماره ٩، ١٣٦٥ هـ.ش. ل٢٩.

[٢٨٣] محمد رضا شفیعی کدکنی، غزلیات شمس تبریز، ج١، ل٤٤٥.

واتە: هەر کەخۆی فڕێداتە ئاوێك تا ڕزگاری بێت، ئەوا ئاوەکە بەفەرمانی ئەو دەبێتە ئاگر، بەڵام هەرکەس لەبەر ئەو خۆی بخاتە ئاگر، ئەوا بۆی دەکاتە باخی ڕەیحانە. من بۆیە بەڵگە دەهێنمەوە، ئەگەرچی دەزانم بەڵگەکانم خۆیان گومانن، بەڵام ئەو هەموو گومانەکان دەکاتە بەڵگە.

هەروەها لەهۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێ:

چون ز عقل و جان و دل برخاستی

این یقین هم در گمان است ای پسر[٣٨٤]

عەقڵ و دڵ و گیان ناتکەیەننە ڕاستی، کە لەمانەش تێپەڕیت، ئەوکات ئەو یەقین و دڵنیاییەش جێگای گومانە، (گومانێك، کە سۆفی هەیەتی بەردەوام بەرامبەر بەڕاست زانینی خۆی)

چۆن دڵنیایش مایەی گومانە؟!

مەولەوی تاوەگۆزیش دەڵێ:

یا مەردەبۆت دڵ دێوانەی دڵگیر

جە تیر ئەندازی کەردەبۆت تەقسیر[٣٨٥]

واتە: دڵت شکاندبێ و عاجزت کردبێ بەوەی کەمتەرخەمیت کردبێ لەکاتی پێوەنان و وەشاندنی تیردا؟!

یاخود لەهۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێ:

غەریب بیم چەنیم کەرەم نمانا

وە سەوقات پەرێم خەدەنگێ شانا[٣٨٦]

---

[٣٨٤] سەرچاوەی پێشوو، ل٦٠٨.

[٣٨٥] دیوانی مەولەوی، ل٣٥.

سەوقات: دیاری

چۆن تیر، کە مایەی کوشتنە وەکو دیاری باسدەکرێت؟!

تێبینی: لەم خاڵەدا ئێمە باسی نوێبوونی وێنە و بابەتی شیعرمان کرد. مەولەوی تاوەگۆزی لەدیوانەکەیدا زیاد لەجارێك لە هۆنراوەکانیدا دەستەواژەی (فیکری بیکر) بەکاردەبات، واتە بابەت و دەربڕینی نۆبەرە و دەست نەخواردوو، کە تائەمڕۆش ئەم ناولێنانە لای ڕەخنەگران و کاری ڕەخنەگرتندا گرنگی و بایەخی خۆی هەیە.

لەهۆنراوەیەکدا دەڵێ:

پۆی خەیاتەی فەرد بۆ عەنبەرینت
دەس ڕێسەکەی فیکر بیکری شیرینت[٣٨٧]

وێنەی نوێ و نۆبەرەی ناو خەیاڵ، کە مەولەوی تاوەگۆزی و ڕەخنەی نوێش بە (فیکری بیکر) و وەك بەهایەکی ئیستاتیکیی و گرنگ باسی لێوە دەکات، کەرەسە و زەمینەیەکی لەبار و پڕ لە جوانی و داهێنانە، کە شاعیر بە هونەری جوان دەربڕینی دوالیزمی دژیەکەوە، چێژ و بەرجەستەییەکی زیاتر دەداتە بەرامبەر و خەیاڵی تێرتر دەکات.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کە ئەندێشە و خەیاڵ وەك ڕەگەزێکی شیعری خوێندنەوەی ئیستاتیکیی خۆی هەیە، ئەمە جگە لەوەی زەمینەی هێنانەبەرهەمی جوانترین جۆری دوالیزمی دژیەکە، کە (پارادۆکس)ە، کە بە پێویستی دەزانم لەم بەشەدا، یاخود لە پارێکی سەربەخۆدا بە وردی و هێندەی

---

[٣٨٦] دیوانی مەولەوی، ل٢١٤.

[٣٨٧] سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٣.

لێکۆڵینەوەکەمان ڕێگە بدات باسی (پارادۆکس) و جۆرەکانی بکەم لە دیدێکی ئیستاتیکییەوە، بەڵام سەرەتا پێویستە باسی خەیاڵ و ئەندێشە بکەین لە دیدە ئیستاتیکییەکەوە، چونکە جگەلەوەی بابەتی دواخاڵی ڕەهەندەکانی جوانی دوالیزمی دژیەکە، لەهەمانکاتدا زەمینەی هونەری ئیستاتیکیی (پارادۆکس)ە.

**٣-٢-ب/ خەیاڵ و ئەندێشە وەك کەرەسەیەکی ئیستاتیکیی لە دەربڕینی بابەتی دوالیزمی دژیەکدا:**

پێناسەی جۆراوجۆر و جیاوازی زۆر بۆ (شیعر) کراوە، بەڵام ئەوەی، کە پەیوەستە بەم بابەتەی ئێمەوە ئەوەیە، کە دەیەوێت بڵێت، شیعر لاساییکردنەوەی بێ زیادوکەمی سروشت نییە، بەڵکو ئەوە هێزی خەیاڵ و ئەندێشەی شاعیرە، کە سرووشت دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و بۆ مەبەستی ئیستاتیکی و هونەری دەیخاتەگەڕ، وەك (سر فیلیپ سیدنی) دەڵێت: "سروشت بەهیچ شێوەیەك، جیهان بەم جوانی و ڕەنگاوڕەنگیە نیشان نادات، کە شاعیرەکان داهێنانیان تیا کردووە و نمایشیان کردووە. لە سروشتدا دەریاچەکان هێندە دڵڕفێن نین و درەختەکان بەو جوانیە پڕ نین و گوڵەکانیش بەو هێندەی لای شاعیرەکان پڕ بۆنی خۆش نین، هەموو ئەمانە لە بەرهەمی شاعیرەکاندا جوانتر دەردەکەون"[٣٨٨].

---

[٣٨٨] غلامحسین یوسفی، تصویر شاعیرانه أشیاء در نظر صائب، مجله° ادبیات دانشگاه فردوسی، شماره ٤، ل٥٧٧.

سولی پرودوم شاعیری فەرەنسی، لەبارەی پێناسەی شیعرەوە دەڵێت: "شیعر جۆرە خەیاڵکردنێکە، کە لەنێویدا ئارەزووی ژیانێکی باڵاتر خۆی دەنوێنێ.."[٣٨٩].

"لەبارەی بابەت و چۆنیەتی پۆلێن بەندکردنی خەیاڵەوە، (کۆلرێدج) لەژێر کاریگەری (کانت)دا، خەیاڵ بۆ دوو جۆر: خەیاڵی یەکەمی و خەیاڵی دووەمی دابەشدەکات.

خەیاڵی یەکەمی – وزەی ژیان و یەکەمین هۆکارە لە توانایی پەیبردنی مرۆڤدا و لەسەر بنەمای ئەرکەکەی زانستییە و تەواو یەکسانە بەوجۆرەی، کە (کانت) بە خەیاڵی بەرهەمهێن ناوزەدی دەکات. جۆری دووەمی خەیاڵ، دەرهاویشتەی جۆری یەکەمە و هەمیشە پەیوەستە بە ویستەوە و ئەگەرچی لەگەڵ جۆری یەکەمی خەیاڵدا لە جۆری کاردا وەك یەکن، بەڵام لە چۆنیەتی و ڕێژەی کاریگەریدا جیاوازیان هەیە، چونکە بابەتەکان شیکاریان بۆدەکات و پێکەوە دەیانبەستێتەوە و (یەکبوون و باڵایی بوون)یان تێدا بەدیدەهێنێت بەجۆرێك، کە دروستکراوێکی نوێیان لێ بەدەست دەهێنێت. زەمینەی ئەم جۆرە خەیاڵەش هونەرە، کە (کانت) بە ئیستاتیکا ناوزەدی دەکات"[٣٩٠].

لەڕاستیدا "س.ت.کۆلرێدج، یەکەمین کەسێکە، کە لە لێکۆڵینەوەکانی بواری ڕەخنەی ئەدەبیدا، (خەیاڵ)ی بەم جۆرە پێناسە کردووە و گوتوویەتی، کە هێزێکی پێکەوەنەری جادووئامێزە، کە لە خودی خۆیدا پێکهێنان و

---

[٣٨٩] خانلری، شعرو هنر، انتشارات سخن – تهران، ١٣٥٣ هـ.ش. ل٤١.

[٣٩٠] محمد غنیمی هلال، النقد الأدبي الحدیث، نقد الأدب الحدیث، دار النهضة – مصر، ١٩٧٣م. ل١٦٢.

هاوسەنگی‌و پێکەوە پەیوەستکردن بەدیدەکەین لەنێوان سیفەت و بابەتە دژبەیەکەکاندا"[٢٩١].

"خەیاڵ Imagination، لە ڕەخنەی ئەورووپییەکاندا زۆرترین پانتایی داگیرکردووە و کاریگەری هێندە بەرفراوان بووە، کە هەموو جۆر و ڕێگاکانی، کە بەرهەمهێنی وێنەی (زەینی)یە، دەگرێتە خۆی"[٢٩٢]. شایانی باسە، کە س.ت. کۆلریدج جیاوازیی کردووە لەنێوان "imagination" و "fancy"دا وەك لە پێناسەکەدا دەردەکەوێ، یەکەمیانی پێ داهێنەرانەیە[٢٩٣].

یەکێك لە ڕەخنەگرانی هاوچەرخی عەرەب، دابەشکردن و پۆلێنبەندییەکی بۆ خەیاڵ کردووە، کە بەڵگەیە لەسەر فرە ڕەهەندی خەیاڵ، بەمجۆرەیە:

١. خەیاڵ، لەڕووی بابەتی ڕێنموونی کاری خەیاڵەوە، دەبێتە دوو جۆر:

أ. خەیاڵی زانستی.

ب. خەیاڵی ئەدەبی و شیعری.

٢. خەیاڵ لەڕوانگەی بابەت و خودییەوە دەبێتە دوو جۆر:

أ. خەیاڵێکی وێنەیی، کە حەقیقەت و هەبووەکانی دەرەوە وێنە دەگرێ.

ب. خەیاڵی (ویژدانی)، کە ئاساری ڕاستییەکان وێنە دەگرێ.

٣. خەیاڵ لەڕووی دەرئەنجامەوە:

أ. خەیاڵێك، کە کۆمەك بە بەرهەمهێنانی چیرۆك دەکات.

---

[٢٩١] ریچاردز، مبادئ النقد الأدبي، ترجمة وتقديم: محمد مصطفى البدوي، مراجعة: لويس عوض، المؤسسة العامة للتأليف والترجمة والنشر – القاهرة، ١٩٦٣م. ل١٣٢.

[٢٩٢] سید حسین فاطمی، تصویرگری در غزلیات شمس، ل١٧.

[٢٩٣] بڕوانە: CHRIS BALDIK, Oxford Concise Dictionary of Literary Terms. London, 2004, p.122.

ب. خەیاڵی ڕوونکاری و ڕوونکردنەوە، کە کۆمەکی جوان وێناکردن و جوان دەربڕین و هۆشیارکردنەوەی ویژدان، دەکات.

٤. خەیاڵ لەڕوانگەی هەستەکانی مرۆڤەوە:

أ. بینین و بینایی.

ب. بیستن.

ج. ئەندامی و جەستەیی.

د. خەیاڵی (لمس)ی هەستی دەست لێدان[٣٩٤].

زۆرینەی ئەم جۆرانەی خەیاڵ بەتایبەتی وەك بابەتێکی دوالیزمی دژیەك لە هۆنراوەکانی مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزیدا هاتوون، کە لێرەدا جێگە و بابەتی ئێمە نییە بۆ هەر کام لەو جۆرانەی (خەیاڵ) نموونەی هۆنراوە بهێنینەوە، چونکە ئێمە لێرەدا مەبەستمانە باس لە (خەیاڵ) بکەین وەك زەمینەیەکی ئیستاتیکیی، کە بووەتە کەرەسەی چۆنیەتی دەربڕینی جۆرەکانی دوالیزمی دژیەك، بەتایبەتی (پارادۆکس).

خەیاڵ لە بنەما فیکری و تیۆرییەکەی عیرفانیش ڕەگەزێکی بنەڕەتی و هۆکارێکی دەربڕینی دوالیزمی دژیەکە، کە بنچینەی جیهانبینی عیرفانە.

"لەنێوان دیار و نادیاردا، ناوبڕێك هەیە، کە (ابن عربی) بە (برزخ) ناوزەدی دەکات. بۆ نموونە (ممکن) بەرزەخێکە لەنێوان (وجود) بوون (عدم) نەبووندا. هەروەها مرۆڤی کامڵ، نموونەیەکی دیکەیە، کە وەك بەرزەخێك وایە لەنێوان (الحق) و (الخَلق)دا: بە ناوەکانی خواوە دەردەکەوێت دەبێتە (هەق) و بە

---

[٣٩٤] عبدالحمید حسین، الأصول الفنیة للأدب، عالم الکتب الحدیث للنشر والتوزیع، ٢٠٠٨م. ل١٠٤ – ١٠٥.

سیفەتەکانی زەمینیشەوە دەردەکەوێت، دەبێتە (خَلق). بەرزەخ بەواتایەکی تر شوێنی ئاڵوگۆڕە، واتە شوێنی وێنا و خۆنواندنە.

حەقیقەتی گەردوونی لای (ابن عربی) سێ پلەی هەیە: (باڵا)، کە پلەی (مەعقولات)ە، (نزم و خوارەوە)، کە پلەی (هەستەکان)ە، هەروەها بەرزەخی، کە کۆکردنەوەی ئەم دوو پلەیە، واتە معقول و هەستپێکراوە لەیەك کاتدا، کە ئەوەش پلەی خەیاڵ و وێناکردنە.

زانین و زانیاریش، بەدوای ئەودا، سێ جۆرە: بوونی ڕەهای خوایی، نەبوونی ڕەها، بوونی خەیاڵی، کە ئەوەش بەرزەخە لەنێوان (وجود) و (عدم)دا و پێگەی (ممکنات)ە، کە بێ کۆتاییە"[٢٩٥].

هەر لەم ڕووەوە شاعیر و زانای عەرەب علی أحمد سعید (ئەدۆنیس) دەڵێ: "جیهانی یەکەم، جیهانی واتاکانە، کە ئەوەش جیهانی عەقڵە، جیهانی دووەم، جیهانی هەستەکانە، دووەمیان بە بینین و یەکەمیان بە (بصیرە) بینایی و دووربینی دەبینرێت. لەنێوان ئەم دوانەدا جیهانی سێهەم هەیە، کە جیهانی (جبروت)ە، کە لەهەمانکاتدا جیهانی خەیاڵە"[٢٩٦].

"لێرەوەیە، کە لای (ابن عربی) مەودای خەیاڵ بەرفراوانترین مەودایە، چونکە دوو جیهان پێکەوە کۆدەکاتەوە، هەروەها کامڵترین بوونەوەرە، لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام لە جوڵەدایە (بوون و نەبوون)، (زانراو و نەزانراو)، (ئەرێنی و نەرێنی)..."[٢٩٧].

---

[٢٩٥] ادونیس، الصوفیة والسوریالیة، ل٧٤.

[٢٩٦] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٦.

[٢٩٧] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٩.

خەیاڵ، تەنانەت وێنەی خودی خوداش، وێنادەکات، خەیاڵ ئەو کارە دەکات، کە عەقڵ بە مەحاڵی دەزانێت. لەم ڕوانگەوە خەیاڵ پێوەری مەعریفەیە. هەروەك (ابن عربی) جەخت دەکاتەوە، "هەرکەس خەیاڵ و پلەکانی نەناسێت، ئەوا هیچ بۆنێکی لە مەعریفە نەبردووە. مەعریفەی (کشف) کردن بە خەیاڵ، لەوجۆرەیە، کە تایبەتە بە (أهل الله)"[٢٩٨].

ابن عربی، پێیوایە، گەورەترین بوونەوەری خوای گەورە (خەیاڵ)ە، خەیاڵ پێگەی خۆنواندنی خواییە، دروستکردنی جیهانی خەیاڵ لە نهێنییەکانی خواییە. خەیاڵ، خوای گەورە بۆیە دروستی کردووە، تا لەوێدا کۆکردنەوەی، یاخود پێکەوەبوونی دژەکان و دوالیزمە دژەکان، دەرکەوێت.

کەواتە عیرفان و عیرفانی تیۆری، باشترین فاکتەر و پاڵنەر و زەمینەیە بۆ بەرهەمهێنانی وێنە و وێنای خەیاڵی بابەتە دژیەکەکان بەجۆرێك، کە دواجار وەك دەق و بەرهەمێکی ئیستاتیکیی، بێتە بەرهەم.

مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزی، هۆنراوەکانیان پڕە لە وێنە و وێنای بەرز و جوان بەتایبەتی لە دەرخستنی بابەتەکانی، کە دوالیزمی دژیەکن، ئەمەش بۆ دوو شاعیری هەست بەرز و عارفی وەك مەولانا و مەولەوی، جێگای سەرسوڕمان نییە، چونکە خۆیان زادەی نێو مەعریفەی عیرفانین و پێشەوای عارفانی زێدی خۆشیانن.

عیشقی عارفانەی مەولانا و مەولەوی، نەك تەنها ڕێگر نییە لە بەرفراوانی خەیاڵیان دا، بەڵکو هێندە گەورەیە، کە هەموو جیهان دەگرێتەوە.

---

[٢٩٨] سەرچاوەی پێشوو، ل٨٠.

وێناكانی نێو خەیاڵ لە هۆنراوەكانی مەولانا و مەولەوی (بێگومان هەریەكەیان وێڕای لێكچوون تایبەتمەندی خۆشیان هەیە) دا، ڕەنگ و بۆن و شێوازێكی تایبەتی خۆیان هەیە، هەردووكیان ڕەگەزە بنەڕەتی و بێ كۆتایی و هەمیشەییەكانی بەرفراوانی بوون، دەكەنە كەرەسەی وێنە شیعرییە دژیەك و عیرفانییەكانیان. هەردووكیان جوانی لە گەورەیی و شكۆ و بێ كۆتایی و بێ سنووربووندا دەبیننەوە.

لێرەدا جێگای خۆیەتی بۆچوونی توێژەرێكی ناسراوی ئێرانی (شفیعی كدكنی) بهێنینەوە، كە دەڵێ: "لە چوارچێوەی بابەتی (وێنەكانی خەیاڵ)دا، (دیوانی شمس)ی مەولانای ڕۆمی نموونەیەكی ناوازەیە. بەرفراوانی مەودای خەیاڵ و ئاسۆی دووربینی مەولانا، بەجۆرێكە، كە (أزل) و (أبد) پێكەوە دەبەستێتەوە و وێنەی وا دادەهێنێ بە پانتایی و بەرفراوانی (بوون)ە. لە خەیاڵدانی مەولانای ڕۆمی دا، هەمیشە ڕەگەزە پڕ لە شكۆ و گەورەكانی (بوون)، وەك مەرگ و ژیان و نەمری و عیشق و دەریا و شاخ و كێوەكان، ڕەگەزە پێكهێنەرەكانی وێنەن"[٣٩٩].

مەولانا زۆر لە مانا تەجریدییەكان، كە زەمینەی بنەڕەتی ئەندێشە و سۆزەكانی ئەوە، بە وێنە و دەربڕینە سەرسووڕهێنەرە تایبەتییەكانی خۆی كردوویەتییە بابەتێكی هەستپێكراوی ماددی و بەرجەستە. لە شیعری مەولانادا (بێدەنگی)، (نوقڵە)، كە دەڕژێت وەك دەڵێت: "خلوتیان گریختە، نُقل سكوت ریختە. واتە چۆڵی و تەنیایی ڕایكردووە، نوقڵی بێدەنگی ڕژاوە. هەروەها لە شیعری مەولانادا (ناڵەی درەخت) لە خەزاندا، دەتوانرێت بخورێتەوە و (نۆش) بكرێت، تەنانەت

---

[٣٩٩] محمد رضا شفیعی كدكنی، در عشق زندە بودن، ل٥٤.

حاڵەتە دەروونییەکانیشی لەچوارچێوەی وێنەی بەرجەستەکراودا، بردووەتە ئاستی بابەتی بینراو، بۆ نموونە دەڵێت:

حسنما! ببین خزان را، بنگر برهنگان را

ز "شراب همچو اطلس" به برهنگان قباده

واتە:ئەی پەرستراوم! بڕوانە خەزان، سەرنج بدەرە پێ پەتییەکان

لە "شەرابی، کە وەك ئەتڵەس وایە" بدەرە پێ پەتییەکان

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی وێنە و ئیمەیجەکانی مەولانای ڕۆمی، سوریالی بوونیانە. لە هۆنراوەیەکدا دەڵێت:

"ز هی سلام، که دارد ز نور دُمب دراز..."

واتە: ئەو سڵاوەی، کە ئەو هەیەتی لە (نور) ڕووناکی کلکێکی درێژەوەیە...

یاخود دەڵێت:

"درختان بین ز خونِ ترِ، به شکل شاخ مرجانی"

واتە: درەختەکان ببینە لە خوێنی تەڕ، بەشێوەی شاخێك لە مەرجان.

یاخود دەڵێت:

"صبحدمی، همچو صبح، پرده ظلمت درید"

واتە: بەرەبەیانێك، وەك بەیانی، پەردەی تاریکی دڕی.

بەگشتی وێنە خەیاڵییە پڕ لە جوانییەکانی مەولانا تەنها بوونێکی ئاسۆییان نییە، بەڵکو بە ئاستی ستوونیش قووڵ بوونەوەی پڕ لە جوانیان تێدایە"[٤٠٠].

سەبارەت بە وێنە و وێنە خەیاڵییەکانی مەولەوی تاوەگۆزی، ئەنوەر قادر دەنووسێت: "یەکێك لە شێوازە هونەرییەکانی ئەو شیعرانەی مەولەوی

---

[٤٠٠] محمد رضا شفیعی کدکنی، در عشق زنده بودن، بەگشتی بڕوانە ل٥٥ – ٦٠.

دەربارەی سروشت وتوونی (دوالیزمێکی تایبەتی و دەگمەنە)، تایبەتمەندی لیریکای سۆفییانەیە، واتە (وێنەیەکی پۆزێتیڤ هەمیشە لەگەڵ یەکێکی نێگێتیڤی دژ بەخۆیدا دەبێ).

هەروەها ناوبرا و بۆچوونی ئەکادیمیك و ڕۆژهەڵاتناسی دیاری سۆڤیەتی کۆچکردوو (ئی.بێ.بیرتلس) دەهێنێتەوە، کە زۆر کارامانە و بابەتییانە وتوویەتی: "ئەم ناکۆکییە دوولایەنییە، چەمکی سەرجەم سۆفیزمە، لە دژایەتی دنیای گیانییەوە دەستپێدەکات و بە ئەندێشەی دەروونی باسکراو کۆتایی دێت). ئەم تایبەتمەندییە لە لیریکای مەولەویدا زۆر بەرچاو و دیارە و لەسەر بناغەی هەندێ چەمکی دژبەیەك دامەزراوە. بۆنموونە: ژێر — ژوور، نشێو، دۆڵ — شاخ، دۆست — ڕەقیب، هەروەها ڕەگێکی قووڵ داکوتراویشی لە زەمینەی هەندێ بیری ئەفسانەییدا هەیە. بۆ نموونە لە شیعری (وەهارەن، سەیرەن، سەوزەی دیاران...) دا، کە ئاشکرایە مەولەوی لەسەر سەرچاوەی زەڵم نووسیویەتی، لێرەدا شاعیر دوو شتی دژبەیەکدی دەبینێ. شاخەی شەتاوی شاخەکان، کە لەوپەڕی دەماخ و جۆش و هەڕەتدان، بەپێچەوانەی ئاوی زەڵمەوە، کە شاعیر بە ناشاد دێتە پێش چاوی و لەگەڵ خۆیدا بەراوردی دەکات و بە خۆیی دەچوێنێ"[٤٠١].

پاشان لە هەمان بابەت و لاپەڕەدا دەنووسێت "بێجگە لە هێز و لاوازی هەر لەم شیعرەدا دوانەیەکی دژبەیەك تر (شادی — خەم)ی کۆکردۆتەوە. شاعیر، کە لە گومان و دڵەڕاوکە و بێئارامییەکی بێ ساماندایە، بەرامبەر بە خۆی دڵدارانێك دەبینێت، وا شاد و مەستی دەس لە ملانی یارن، هەروەها بەپێی

---

[٤٠١] ئەنوەر قادر محەمەد، لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، ل١١١ — ١١٢.

ستروکتوورەی بنیاتنانی وێنەی سۆفییانە، کە پێویستی بە (توحید) هەیە، (واتە: پێویستی بە تەوەرەیەك هەیە، کە ڕەگەزێکی بەراوردی ناوەندییە و دەبێتە بناغەی دروستکردنی وێنەکە و هەموو مەرجەکانی شیعری سۆفییانەی تێدا بەدیدێت).

مەولەویش ئەم ڕەگەز – تەوەرەیە دەدۆزێتەوە، کە هەموو شتە دژبەیەکەکانی تێدا دەتوێنێتەوە. ئەینا، خەمی شاعیر و شادی دڵداران لە چیدا یەکدەگرنەوە؟!

لە غەزەلی (فەسڵی نەوپارێز تازە کەردەن مەیل...) و (نەوای کەژاوەی لەیلێ نازانەن)دا مەولەوی تابلۆی کۆچ و باری کۆچەرانی کوردمان بە خامەیەکی ڕەنگین و وێنەی بزۆز و دانسقە بۆ دەنەخشێنێ. لەم غەزەلانەشیدا دیسانەوە شتە دژ بەیەکەکان دەبینین: شاخ – نشێو، بەرزی – نزمی، ژوان – دووری، خەم – شادی...هتد"[٤٠٢].

مەولانا و مەولەوی، لە وێنەکانیاندا تەنها لە بابەتی دیاردە گەردوونی و عیرفانیە گەورەکان نەدواون، بەڵکو زۆرینەی وێنەکانیان، یاخود کەرەسەکانی وێنەکانیان لە خەیاڵدانی خەڵکیدا بوونی هەیە و بابەتەکان بە خەڵکی نامۆ نییە، بەڵام ئەم دوو شاعیرە سۆفی و بە شکۆیە، ڕووداو و بابەتە ساکارەکانی ناو خەڵکیان بەرز و پەیوەست کردووەتەوە بە بابەتە عیرفانییە باڵاکان تا بتوانن پلەی پەروەردەیی و ڕەفتاری و بیرکردنەوەی خەڵکی بەرزبکەنەوە. بۆنموونە، بابەتێکی وەك (جەژنی قوربان و قوربانیکردن)، کە خودی بابەتەکە و دیمەنەکانی لای خەڵکی بەگشتی ئاشنان و نامۆ نین، بەڵام بڕوانە مەولانای

---

[٤٠٢] ئەنوەر قادر محەمەد، لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، ل١١١ – ١١٢.

ڕۆمی چۆن خۆی (وەك عاشقێك) دەچوێنێ بەو ئاژەڵەی، كە قەڵەو كراوە بۆ قوربانیكردن و قەسابەكەش بە (قصاب عاشقان) ناوزەد دەكات، چونكە دەیكاتە قوربانی بۆ جەژنی عاشقان و دەڵێت:

خویش فربه می نماییم از پی قربان عید

كان قصاب عاشقان بس خوب و زیبا می كشد

همچو اسماعیل گردن پیش خنجر خوش بنه

درمد زد ازوی گلو گر می كشد تامی كشد[٤٠٣]

واتە: بە خۆشیەوە خۆمان ئامادە و قەڵەو دەكەین بۆ قوربانی كردن، بەڕاستی ئەو قەسابی عاشقانە جوان و چاك دەمانكوژێت. هەروەك ئیسماعیلی كوڕی ئیبراهیم بە جوانی ملت بەرە بەردەم چەقۆ تا بە جوانی قوڕگت ببڕێ و بتكوژێ...

مەولەوی تاوەگۆزیش بۆ هەمان بابەت، هۆنراوەیەكی هەیە، كە پاش ئەوەی باسی جەژنی قوربان دەكات و دەخوازێ ئەمیش خۆی بكات بە قوربانی و قبوڵی بكەن بۆ سەربڕین، بەڵام دواتر بەخۆی دەڵێ، كە تۆ بۆ قوربانی ناشێیت، چونكە پیر و كوێریت و ئاژەڵی نوقسانیش بۆ قوربانی نابێت، دەڵێت:

قوربان! قوربانەن، جەژنەن، شادیەن

دەس نەگەردەنەن، ڕۆی ئازادیەن

پاشان دەڵێت:

مەرد پەی "ئۆسا دەی" بێ دریغەكەت

بسم الله تەكبیر دەس بە تیغەكەت

---

پاشان دەڵێت:

سا تویچ من بەرە، وە قوربانی کە
من وە قوربانی ڕای ڕەببانی کە

دواجار دەڵێت:

مەعدوومی بەدبەخت ناتەمامەنی
ڕاسەن بێ دەوڵەت خەیاڵ خامەنی
قوربانی مشیۆ جە عەیب بەری بۆ
فیدایی پەسەند ڕای دڵبەری بۆ
تۆ پا شکستەی بەرد هەرد دەرد
چەم کۆر مەینەت، تەن زایف، ڕەنگ زەرد
خەیاڵێت کەردەن جە ڕووی نادانی
چ لایق وە تۆن ڕوتبەی قوربانی[٤٠٤]

خەیاڵ و سەرچاوەی خەیاڵ، بەم بنەما عیرفانی و ئیستاتیکییەوە و هەروەها وەك ڕەگەزێکی گرنگی شیعری، کە باسمان کرد بەگشتی. جگە لەوەی مناڵدانی چەندین وێنەی خەیاڵی پڕ لە جوانییە بەگشتی و زەمینەی وێنە خەیاڵییە دژیەکەکانە بەتایبەتی، لە هەموو جۆرەکانی دژیەك و دوالیزمی دژیەکدا بەدیدەکرێت و لە دەقە شیعرییەکاندا وەك بونیادێکی کارای دەربڕینی دوالیزمی دژیەك بەرچاوە و دەبینرێت[٤٠٥].

---

[٤٠٤] دیوانی مەولەوی، ل٤٥٩.

[٤٠٥] یادگار لطیف الشهرزوري، المفاتیح الشعریة (قراءة اسلوبیة في شعر بشار بن برد)، دار الزمان للطباعة والنشر والتوزیع، سوریا، الطبعة الأولی، ٢٠١٢م. بڕوانە ل١٣١.

دیارترین جۆری دوالیزمی دژیەك، كە بەشێوەیەكی بنەڕەتی پەیوەستە بە وێنەی دژیەك و وێنەی خەیاڵی دژیەك، (پارادۆكس)ە، كە ئەگەرچی لە جۆرەكانی دوالیزمی دژیەكدا و لە پاری یەكەمی -بەشی یەكەمی ئەم لێكۆڵینەوەیەدا، وەك جۆرێك ئاماژەمان پێكرد و پێناسە و بەراوردمان كرد لەگەڵ جۆرەكانی دیكەدا، بەڵام لێرەدا زۆر بە پێویستی دەزانین لە پارێكی سەربەخۆدا و بەشێوەیەكی هێندەی لێكۆڵینەوەكەمان دەرفەتمان بداتێ، كەمێك درێژتر باس لە پارادۆكس و جۆرەكانی بكەین، چونكە:

١. پارادۆكس، زادەی بەرهەمی خەیاڵ و وێنەی خەیاڵە، كە تەوەرەی ئەم بابەتەمان بوو.
٢. پارادۆكس، جوانترین جۆری دوالیزمی دژیەكە، وەك دەربڕینێكی ئیستاتیكیی.

## ٣-٣/ پارادۆكس، جوانترین جۆری دەربڕینی دوالیزمی دژیەك و بەرهەمی وێنا و خەیاڵی ئیستاتیكییانە:

دكتۆر (شفیعی كدكنی) لە باسی ئەو جۆرەی دوالیزمی دژیەكدا، كە هێنان و بەرامبەر یەك دانانی دوو وێنەی دژیەكە لەسەر زەمینە و وەك بەرهەمی خەیاڵ، بە (وێنەی پارادۆكس) ناوزەدی دەكات و بەمجۆرە پێناسەی دەكات: "وێناكردنێكە، كە دوو ڕووی پێكهاتەی ئەو وێنە زەینییە، لەڕووی تێگەیشتن و واتاوە، وەك دژیەكێك بەرامبەر دەوەستنەوە و پێچەوانەی یەكدی دێنەوە"[٤٠٦].

وێنە پارادۆكسییەكان دوو مەرجی هەیە:

---

[٤٠٦] محمد رضا شفیعی كدكنی، شاعر آینەها، ل٥٤.

١. کۆکردنەوەی دوو ئاراستەی جیاواز لەیەك شتدا.

٢. بەرامبەر یەکبوون، یاخود جیاوازبوونی ئەم دوو ئاراستەیە[٤٠٧].

بەگشتی پارادۆکس لەڕووی جۆری دوو ئاراستە جیاوازەکەیەوە، چوار جۆرە:

١. پارادۆکسی زمانی.

٢. پارادۆکسی لۆژیکی.

٣. پارادۆکسی خەیاڵی.

٤. پارادۆکسی دەروونی.

پارادۆکسی زمانی، ئەو جۆرەیە لە پارادۆکس، کە دانەیەکی، یاخود ڕەگەزێکی زمانی، پێچەوانەی ڕەگەزێکی دیکەی زمانی دەوەستێتەوە. بۆنموونە مەولەوی تاوەگۆزی دەڵێت:

ئاخ پەی خەڵوەتێ بدیام وە بێ خەم
سیوای تۆ دیدەم کەس نەدیام وەچەم[٤٠٨]

(بدیام و نەدیام)          دوو وێنەی پارادۆکسی (زمانی)ین.

"پارادۆکسی لۆژیکی، لەوجۆرەیانە، کە بەشێکی بابەتێك لەلایەن بەشێکی تری هەمان بابەتەوە، ڕەتبکرێتەوە. بۆنموونە کەسێك بڵێت: (ڕۆژێکیان شەو بوو..).

پارادۆکسی خەیاڵیش، ئەو پارادۆکسەیە، کە (وێنەی خەیاڵ) بەرهەمدێنێ و بە تەعبیری (شفیعی کدکنی) (وێنەی پارادۆکسی) بەدیدەهێنێت.

---

[٤٠٧] علیرضا فولادی، زبان عرفان، ل٢٣٣.

[٤٠٨] دیوانی مەولەوی، ل٨٧.

دواجار پارادۆكسی دەروونی، ئەوجۆرەیە، كە تێیدا دوو ڕەگەزی دەروونی و بەگشتی سۆزداری دژیەك پێكەوە كۆببنەوە، وەك (خواستن و نەخواستن).

(شبلی) عارفی گەورە دەڵێت: (ئەوەم دەوێت، كە نامەوێت...)"[409].

هەروەها پسپۆڕێكی بواری ئەدەب و بیر هەر لەم ڕووەوە دەربارەی پارادۆكس دەڵێ: "بێگومان ئەم بابەتە لە هەوڵەكانی چێژ ویستی بۆ ئەم جۆرە مەبەستە، زیاتر بەرچاو دەكەوێت و بوونی ڕێژەیەكی زۆر لە پارادۆكس و جۆرەكانی لە زمانی عیرفاندا دەربڕی ئەو ڕاستییە. ئەم ڕاستییە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەولانەی، كە دەدرێن بۆ دەربڕینی ڕوونی ئەزموونی عارفانە، واتە ئەم جۆرە ئەزموونە لە ڕووبەڕووبوونەوەیدا لەگەڵ دەربڕینی ڕوون و ڕاشكاوانە، خۆبەخۆ لە شێوازی (پارادوكسیكال)دا دەردەكەوێ، چونكە بابەتەكەی ئەو كۆكەرەوە و یەككگرتنی دژەكانە"[410].

هەروەها بەردەوام دەبێ و دەڵێ: "لە هەر هەوڵێكدا بۆنەوەی تەعبیر لە ئەزموونی پاشخانی بكرێت، خێرا لەو جێگە و هەوڵەدا جێ پێ و جێ پەنجەی پارادوكس ئامادەیە"[411].

لە ڕابردوودا ئاماژەیەكمان بە جۆرەكانی (پارادۆكس) كرد، بەڵام لێرەدا پێویستە بڵێین، (پارادۆكس) لەڕووی چییەتی، دوانە دژیەكەوە، كە پێكهێنەری دوانەی دژیەكی (پارادۆكس)ن دەبێتە دوو جۆر:

١. پارادۆكسی گفتاری (ئاخاوتنی).

---

[409] علیرضا فولادی، زبان عرفان، ل٢٣٥.

[410] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٥.

[411] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٩.

٢. پارادۆکسی کرداری[٤١٢].

"بەگشتی پارادۆکسی ئاخاوتنی، پارادۆکسێکە، کە هەردوو ڕووی، یاخود بەشی پێکهێنەری دوالیزمە دژیەکەکە، لەناو خودی وتنەکەدا هەیە، بۆنموونە (بایزید) دەڵێت: "ئای، کە هەندێ کەس لە ئێمە نزیکە و لێشمان دوورە، ئای، کە هەندێ کەسی دیکەش لێمان دوورە، بەلام لێمان نزیکە".

هەروەها پارادۆکسی کرداری، پارادۆکسێکە، کە تەنها یەك ڕووی، یاخود یەك بەشی دوالیزمە دژیەکەکە، لەناو گوفتارەکەدا دێت و ئامارەی پێ دەکرێت. بۆنموونە عارفی گەورە (ابوالحسن خرقانی) دەڵێت: هیچ کەس منی نەدیوە جگە لە (ابو یزید).

ئاشکرایە، کە (خەرقانی) دووسەد ساڵ پێش (ابو یزید) ژیاوە، بۆیە ناچارین ئەم گوتەیە لەگەڵ زانیاری دەرەکیدا (واتە دەرەوەی دەق) بەراورد بکەین و پەی بە (پارادۆکس) بوونی بەرین"[٤١٣].

لێرەدا و پەیوەست بە لێکۆڵینەوەکەی ئێمە، باسی سێ جۆر (پارادۆکس) دەکەین، کە هەریەکەیان نموونە و بەڵگەی ئیستاتیکای دەربڕینی عیرفانییە، کە بێگومان بە کەرەسەکردنی بابەتی دوالیزمی دژیەکە، کە بابەت و بنەڕەتی عیرفانە و وێناکردنی دەربڕینی دوالیزمانەی عیرفانیانەیە.

---

[٤١٢] سەرچاوەی پێشوو.

[٤١٣] علیرضا فولادی، زبان عرفان، ل٢٤١.

### ٣-٣-أ/ هەستئامێزی:

"یەکێکە لە جۆرەکانی پارادۆکسی ئاخاوتنی، کە لەم جۆرەدا پەیوەستکردنەوەی پێنج هەستەکانی مرۆڤ، بەشێوەیەکی پارادۆکسیانە پێکەوە دەسازێنرێن. بێگومان دوو جەمسەرە پێکهێنەرەکەی (هەستئامێزی)، یا هەردووکیان هەستین، یاخود یەکێکیان عەقلّی و ئەوی دیکەیان هەستییە. بۆنموونە لە پێکهاتەی (بێدەنگی سەوز)دا، (بێدەنگی) و (سەوز)یش هەردووکیان هەستین، بەڵام لە پێکهاتەی (بەختی ڕەش)دا، (بەخت) (عەقلّی)یە و (ڕەش) هەستیە"[٤١٤].

مەولەوی تاوەگۆزی لە هۆنراوەیەکیدا (بەختی شەڕ) بەکاردەهێنێت و دەڵێت:

ئەوساتە زانام بەختەکەم شەڕ بی
عێلەکەم هامڕای عێل سەگ وەڕ بی[٤١٥]

یاخود مەولانای ڕۆمی لە هۆنراوەیەکیدا (پنبە ای از لا ابالی) بەکاردەهێنێت و دەڵێت:

پنبە ای از لا ابالی درد و گوش دل نهم
پند نپـذیرم ز صبر و بندها را بشکنم[٤١٦]

واتە: لۆکەی بێ باکی دەکەمە هەردوو گوێی دڵم...

---

[٤١٤] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٥.

[٤١٥] دیوانی مەولەوی، ل٦٩.

[٤١٦] کلیات شمس تبریزی، ج٢، ل٨٣٢.

لێرەدا جگە لە (لۆکەی بێ باکی)، کە پێکهاتەیەکی (هەستی + عەقڵی)یە، پارادۆکسێکی دیکەمان هەیە، کە (عەقڵی + عەقڵی)، کە (دوو گوێی دڵە).

وەك زانیمان (هەستئامێزی) بە کۆبوونەوەی دوو دژ دەبێت، کە پەیوەستە بە پێنج هەستەکەمانەوە، واتە یا هەردوو دژیەکەکە هەستین، یاخود یەکێکیان هەستیو ئەوی دیکەیان عەقڵی یە.

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم چەمکە بۆچوونێك دەخەینە پێشچاو، دەڵێ: "کاتێك کەسی عارف دەگاتە پلەی تەجریدی ڕۆحی، خۆی قوتار دەکات لە زۆری هەستە دەرەکی و ڕووکەشەکان و کار و پەی پێ بردنی هەموو ئەوانە دەکاتە یەك کەناڵ و ڕێچکەوە، چونکە لە بنەڕەتدا چییەتی (نفس) هیچ نییە جگە لە یەکبوون و فرەیی هێزەکان و کارەکانیان دەرئەنجامی ژمارەی ئەندامانی جەستەیە"[٤١٧].

وەك مەولانای ڕۆمی لە هۆنراوەیەکیدا دەڵێت:

پس بدانی چون، که رستی از بدن
گوش و بینی چشم می داند شدن
راست گفته است آن شه شیرین زفاف
چشم گردد مو به موی عارفان[٤١٨]

واتە: باش بزانە، هەرکات بێزار بوویت لە جەستە
گوێ و بینینی چاوەکانت پەی بە هەموو شت دەبەن
ڕاستی وتووە ئەو شاشیرین و پڕ لە شادیەمان

---

[٤١٧] علیرضا فولادی، زبان عرفان، ل٢٤٦.

[٤١٨] کلیات شمس تبریزی، ل٢٥٦.

یەك بە یەكی مووەكانی كەسی عارف، دەبنە چاو

بەواتایەكی تر، (هەستئامێزی) بەرهەمی حاڵەتێكە، كە بە (جمع) ناوزەدی دەكەن. واتە كاتێك كەسی عارف خۆی قووتار دەكات لە (جیاوازی) هەستەكان، هەر هەستێكی كار و ئەركی هەستێكی دیكە دەگرێتە ئەستۆی خۆی. وەك (شمس الدین محمد بردسیری كرمانی) لەم بارەوە دەڵێت:

از تفرقه چون شدی سوی جمع
سمع تو بصر شود بصر سمع[٤١٩]

ئیبن عەرەبی، ئەمە بە حاڵەتێكی تێپەڕ دادەنێت و كامڵترین جۆری بەوە دەزانێت، كە عارف بە هەموو هەستەكانی ببینێ، بە هەموو هەستەكانی بۆن بكات...

بەگشتی ئەم جۆرە دوالیزمە، كە بەشێكە لە دەربڕینی عیرفانی و زمانی عیرفان، جۆرێكە لە داهێنان و جوانكاری لە دەربڕیندا، كە هەڵگری قووڵییەكی عیرفانییە، لە بەرهەمی ئەدەبی عیرفانیدا چەندین هونەری دیكەی دەربڕین دەخاتە چوارچێوەی خۆیەوە، وەك لێكچواندن و خوازە و...هتد.

### ٣-٣-ب/ پێچەوانەی باو:

"جۆرێكە لە پارادۆكسی كرداری، واتە پارادۆكسێك، كە یەك دیوی، یاخود بەشێكی دوالیزمی دژیەكەكەی لە خودی گوتەكەدا ئاماژەی پێ كراوە و دیوی دووەمی لە دەرەوەی گوتەكەیە:

---

[٤١٩] علیرضا فولادی، زبان عرفان، ل٢٤٧.

دەڵێن، جارێکیان هەندێك خەڵك ئامادەبوون تا نوێژی (مردووی) جەنازەیەك بکەن، (شبلی —، کە یەکێکە لە عارفە گەورەکان) لەوێ بوو، گوتی: مایەی سەرسوڕمانە، کۆمەڵێ خەڵکی مردوو هاتوون تا نوێژ لەسەر زیندوویەك بکەن!.

لێرەدا پێچەوانەی باو ئەوەیە، کە (شبلی)، مردوو بە زیندوو، زیندووش بە مردوو ناوزەد دەکات"[٤٢٠].

پێچەوانەی باو، لەڕووی چییەتییەوە، کردارییە، بەڵام لە دوو ڕوانگەوە پەیوەندی بە گوفتارەوە هەیە. یەکەمیان، دەرکەوتنیەتی لە چیرۆکە عیرفانییەکاندا بەو شێوەی (دەگێڕنەوە)، دووەمیان، لەڕوانگەی دەرکەوتنی (ئەم پێچەوانەی باوە) لەم چیرۆکانەدا بە شێوە و وێنەی (ڕوداو). لەسەر ئەم بنەمایە، ئەم جۆرە (واتە پێچەوانەی باو) جۆری گێڕانەوەیی (پارادۆکس)ە، بەجۆرێك، کە دەتوانین بە (پارادۆکسی گێڕانەوەیی) ناوزەدی بکەین. بەمشێوەیە، پێچەوانەی باو، هیچ نییە جگە لە دژیەکبوونی کردار لەگەڵ باودا، ئیتر ئەو کردارە (گریمانەیی) بێت، یاخود ڕووداو.

دروستکردنی ئەوجۆرەش، وەك هەموو جۆرەکانی پارادۆکس، پەیوەستە بە بنەمای کۆکردنەوەی دوو دژیەك، بەڵام لەم جۆرە پارادۆکسەدا، دژێکیان لەناو خودی گوتەکەدایە و دژەکەی دیکەش لە دەرەوەی گوتەکە.

عیرفان ئەگەر ناوێکی دیکەی هەبێت ئەوا پێویستە پێی بوترێت، قوتابخانەی دژە باو، یاخود پێچەوانەی باو، چونکە عیرفانی تیۆری پەیوەست بە دید و تێڕوانینەوە پەیوەندی هەیە بە پێچەوانەوە دژایەتیکردنی باوەوە،

---

[٤٢٠] علیرضا فولادی، زبان و عرفان، ل٢٥٢.

هەروەها عیرفانی کرداریش هیچ نییە جگە لە پێچەوانەی باوبوون لە کرداردا، وەك ئەحمەد غەزالی دەڵێت: "لێرە ڕاستییەکان پێچەوانە دەبنەوە"[٤٢١].

ئەندێشەی (ئاشنایی بە زەین و خەیاڵ)، کە بنەڕەتی (پێچەوانەی باو) پێکدەهێنێت، ئەندێشەیەکی بنەڕەتی عیرفانیە. چەندین سەدە بەرلەوەی (ڤیکتۆر شکلۆفسکی)، کە لە پێشڕەوانی فۆرمالیستی ڕوسییە، ئەم ئەندێشەیە وەك تیۆرێکی ئەدەبی بخاتەڕوو، (عین القضاة)، کە لە تیۆریزەکارانی عیرفان و ئەدەبی عیرفانی ئەم ناوچەیە، جەخت لەوەدەکاتەوە، کە سەرسوڕمان و واق وڕمانی مرۆڤ لە نەبینینی دیاردەکان نییە، بەڵکو لە نەزانینی ئەوانەیە، چەندە زۆرن ئەو دیاردانەی بەهۆی عادەتەوە، مایەی سەرسوڕمان نین، واتە عادەتمان پێی کردووە و بووەتە باو، بەڵام هەرکات، کە پەردەی (عادەت) لادەبەین، دەبنە مایەی سەرنج و سەرسوڕمان.

مەولانای ڕۆمی دەڵێت:

اسمید و حروفید و کلامید و کتابید
جبریل امینید و رسولان سمایید[٤٢٢]

واتە: ناو و پیت و گوتە و ڕستە و کتێبیت
جوبرەئیلی ئەمین و پێغەمبەرانی ئاسمانیت
چۆن دەکرێ (جوبرەئیل)یش بیت و پێغەمبەریش بیت؟!

---

[٤٢١] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٢.

٤٢٢ جلال الدین محمد بلخی، مولانا. غزلیات شمس تبریزی، مقدمه گزینش وتفسیر: محمد رضا شفیعی کدکنی، جلد دوم. انتشارات سخن – تهران، چاپ سوم، ١٣٨٧ هـ.ش. ل١٣٦٧.

مەولەوی تاوەگۆزی لە ڕاستی هاوکێشەی (چاکەکردن و پاداشت وەرگرتن)، کە یاسایەکی دادپەروەرانەی خواییە، وێنەیەکی ناعادەتی دادەتاشێ و دەڵێت:

یا خەلیل، دەخیل کێ عادەت کەردەن

تۆشە وە دەرگای کەریمان بەردەن؟[٤٢٣]

### ٣-٣-ج/ تەجرید:

"جۆرێکە لە پارادۆکسی (دەروونی – کرداری)، کە لەوێدا واتە لەم جۆرەدا (منی باڵا)ی عارف لە (من)ی ئەو جیادەبێتەوە. وەك (بایزید) دەڵێت: "لە بایەزیدی هاتوومەتە دەرێ، هەروەك مار، کە لە کاژەکەی دێتە دەرەوە، پاشان سەیرم کرد، عاشق و مەعشوق و عیشقم وەك یەکەیەك پێکەوە بینی، کە لە جیهانی یەکتاپەرستیدا هەمووان دەبنەوە یەك..."[٤٢٤].

ئەم حاڵەتە، دوو کەسایەتی بۆ عارف دروستدەکات، لەکاتێکدا ڕەهەندی زمانی وەردەگرێ، کە گوزارشتی لێ بکات.

تەجرید، هۆکاری بنەڕەتی پەیوەست کردنەوەی زمانی عیرفانە بەجۆرێك لە سوریالیزمەوە، کە سوریالیزمی سروشتییە و دەکرێت بە (سوریالیزمی عیرفانی) ناوزەدی بکەین.

ئەمیش هەروەك جۆرەکانی تری پارادۆکس لەسەر بنەمای دوالیزمی دژیەکە.

باوەڕ بە بوونی (منی باڵاتر) بنەڕەتی ئەندێشەی تەجریدییە لە عیرفاندا.

مەولانای ڕۆمی دەڵێت:

---

[٤٢٣] دیوانی مەولەوی، ل٤٠٠.

[٤٢٤] علیرضا فولادی، زبان عرفان، ل٢٧٨.

نی من منم، نی تو تویی، نی تو منی

هم من منم، هم تو تویی، هم تو منی

من باتو چنانم ای نگار خود تنی

که اندر خلطم، که من تو ام یاتو منی[٤٢٥]

واتە: من منم و تۆ تۆیت و تۆ منیت، هەروەها من منم و تۆیش تۆیت و هەروەها تۆ منیت

من لەگەڵ تۆدا وەك نیگارێك پێكەوە چنراوین، کە تیاماوم، کە من تۆم، یاخود تۆ منیت؟!

بێگومان مەولەویش لەم جۆرە هونەرەی پارادۆکسی زۆرە، بەڵام لای مەولەوی (منی باڵا) بەردەوام لۆمەی (دڵ) و (نفس) منی حەقیقی مەولەوی دەکات. وەکو لە هەموو ئەو هۆنراوانەدا هاتووە، کە بە (دڵە...) (ئەی دڵ...) دەست پێ دەکات[٤٢٦].

### ٣-٣-د/ وڕێنەکردن، بزرکاندن (شطح):

"جۆرێکە لە پێچەوانە هاتنەوە، یاخود دژوەستانە لەگەڵ عورفی ڕووکەشی (شەرع)دا.

(عطّار) لە وەسف و باسی بزرکاندندا دەڵێت: "شتانێك لە تەریقەتدا هەن و دەگوترێن، کە لەگەڵ ڕواڵەتی دەرەوەی شەرعدا دژن..."[٤٢٧].

---

[٤٢٥] کلیات شمس تبریزی، ل١٠٤٥.

[٤٢٦] بڕوانە دیوانی مەولەوی لاپەڕەکانی ٣٠٠ و دواتر.

[٤٢٧] علیرضا فولادی، زبان عرفان، ل٢٨٣.

لە ئەدەبیات و نووسینی سۆفیزمدا (من) و (منی بالاّ) پێکەوە لە بزاوتنێکی جەدەلی ئەوتۆدا دەتوێنەوە، کە خودی مرۆڤ لەگەڵ نهێنییەکانی ناخیدا تەبا دەکات، هەربۆیە ئەوجۆرە بەرهەمەی، کە دەرەخسێ قووڵترە، یاخود لە بەرهەمێکی ئەدەبی بالاّترە. هەروەك ئەوەی ئەو گوتە و دەقە لە میتافیزیکەوە بێت، هەروەك سروتێکی نهێنی وایە لە دیوی ناوەوەی گوتە و دەقدا. هەر لەم ڕوانگەیەوە لە چاوەڕوانییەکی چاوەڕوان نەکراو دەچێت، لە ویست و خواستێك دەچێت، کە ئامانجە بەدەستهێنراوەکان زیاتر خواست و تینوویەتیمان بۆ دروست دەکەن... هەموو ئەمانە دەدرێنە پاڵ بزڕکاندن.

بزڕکاندن ئاشکراکردنی ئەم گەردوونە گەورەیە، کە لێوانلێوە لە شتی ناکاو و سەرسووڕهێنی کۆتایی نەهاتوو، لێرەوەیە کە بزڕکاندن هێزی تەقینەوەیە. هەموو شێوازەکانی بیرکردنەوەی باو تێکدەشکێنێ، هەموو شێوازەکانی نووسین و دەربڕینی باو تێکدەشکێنێ. جۆرێکە لە دزەکردن بۆ ئاشنابوون بە ناخی مرۆڤ، ئەوەی، کە نابینرێ... هەموو ئەمانە جوانییەکی گەورە بەدیدەهێنێت، کە پێی دەگوترێت ئیستاتیکای دەقی عیرفانی، یاخود سۆفی"[٤٢٨].

زۆرجار بزڕکاندنی عیرفانی لەبەرئەوەی، کە بە ڕووکەش پێچەوانەی شەرعە، خاوەنەکەی دەخاتە بەردەم هەڕەشەی کوشتن و بەڵکوو خودی کوشتن. دیارترینیان لە مێژووی عیرفانی ئیسلامیدا بریتین:

- لەوەی بایزید: "سُبحاني ما أعظَمَ شأني".
- ئەوەی حلاج: "أنا الحَق".

---

[٤٢٨] ادونیس، الصوفیة و السوریالیة، ل١٤٧.

- یان ئەمەی ابو سعید: "لیس في الجُبَّةِ سِوَی الله".

دروستکردنی بزرکاندن، وەك جۆرێکی پارادۆکسی کرداری، لەسەر بنەمای دوالیزمی دژیەکە، بەڵام یەکێك لەو دوو دوالیزمە دژیەکە، دەبێت باوەڕ، یاخود کارێکی شەرعی بێت[٤٢٩].

لەم چوارچێوەیەدا مەولانای ڕۆمی دەڵێت:

با شَهِ تبریز، شمس الدّین، خداوند شَهان
جان فدا دارید و تن، قربان ز بهرِ وي کنید[٤٣٠]

واتە: لەگەڵ شای تەبرێزدا، شمس الدین، کە خوای شاکانە
گیان و جەستەتان بکەنە فیدای و قوربانی بۆ بکەن

یاخود دەڵێت:

شاهِ جان ها شمس تبریز ست و این دم آنِ اوست
رخ بدو آرید و خودرا جمله ماتِ شَهْ کنید[٤٣١]

واتە: پادشای گیان و ڕۆحەکان شەمسی تەبرێزییە و ئەم گیانەش هەر هی ئەوە
ڕوو بکەنە ئەو و هەمووتان بە دەستە خۆتان (مات)ی شا بکەن

مەولانای ڕۆمی جگە لەم ناوەڕۆکە پڕ لە بزرکاندنانە، چەندین هۆنراوەی دیکەی هەیە، کە ئاماژەیە بۆ وتنی حاڵەتی وا. بۆ نموونە لە هۆنراوەیەکیدا دەڵێت:

چون چنگم از زمزمه خود خبرم نیست
اَسرار همی گویم و اَسرار ندانم[٤٣٢]

---

[٤٢٩] علیرضا فولادی، زبان عرفان، ل٢٨٧ بەدواوە.

[٤٣٠] کلیات شمس تبریزی، ل٣٣٠.

[٤٣١] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣١.

واتە: وەك (چنگ) وام، کە هیچ ئاگایەکم لە دەنگ و گۆرانیی خۆم نییە

بەردەوام نهێنییەکان دەدرکێنم و هیچ نهێنیەکیش نازانم

یاخود لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێت:

سخن راست تو از مردم دیوانه شنو

تا نمیریم، مپندار، که مردانه شویم[٤٣٣]

واتە: گوتەی ڕاست، لە خەڵکی شێت ببیستە

تا نەمریت بە تەمای پیاوبوون مەبە

مەولەوی تاوەگۆزی بەم جۆرە باسی بەهەشت دەکات، کە بەشێکە لە مەرجی باوەڕی موسڵمان:

بەهەشت باقی دین دڵبەرەن

جە قیسمەتخانەی ئەمن ئەودەرەن

ساکەوەی دینەن بەهەشت باقی

ئیسە من پەی دین، دۆزەخیم تاقی[٤٣٤]

واتە: بەهەشتێك، کە هەر بمێنێتەوە و هەبێت بینینی دڵبەرە، ئەویش لە قسمەتخانەی تەبا و هێمنایەتی دوورە، جا، کە بەو (دین)ەیە یا بەو بینینەیە بەهەشتی باقی، ئێستە من بەم دینەوە بەڕاستی دۆزەخیم[٤٣٥].

---

[٤٣٢] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٨٢.

[٤٣٣] سەرچاوەی پێشوو، ل٨٧٣.

[٤٣٤] مەولەوی تاوەگۆزی، دیوانی مەولەوی، لەسەر بناغەی تێکۆشانی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، پێداچوونەوە و ڕێك و پێك کردن و زیادکردنی شیعرە چاپ نەکراوەکان: حەسەن گۆران و محەمەد حیجازی، دەزگای رۆشنبیریی گۆران، چاپی یەکەم، ٢٧٠٤ی کوردی، ل١٢٦.

[٤٣٥] سەرچاوەی پێشوو.

یاخود لە هۆنراوەیەکیدا، کە باسی هاتنی مانگی ڕەمەزان دەکات بەناوی (سەدای های هیلال) باسی پاکییەتی و دڵسۆزی خۆی و گرۆی مەی نۆشان دەکات لەبەرامبەر ڕیابازی و شێوەی دووڕوویی مورید و سۆفییەکان و دەڵێت:

مورید و سۆفی خەرقەی ریاپۆش

من و دامنەی پاك پیر مەی فرۆش

هەرکات چەنی دۆس وێمان نەمەحشەر

وەسەد ئارەزوو سەربارین ئەوبەر

بزانین کێمان راگە گوم کەردین

کێمان مایەپووچ کێمان سوود بەردین[٤٣٦]

بەگشتی بابەتی بزرکاندن و جۆرەکانی دیکەی پارادۆکس جگە لەوەی وەك بابەتی عیرفانی و چۆنییەتی جیهانبینی عارف، جوانی خۆی هەیە وەك چۆنیەتی زمانی دەربڕینیش هەڵگری بەهای ئیستاتیکییە. ئەدەبی عیرفانی لە لوتکەی توانایی دەربڕینی واتا پڕمانا و شاراوەکاندایە و دەتوانین بڵێین عارفی نووسەر و ئەدیب، یاخود شاعیری عارف و سۆفی خاوەنی باڵاترین هێزی دەربڕین و زمانی ناخە، چونکە وەك چۆمسکی دەڵێت: "ئەگەر بمانەوێت وەسفێکی سادەی زمان بکەین، ئەوا پەیوەستکردنەوەی دەربڕین و واتایە. دەسەڵات و دەسەڵات شکانەوە بەسەر زماندا لە بنەڕەتدا بەواتای توانایی پەیبردنە بە گوتەکان و بەرهەمهێنانی سیمبۆلی ئەوتۆیە، کە دەربڕینی واتاکان بە ئەنجام بگەیەنێت"[٤٣٧].

---

[٤٣٦] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٦.

[٤٣٧] نوام چامسکی، زبان و ذهن، ترجمە: کورش صفوی، انتشارات هرمس – تهران، چاپ پنجم، ١٣٩٠ هـ.ش. ل١٦٣.

توێژەرێکی تری ئەم باسە، ئاوا لە حاڵەتی شەتەحات وتنی عارفان دەدوێت: "لە جیهانبینی عیرفانیدا، ئاگایی و ناسینی مرۆڤ مەسەلەیەکی دەروونی و (شهودی)یە، کە نامۆیە بە عەقڵ و ویست و لە ناخی رۆح و دڵەوە سەرچاوە دەگرێت. ئەم مەعریفە هی ناخە و بە ویست نییە، لەڕوانگەی سۆفییەوە زادەی لوتفی خوایی و خواستی یەزدانییە و لە ساتەکانی بێهۆشیو وڕێنەکردندا دێتە بەرهەم. بۆیە گێڕانەوە و دووبارەکردنەوەی وەك ئەزموونێکی زمانی، کارێکی مەحاڵە. کەسێك، کە بێ دەسەڵاتە لەبەرامبەر دابەزینی مەعریفەیەکی خواییدا و لە حاڵەتی ناهۆشیاریدا ئەزموونی ڕۆحی خۆی دەگێڕێتەوە و هەر لە زمانی وەسف و لێکچواندنیش دەستەوسانە، ناچارە ئەزموونەکانی خۆی بە زمانی ڕەمز و سیمبول بگێڕێتەوە"[٤٣٨].

هەربۆیە ئەم جۆرە دەربڕین و زمانە بە زمانی هونەری و ئیستاتیکیی ئەژمار دەکرێت، چونکە سود وەرگرتن لە سیبموڵ و زمانی ڕەمزی تایبەتمەندییەکی هونەری و ئیستاتیکییە.

زمانی سۆفی و ئەهلی تەسەوف، لەو ڕوانگەوە، کە دەیەوێت دەربڕی ئەزموونی سۆفیانە و پەیبردن و ئاشنایەتی بێت بە هۆشیاری دەروونی، بۆیە لەگەڵ زمانی ئاساییدا جیاوازە.

دکتۆر (مهین دخت فرخ نیا)، مامۆستا لە زانکۆی (شهید باهنر) لە (کرمان) سەبارەت بە ڕەهەندی هونەری و ئیستاتیکیی بزرکاندن و سەرجەم جۆرەکانی دیکەی پارادۆکس و دوالیزمی دژیەك. دەڵێت: "شەتەحاتی سۆفییەکان – جگە

---

[٤٣٨] مهین دخت فرخ نیا، شطح جلوهٔ هنر در زبان تصوف، نشریه دانشکده و ادبیات و علـوم انسانی، شماره ١٠.

لەوەی چەندین واتا و چەمکی عیرفانی قووڵ دەگرێتە خۆی، لەڕوانگەی هونەری و هونەری ئیستاتیکایشەوە، جێگای تێڕامانە"[٤٣٩].

ئێمە دەزانین، کاتێك کە زمانی پەخشان، دەگۆڕێت بۆ زمانی هونەری، پێویستە چەندین تایبەتمەندی جیاکەرەوەی هەبێت بەراورد بە زمانی ئاسایی و لۆژیك و ئەم تایبەتمەندییە جیاکەرەوانەش تەنها لە ساتەوەختی شکاندنی شێوازی ئاسایی زماندا دێتە بەرهەم و جۆرە فۆرمێکی جیاواز لە دەربڕیندا دێنێتە کایەوە، کە جیاوازە لەگەڵ فۆرمە دووبارەبوو و ساکارەکەی زماندا. یەکێك لەو فۆرمە جیاوازانەی، کە زمانی هونەری پێ دەناسرێتەوە، جگە لە وەلانانی یاساکانی دەربڕینی ئاسایی، بوونی چێژی میوزیکییە لە دەربڕینەکەدا واتە وشە و کەرەسەکانی دەربڕین بەجۆرێك هەڵدەبژێردرێن، کە سیستمێکی، یاخود دەربڕینێکی مۆسیقی بەدیدەهێنن.

لێرەدا و لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوە لە پارادۆکس و دوالیزمی دژیەك و جۆرەکانی لە دیدێکی ئیستاتیکییەوە، پێویستە ئەگەر بەکورتی و راگوزاریش بێت باسی دوالیزمی دژیەك و ڕەهەندی ئیستاتیکیی میوزیکی ئەم هونەرە بکەین.

## ٣-٤/ میوزیکی شیعری وەك ڕەهەندێکی ئیستاتیکیی دوالیزمی دژیەك:

میوزیکی شیعر، دیاردەیەکە بۆ ئاراستەکردنی خەیاڵ و کاریگەری زیاتری دەربڕین. کاتێك میوزیك لە شیعردا پڕ رەنگتر دەبێت، پێویستە ڕەچاوی کاریگەری و ڕەهەندەکانی کارایی بکرێت بەتایبەتی کاتێك، کە ئەم دیاردە

---

[٤٣٩] سەرچاوەی پێشوو.

میوزیکییە لە ڕەنگدانەوەی واتا و گواستنەوەی هەست و سۆزدا ڕۆڵی بەرچاوی هەیە. لە هەندێك شیعردا دەبینین، کە ئەوە میوزیکە ڕۆڵی لە نواندنی شیعردا هەیە، کەواتە ڕەچاوکردنی گۆشە جیاوازەکانی میوزیکی تایبەت بە شیعر لە ئاشکراکردنی واتا و هەست و حاڵەتەکاندا، زۆر کاریگەری هەیە[٤٤٠].

هەر لەم ڕووەوە ئەدەبناسێکی تر دەڵێ: "هەموو وشەیەك لە زماندا، دیوێکی واتایی و سۆزداری و میوزیکی تایبەتی هەیە، کە بمانەوێت و نەمانەوێت، کاردانەوەی تایبەتی لە زەین و دەروونی ئێمەدا دەبێت. هەر وشەیەك وێڕای ئەوەی هەڵگری چییەتی کولتووری و مێژوویی زمانێکی تایبەتە، لەهەمانکاتدا هەڵگری ئاواز و ئاهەنگێکی میوزیکی تایبەتە. بۆنموونە ئەگەر دوو وشەی هاو واتامان هەبێت، دەتوانن دوو جۆر کاریگەری دەروونی لای ئێمە دروست بکەن، یەکێکیان نەرم و دڵگیر و ناسك، کە ڕۆح بێنێتە سەما و دەروونمان ئارام بکاتەوە، بەڵام دووەمیان زبر و قورس لە گوێ دا بەجۆرێك ئازاری ڕۆح بدات و دڵ بتۆرێنێ. بەم پێیە بنەڕەتی یەکەمی جوانی دەقی ئەدەبی، هەڵبژاردنی ئەو وشە و دەستەواژانەیە، کە لەڕووی میوزیکییەوە گونجاون لەگەڵ دەربڕین و واتاکەدا"[٤٤١].

ڕۆمان یاکوبسن، لە بابەتێکدا بەناوی (زبانشناسی و شعرشناسی) وێڕای ئاماژەکردن بە ڕای کەسانێکی وەك (ڤالێری)، کە شیعر بە کاردانەوەی دوو جەمسەری نێوان میوزیك و واتا دەزانێت و هەروەها (ئەلکساندەر پۆپ)، کە دەیگوت: "میوزیك لە شیعردا پێویستە ڕەنگدانەوەی، یاخود پاشخانی واتا

---

[٤٤٠] علی اصغر محمودی، بررسی اندیشه و ذهن در موسیقی شعر با توجه به غزلیات شمس، ل١. سایتی: www.sid.ir

[٤٤١] مهدی محبتی، بدیع نو، ل١٢٧.

بێت"، ئاماژە بە میوزیکی نێو شیعر دەکات و باس لە بەرفراوانی کاریگەرییەکەی دەکات.

هەروەها (شفیعی کدکنی)یش لەوبارەوە دەڵێت: "شتێك، کە لە تێڕوانینی فۆرمالیستە ڕووسەکاندا ئاماژەی پێ کراوە، لە شیعردا، میوزیکی وشەکانە، کە ئاراستەی (واتا) دەکات، بەڵام لە پەخشاندا (واتا) ئاراستەی وشەکان دەکات"[٤٤٢].

پەیوەست بەم دوو شاعیرەوە (واتە مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزی) زمانی شیعر نووسینی هەردووکیان (فارسی + شێوەزاری هەورامی) بەجۆرێك لیریکی و ئاوازەدارن، کە دەتوانین بڵێین ڕکابەریان نییە.

هەروەها پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین، کە بەشێك لە باسی بابەتی، یاخود پێکهێنەرەکانی میوزیکی شیعری هەردوو بابەتی (هاوپیتی، یاخود هاودەنگی – Alitration) و (دەنگە واتایی – Onomatopoeia) یە، بەڵام لێرەدا ئێمە باسی ناکەین، چونکە تەنها باسی دوالیزمی دژیەك و جۆرەکانی لەڕوانگەی ئیستاتیکای میوزیکییەوە، ئامانج و مەبەستی ئێمەیە.

بۆئەوەی بتوانین تێگەیشتنێکی هاوبەشمان هەبێت بۆ (میوزیکی شیعر) پێویستە لێرەدا ئەم ڕوونکردنەوە و پۆلێن بەندییە، بخەینە ڕوو، کە سیستەمی ئاوازی شیعر چەند جۆرێکی هەیە، کە بەکورتی ئەمانەن:

١. میوزیکی دەرەکی شیعر (واتە عەروز).
٢. میوزیکی تەنیشت، یاخود کەنار (واتە قافیە و هەر پیت و شتێکی دیکە، کە ئەو ڕۆڵە دەبینێ)

---

[٤٤٢] علی محمدی آسیا بادی، تحلیل ساختاری غزلی از مولوی، ل١، سایتی: www.sid.ir

٣. میوزیکی ناوەکی (کە بریتیە لە کۆمەڵێ هاوئاهەنگی، کە لەڕێگەی بەرامبەر بەیەك دانانی دژەکان (دەنگ دار و بێدەنگەکان) لە شیعردا بەدیدێت، هەروەها هەموو جۆرەکانی (جیناس)، بەگشتی لە دەرکەوتەکانی تایبەت بە میوزیکی ناوەکی شیعرن).

٤. میوزیکی مەعنەوی (مەبەست لە هەموو ئەو پەیوەندییە نهێنی و شاراوانەیە، کە لەنێوان پێکهاتەکانی دوو نیو بەیت، یاخود بەیتێکی شیعریدا هەیە، کە لەڕێگەی پێکهاتەی دژیەکان و (طباقە)کان...هتد، بەدیدێت".

زانای ئەدەبناسی ئێرانی، کدکنی، دەربارەی ریتم و ئاوازەی شیعری دەڵێ: "میوزیکی مەعنەوی، کە بناغەی پەیبردنە بە جوانی، لەچاو جۆرەکانی دیکەی میوزیکی شیعریدا، لە دوالیزمی دژیەك و جۆرەکانی دروست دەبێت. کۆکردنەوە و دەستەبەندیکردنی کەرەسەکانی ئەم جۆرە میوزیکەیە، واتە میوزیکی مەعنەوی، کارێکی ئاسان نییە، چونکە لە چوارچێوەی چەمك و بابەتە دژەکاندا، زیاتر کارا دەبێت نەك لە بازنەی دەنگ و پیت و وشەکان"[٤٤٣].

ئەگەر تیۆری فەلسەفەی (أخوان الصفا) لە بابەتی میوزیك و چەمکی میوزیکەوە، کە بریتیە لە (زانستی ڕێژەکان) و (ناسینی، یاخود ئاشنابوون بە چۆنییەتی پێکەوە چنین و ئاوێزانکردن)، بزانین، ئەوا زاراوەی میوزیکی مەعنەوی لامان نامۆ نابێت، بەڵکو جگە لەوەی لامان ئاسایی دەبێت هەستیشی پێ دەکەین، هەروەك چۆن دژیەك و لێکچوونەکان، لە زەمینەی ئاوازی زمانیدا، میوزیکی دەنگەکان دروست دەکەن، هەمان بەراورد و لێکچواندنەکان و

---

[٤٤٣] محمد رضا شفیعی کدکنی، موسیقی شعر، بڕوانە ل٣٠٧.

دوالیزمە دژیەکەکان لە زەمینەی بابەتی واتایی و زەینیدا میوزیکی مەعنەوی دروستدەکەن... لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە، کە ئەم پێکهێنەرانە میوزیکی شیعری مەعنەوی (کە دوالیزمی دژیەك گرنگترینیانە) ڕەهەندێکی ئیستاتیکیی میوزیك دەبەخشنە شیعر[٤٤٤].

سەبارەت بەم جۆرە میوزیکە لە هۆنراوەکانی مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزیدا، چەندین نموونەمان بەرچاو دەکەوێت، کە زادەی جیهانبینی عیرفانی ئەو دوانەیە و (دوالیزمی دژیەك)یش بەشێکە لە پێکهاتەی ئەو جیهانبینییە.

مەولانای ڕۆمی لەم بارەوە دەڵێت:

باز آمدم چون عیدی نو، تا قفل زندان بشکنم
وین چرخ مردم خوار را چنگال و دندان بشکنم
هفت اختر بی آب را کاین خاکیان را می خورند
هم آب بر آتش زنم هم بادهاشان بشکنم[٤٤٥]

واتە: وا هاتمەوە وەك جەژنی نوێ، تا قفڵی زیندان بشکێنم
ئەم چەرخشی گەردوونە کە خەڵکی دەخوات، بشکێنم
حەوت ئەستێرەی بێ ئاو، کە ئەم خەڵکە خاکییە دەخۆن
هەم ئاو بکەم بە ئاگردا و هەم (با) کانیشیان بشکێنم

مەولەوی تاوەگۆزیش لەم چوارچێوەیەدا دەڵێت:

مەینەت، سەربەرزەن، شادیم زگارەن
ساقی! جامەکەت ئەمجار وە کارەن[٤٤٦]

---

[٤٤٤] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٩٠.

[٤٤٥] کلیات شمس تبریزی، ل١٠٧.

یاخود دەڵێت:

مەزموون هەوای مەرگ، زامداری تیرت
پەنهانی قاتیل، دەوا و تەدبیرت[٤٤٧]

## ٣-٥/ هۆکانی ڕەنگدانەوەی دوالیزمی دژیەك لە هۆنراوەکانی مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزی دا:

بێگومان شاعیر لە دەستپێکی کاری خۆیەوە قاڵبی پێشوەخت و مەرجی پێشوەختی نییە تا ڕەچاوی هونەرێك، یاخود شێوازێکی دەربڕینی دیاریکراو بکات، بەڵکو دواتر ئێمە مامەڵە لەگەڵ ئەنجامەکەیدا دەکەین، کە بابەتەکانی دەربڕین و کەرەسەکانی چین و نرخیان بۆ دادەنێین.

دوالیزمی دژیەك چ وەك هونەرێکی دەربڕین و چ وەك هۆی نرخ بۆدانان و خوێندنەوەی دەق، گرنگی و بایەخێکی فرە ڕەهەندی هەیە و وەك لە ڕابردوودا باسمان کردووە ڕەگ و ڕیشەی لە زۆر کایەی مەعریفی و فەلسەفی و تیۆلۆجی و لۆجیکی دا هەیە.

ئێمە ناتوانین لەبری مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزی وەڵامدەرەوەی ئەو پرسیارە بین، کە بۆچی دوالیزمی دژیەکیان بەکارهێناوە، بەڵام ئەگەر هەوراز و نشێوەکانی ژیانی تایبەتی ئەم دوو شاعیرە بزانین و بەچاوێکی کراوە و تیژەوە لە هۆنراوەکانیان ورد و قووڵ ببینەوە لە ناوەڕۆك و چۆنیەتی دەربڕینەکانیان، ئەوکات هەست بەو ڕاستییە دەکەین، کە ڕەنگدانەوەی

---

[٤٤٦] دیوانی مەولەوی، ل٣٨.

[٤٤٧] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٥.

دوالیزمی دژیەك لە هۆنراوەكانیاندا تەنها ڕووكار و وەڵامێكی سادە هەڵناگرێ، بەڵكو چەندین هۆ بۆ ئەم كارە هەن، كە بە بڕوای ئێمە هەندێكیان ئەمانەن:

١. **زۆر وردی لە بیركردنەوەدا، قووڵی بیركردنەوە، بابەتی چێژبەخش:**

ئەمانە سێ تایبەتمەندی زۆر دیارن، وەك شوناسی هەربابەتێك، كە ئەم دوو شاعیرە، خواستبێتیان بیكەنە بابەتی هۆنراوەكانیان. بابەتەكانی ئەم دوو شاعیرە ئاسمانی عیرفانی مرۆڤانەن، بەجۆرێك سەرنجی خوێنەر بۆلای بابەتەكەیان ڕادەكێشن، كە تووشی ڕامانێكی قووڵی دەكەن، لەگەڵ گەورەیی و گەردوونیبوونی بابەتەكاندا زۆر چێژبەخشن، چونكە لە ئەنجامدا باسی حەقیقەتی ژیان و مرۆڤن.

بۆنموونە مەولانای ڕۆمی لەم دێڕە هۆنراوەیەدا دەڵێت:

طوافِ حاجیان دارم به گردِ یار می گرد
نه اخلاقِ سگان دارم نه بر مُردار می گردم[٤٤٨]

واتە تەواف و سوڕانەوەم هەیە بەدەوری كەعبەدا، هەروەكو حاجیان بەدەوری یار و مەعشوقەكەمدا، دەسوڕێمەوە. نەك وەك سەگ بەدەوری مردارەوبووواندا بخولێمەوە.

بابەتی حەج و مەراسیمەكانی یەكێكە لەو بابەتانەی، كە شاعیرانی ئەم ناوچەیە باسیان كردووە و كردوویانەتە كەرەسە و بابەتی شیعری خۆیان، بەڵام مەولانا وێنەی دوو جۆر كەسمان دەداتێ، كە هەردووكیان تەواف دەكەن، بەڵام دوو هەڵوێستی دژیەكی لێ كەوتووەتەوە ئەگەر چی یەك ئامانجیان هەیە. یەكەمیان، چونكە پەی بە حەقیقەتی (یار) بردووە، ئەوە مەعریفەی هەیە بە

[٤٤٨] محمد رضا شفیعي كدكني، غزلیات شمس تبریز، ج٢، ل٧٣٧.

حەج، بەڵام دووەمیان وەك سەگ وایە، چونکە وادەزانیێ ئامانجی حەج گەڕانە بە دەوری مردوواندا، ئەمە وردی و قووڵی بیرکردنەوەی مەولانا دەردەخات، کە بابەتێکی لەو جۆرەی بەشێوەیەکی چێژبەخش باسکردووە.

یاخود لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵیێ:

با شناسد کفشِ خویش ارچه که تاریکی بُوَد
دل ز راهِ ذوق داند کاین کدامین منزل است[٤٤٩]

واتە ئەگەرچی لە تاریکیدا بێت، مرۆڤ پێڵاوەکانی بە بەرکەوتنی پێی دەناسێتەوە، بەڵام دڵ لەڕێگەی زەوقی عارفانەوە دەزانێت، کە لە چ مەنزلەتێکدایە.

مەولەوی تاوەگۆزی دەڵێت:

نەك چەنی خەیاڵ قیبلەم بسازی
دەخیل تەن خەستەن وە جیاش نازی[٤٥٠]

واتە: نەکەی لەگەڵ خەیاڵکردنی خۆشەویستەکەم، کە وەکو قیبلەم وایە، ڕێك بکەویت، واتە تۆ لەگەڵ خەیاڵکردنی خۆشەویستەکەمدا ڕێککەویت و جەستەم بەجێبهێڵیت، نەکەی، دەستە و دامێنتم، جەستەم ماندووە و نەخۆشە بەجێینەهێڵیت.

تێبینی ئەوە دەکرێت لەسەرجەم هۆنراوەکاندا، کە یەکەمیان خستنەڕووی دووجۆر تەواف بوو، دووەمیان دووجۆر ناسینەوە، کە ناسینەوەی ماددی و ڕۆحی و زەوقی (سالك الی الله) بوو، دواجار ئەم هۆنراوەیەی مەولەوی

---

[٤٤٩] سەرچاوەی پێشوو، ج١، ل٢٨٢.

[٤٥٠] دیوانی مەولەوی، ل٥٦٤.

تاوەگۆزی، کە باسی ڕێککەوتن و چوونە پاڵ خەیاڵ دەکات، کە ئەگەری بەجێهێشتنی جەستەی تێدایە، بەگشتی و چەندین بابەتی زۆر ورد لەبیرکردنەوە، لەچوارچێوەی دەربڕیندا سوود لە دوالیزمی دژیەك وەرگیراوە (چ وەك وشە و چ وەك دەربڕین و وێنە) بۆ جوانی و چێژداری دەربڕین و گەیاندنی وێنە و واتا.

**٢. فرەیی لەبڕ و چەشنی وێنەکانی خەیاڵدا:**

لە هۆنراوەکانی ئەم دوو شاعیرەدا، هەست بەوە دەکرێ لە یەك سات و لە هۆنراوەیەکدا لەبەردەم چەندین وێنەی خێرادایین، کە بە زەینماندا تێدەپەڕن، چەندین وێنە، کە هەندێکیان دەربڕدراون و هەندێکی تریان تەنها دەبێت تێیان ڕامێنین ئەگەرنا عەقڵ و خەیاڵیش بێتوانایە لە ڕاڤەکردنیان.

مەولانا دەڵێت:

آبِ حیاتِ عشق را در رگ ما روانه کن
آینهٔ صبوح را ترجمهٔ شبانه کن[٤٥١]

واتە: ئاوی حەیاتی عیشق بکەرە ناو ڕەگ و دەمارەکانی ئێمە
ئاوێنەی بەرەبەیانی، ڕاڤەیەکی شەوانەی بۆبکە

هەریەك لە (شفیعی کدکنی) و (کریمی فیضی) و زۆر ڕەخنەگری گەورەی فارس لە ئاست ئەم هۆنراوەیەدا هیچیان نەنووسیوە و دەڵێن، ڕاڤە هەڵناگرێت.

یاخود هەر مەولانا دەڵێت:

شمسِ دین و شمسِ دین و شمسِ دین می گو و بَس
تا ببینی مردگان رقصان شده اندر کفن[٤٥٢]

---

[٤٥١] محمد رضا شفیعي کدکنی، غزلیات شمس تبریز، ج٢، ل٩٣٩.

**واتە: هێندە شمس دین بڵێ و تەنها ناوی ئەو بێنە**
**تا مردووەکان ببینی، کە لەناو کفنەکەیاندا سەما دەکەن**

**مەولەوی تاوەگۆزی دەڵێ:**

خێلخانەی مەینەت یەند ئاماوشییەن
وە سەفحەی دڵدا سۆهان ساو بییەن[٤٥٣]

**واتە: کاروانی مەینەت ئەوەندە هاتوچۆی کردووە بەسەر تەختی دڵما، وەك چەقۆی ساف بووی لە هەسان چووەوەی لێ هاتووە و پێی بەڵا ڕاگیر نابێ پێیەوە.**

**ئاوی حەیاتی عیشق چییە؟ چۆن وێنای بکەین؟ چۆن بکرێتە ناو ڕەگە ماددییەکانمانەوە؟**

**ئاوێنەی بەرەبەیان چییە؟ چۆن ڕاڤەی شەوانەی بکەین؟**

**چۆن وێنای مردووەکان بکەین، کە بەکەفەنەکانیانەوە سەما دەکەن؟**

**چۆن وێنای ئەو دڵە بکەین، کە وەك بەردی چەقۆ تیژکەر وایە؟**

**کۆی هەموو ئەم وێنانە مەبەستی گەورەیان لەپشتەوەیە، کە لە دەربڕیندا دوالیزمی دژیەك جوانترین و پڕ واتاترین هونەری دەربڕینە بۆ شاعیر، واتە فرەیی و ڕەنگاوڕەنگی وێنەکانی زەین و خەیاڵ لەڕێگەی دوالیزمی دژیەکەوە وەك هونەرێکی دەربڕین، ساناتر و جوانتر دەکەوێتەوە.**

---

[٤٥٢] سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٠٢.
[٤٥٣] دیوانی مەولەوی، ل ٤٣٢.

**٣. دوانەیی و دوو جەمسەری و ناسازی (بە ڕووکەش دیاری) پێکهاتەی بوون و خودی سروشت و یاساکانی هەبوون و جقات و مرۆڤەکانن:**

لەم جیهانە دروستکراوەدا بەگشتی و لە ژیاندا بەتایبەتی چەندین بابەت و گوزارەی دوانەیی دژیەك بەرچاودەکەون، کە دەرئەنجام ئەوانە خودی ڕەوش و یاسای ژیانن و لە چۆنیەتی ژیان و بیرکردنەوەماندا ڕۆڵی بنچینەیی دەگێڕن. بیرکردنەوە و دەربڕینی هەردوو شاعیرەکەشمان لە دەرەوەی ئەم چوارچێوەیە نییە، بەڵکو پەیبردنە بەو ڕاستییە و دەربڕینیەتی بە شێوازی جۆراوجۆر و جیاواز، هەر بۆ نموونە:

مەولانای ڕۆمی دەڵێت:

روز و شب باهم نشسته آب و آتش، هم قرین
لطف و قهری جفت و دُردی با صفا آمیخته[٤٥٤]

واتە: ڕۆژ و شەو پێکەوەن، ئاو و ئاگر هاونشینن
نەرم و نیانی و توندی پێکەوەن، سنگ بچووکی و سنگ فراوانی تێکەڵ بوون.

هەروەها دەڵێت:

بر هر گلی خاری بُوَد، بر گنج هم ماری بُوَد
شیرین مرادِ تو بُوَد، تلخی و صبرت آنِ من[٤٥٥]

واتە: هەموو گوڵێك دڕکی لەگەڵە، هەموو زێڕ و زیوێکی شاراوە مارێکی لەسەرە

---

[٤٥٤] محمد رضا شفیعی کدکنی، غزلیات شمس تبریز، ج٢، ل١١٥٥.

[٤٥٥] محمد رضا شفیعی کدکنی، غزلیات شمس تبریز، ج٢،ل٩٣٢.

شیرین، کە خواستی تۆیە، تاڵی و ئارامگرتنیش بۆ ڕۆحی من

مەولەوی تاوەگۆزی دەڵێ:

حەیات جە زوڵمات جیا نمەبۆ

کاوە وەبێ بەرگ سیا نمەبۆ[٤٥٦]

واتە: سروشتی ژیان بەوجۆرەیە، کە ئاوی حەیات لە تاریکیدایە و بەبێ قبووڵکردنی ناسۆرییەکان نابێت، هەروەکوو چۆن میسکی بۆنخۆش لە بەرگ و کیسێکی ڕەشدایە.

مەولەوی لە دێڕە هۆنراوەیەکی دیکەدا، هەروەك ئەوەی مەولانا، کە ئاماژەمان پێدا دەڵێ:

گوڵ عادەتشەن بێ خار نمەبۆ

گەنج ڕەویەشەن بێ مار نمەبۆ[٤٥٧]

واتە: گوڵ عادەت و سروشتی وایە بەبێ دڕك نابێت

گەنجینەی زێڕ و زیو، هەمیشە بەجۆرێکە، کە مار بەسەریەوە پەپکەی کردووە.

٤. زمانی شیعر، زمانی دژیەکە:

دوالیزمی دژیەك زمانێکی گونجاوە بۆ شیعر و لە دەربڕینی شیعریدا ناتوانین خۆمانی لێ ببوێرین. ئەوە زانای بواری زانستە، کە بەردەوام دەیەوێت ڕاستییەکانی گریمانەکراو لای خۆی بسەلمێنێت بەجۆرێك، کە بە یەك ڕاستی بگات و گریمانەی دژیەك لەسەر بابەتەکەی لابەرێت، بەڵام ئەو ڕاستیەی، کە

---

[٤٥٦] دیوانی مەولەوی، ل ١٤٢.

[٤٥٧] سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٨.

شاعیر ئاماژەی پێدەدات، پێدەچێت تەنها لەڕێگەی خستنەڕووی دژەکانەوە، ئاشکرا ببێ و دەرکەوێت. وەك لێكۆڵەرێك وتویەتی: "دژیەکەکان لەبنەڕەتدا لە چییەتی زمانی شیعرەوە سەرچاوەدەگرن، تەنانەت شاعیرێکیش، کە سادە و ڕاستەوخۆ دەبێژێت، ناچارە دەرئەنجامی چییەتی کەرەسەکانی ڕووە و دووان لە دژیەکەکان بڕوات"[458].

بڕوانە مەولانای ڕۆمی لەدەربڕینی بڕوای خۆیداً بۆ باسی (عەقڵ و عیشق) چۆن ئەم دوانە دەکاتە دوالیزمی دژیەك و دواتر لەبەر ڕۆشنایی ئەو بابەتەدا چۆن لەم دوانە دەدوێت:

گر درآید عاقلی، گو: "راه نیست."
ور درآید عاشقی، صد مرحبا
عقل تا تدبیر و اندیشه کند
رفته باشد عشق تا هفتم سما
عقل تا جوید شتر از بهرِ حج
رفته باشد عشق بر کوهِ صفا[459]

واتە: ئەگەر عاقڵێك سەر دەربهێنێ، ئەوا بڵێ، ڕێگە نییە لەناوماندا، بەڵام ئەگەر عاشقێك بێت، ئەوا سەدان جار سڵاوبێت لێی.

عەقڵ تابیردەکاتەوە و پلان دادەڕێژێ، عیشق دەگاتە حەوتەمین ئاسمان

عەقڵ تا بەدوای وشتردا دەگەڕێ بۆ سەفەری حەج، عیشق دەگاتە کێوی سەفا

[458] دیویە دیچز، شیوەهای نقد ادبی. ئەنتەرنێت.

[459] محمد رضا شفیعی کدکنی، غزلیات شمس تبریز، ج١، ل٢٣٧.

لەبەشێکی دیکەی هۆنراوەیەکی تردا دەڵێت:

عقل گوید: "پا منه، کاندر فنا جز خار نیست."

عشق گوید عقل را کـ"اندر تو است آن خارها"

هین خمش کن، خار هستی را ز پایِ دل بکن

تا ببینی در درونِ خویشتن گلزارها[٤٦٠]

واتە: عەقڵ دەڵێت "پێکانت مەخەرە ئەوێ، چونکە لەو فەنایەدا جگە لەدڕك هیچی تر نییە"

عیشق ڕوو بەعەقڵ دەڵێ: "ئەو دڕکانە لە تۆوەیە.."

ساتێك بێدەنگ بەو دڕکی هەبوون لەپێی دڵت دەربهێنە تا لەناخی خۆتدا گوڵزار و جوانی ببینی.

مەولەوی تاوەگۆزی، کە بەزمانی شیعر باس لە چۆنیەتی ژیان لەمانگی ڕەمەزاندا دەکات، مەی و مەیخۆران دەکاتە کەرەسەی بابەتەکەی، کە وەك دژێك لەبەرامبەر منارە و مزگەوت و خەڵکی نوێژ خوێندا، دەوەستنەوە و وەك دوو جەمسەری دژیەك دەیکاتە دەستپێکی بابەتەکەی و لەوێوە حاڵەتە دەروونی و ڕەفتارییەکانی هەردوولامان بۆ دەردەخات، وەك دەڵێ:

منارە، سەدای سەڵاش سەد تەرزەن

مزگی، جە شادی دەماخش بەرزەن

مەی نەخوم چون من نە خەم ئەسیرەن

مەیخانە سەفاش خەیلێ دلگیرەن

لوولەی تەراویح وەش وەش مدۆ دەنگ

---

[٤٦٠] سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٩.

بێ ئاهەنگەن تار تەموورەی ئاهەنگ

مەرحەبای لیباس تاعەت پۆشانەن

ئەلوەدای کاس کاس بادەنۆشانەن

پاشان دەڵێت:

هەی هیلال، هەی عید، خێزۆ جە یاران

وە ڕەغمی گرۆی پەرهێزگاران

شادی دەر وە دڵ لای مەی خواراندا

خەفەت دەر وە جەرگ ڕۆزەداراندا[٤٦١]

واتە: منارەی مزگەوت، بەسەد جۆر بانگ و سەڵایەتی و مزگەوت لەشادی هاتنی ڕەمەزاندا زۆر لوتی بەرزە. مەی لەناو خوم و کوپەڵەکەیدا هەروەك من زیندانییە، چونکە ڕەمەزانە، هەروەها مەیخانە خۆشی نەماوە و چۆڵە و دڵگیرە، لە لولەی ئاگری مزگەوتەوە دەنگ و نرکەی نوێژخوێنان و تەراویح دێت، بەڵام ئامێرەکانی میوزیك و ئاهەنگ خامۆشن، بێ دەنگن.

کاتی مەرحەبای ڕەمەزان و ملکەچی عیبادەتە و کاتی خواحافیزیە لەپێکی شەراب نۆشان.

ئەی مانگ، خێراکە وەرە جەژن بهێنە لەڕقی ئەم خەڵکەی مزگەوتدا.

وەرە شادی و خۆشی بگێڕەوە بۆ دڵی مەیخۆران و خەفەت بدەرە جەرگی ڕۆژووگران.

---

[٤٦١] دیوانی مەولەوی، ل٤٤٠.

**٥. ئەدەب لەخودی خۆیدا هەڵکشانە لەدەربڕینێکی سادەی هۆکاریەوە بۆ قووڵبوونەوە و بە ئامانج گرتنی خودی دەربڕین:**

کاتێ بەجۆرێك دەخوازرێت مەسەلە و بابەتێك بدرێتە بەر ڕووناکی و تیشك، یاخود سەرنج و ئاڕاستەکان ڕووەو ڕووگەیەك بکرێن، یان بەمانا ئەورووپاییەکە (focus) بکرێ، ئەمەش لەخۆیدا پێویستی بە چۆنیەتی دەربڕینێك هەیە سەرنجڕاکێش و لادەر لە سروشتی گشتی دەربڕین، کە بێگومان هەموو ئەو ڕاستیانە بوونەتە هۆی ڕەواج پەیداکردن و زۆرگرتنەبەر و بەکارهێنانی دوالیزمی دژیەك وەك جۆرێك لەدەربڕینی چێژبەخش و سەرنجڕاکێش بۆ هەموو ئەو بابەتە فرە ڕەهەندانەی، کە مەولانا و مەولەوی دەربڕینی ئەدەبیان کردووەتە هۆکاری دەربڕین.

مەولانای ڕۆمی دەڵێت:

چشمِ حرامخوارهٔ من دزدِ حُسنِ توست
ای جان، سزایِ دزدِ بصر می کنی، مکن[٤٦٢]

واتە: چاوی حەرامخۆری من، دزی جوانی تۆیە، ئەی گیان سزای دزی چاوان دەدەی، مەکە.

هەروەها لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێ:

بگو دل را، که گردِ غم نگردد
ازیرا غم به خوردن کم نگردد[٤٦٣]

---

[٤٦٢] محمد رضا شفیعی کدکنی، غزلیات شمس تبریز، ج٢، ل١٠٢٨.

[٤٦٣] محمد رضا شفیعی کدکنی، غزلیات شمس تبریز، ج١، ل٤١٦.

واته: بەدڵ بڵێ، کە لەدەوری خەم نەگەڕێ، چونکە خەم و خەفەت بە خواردنی کەم نابێتەوە.

لەهۆنراوەی یەکەمدا دەڵێ چاوی حەرامخۆر، کە دژی جوانی تۆیە، یاخود لە هۆنراوەی دووەمدا، خەم بەخواردن زیاددەکات، پێچەوانەی هەرشتێك، کە بەخواردن کەم دەکات، ئەمە شێوازێکی قووڵی دەربڕینە، کە سوود لە دوالیزمی دژیەك وەرگیراوە.

مەولەوی تاوەگۆزی دەڵێت:

هەریەك شەفیعێش پەی وێش ئاوەردەن

من خەجاڵەتیی وێم شەفیع کەردەن[٤٦٤]

واتە: هەرکەسە و لەڕۆژی قیامەتدا کەسێکی هێناوە تا ببێتە تکاکاری و شەفاعەتی بۆ بکات، بەڵام من دەرئەنجامی گوناهەکانم خەجاڵەتم و هەر ئەو خەجاڵەتی و زەلیلیەم هێناوە تا خوا ڕەحمم پێ بکات و ببێتە تکاکارم.

یاخود لە هۆنراوەیەکی دیکەدا دەڵێ:

شادی گەردی خەم چۆن نەدۆ وە باد

خەم چۆن وە یاگەی شادی نە بۆ شاد[٤٦٥]

واتە: شادی گەردی خەم دەدا بەبادا!! خەم بەجێگەی شادی شاد دەبێت!

[٤٦٤] دیوانی مەولەوی، ل٣٩٩.

[٤٦٥] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦٦.

**٦. باسکردنی هەندێ بابەتی ئالۆزی نێو کۆمەڵ:**

**که باسکردنیان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ڕاشکاوانە، کارێکی ئاسان نییە، بەڵکو بەشێوازی دوالیزمی دژیەکی ڕەخنەگرانە، وەکو گونجاوترین شێوازی دەربڕین خراونەتەڕوو.**

**مەولانا دەڵێت:**

کو خمرِ تن؟ کو خمرِ جان؟ کو آسمان؟ کو ریسمان؟
تو مستِ جامِ اَبْتری، من مستِ حوضِ کوثرم[٤٦٦]

**واتە: کوا مەیی جەستە؟ کوا مەیی گیان؟ کوا ئاسمان؟ کوا ڕێسمان؟ تۆ مەستی جامی ئەبتەری (ئاماژە بە ئایەتی ان شانئك هو الأبتر) واتە نەزۆکی و بێ بەرهەم دەرئەنجامی.**

**بەڵام من مەستی حەوزی کەوسەرم، (ئەو حەوزی ئاوەی، کە لەبەهەشتدایە و پێغەمبەر و باوەڕدارانی تایبەت لەسەری کۆدەبنەوە).**

**هەروەها دەڵێت:**

سخن چو نیك نگویی هزار نیست یکی
سخن چو نیکو گویی یکی هزار بُوَد[٤٦٧]

**واتە: ئەگەر قسەی باش نەکەیت، ئەوا هەزاری بەیەکێك نابێت، بەڵام ئەگەر قسەی باش بکەیت ئەوا یەکی بە هەزار ئەژماردەکرێت.**

**مەولەوی تاوەگۆزی دەڵێت:**

یەکێوەن جە لام شادی و ڕەنجوری

---

[٤٦٦] محمد رضا شفیعي کدکنی، غزلیات شمس تبریز، ج٢، ل٧١٠.

[٤٦٧] محمد رضا شفیعي کدکنی، غزلیات شمس تبریز، ج١، ل٥٤٨.

کەیفی و بیٚ کەیفی و نزیکی و دووری
وەشی و ناوەشی تەفاوت زانۆ
مەلیٚ نەزانۆ هەر پەلیٚ شانۆ
مەیل و قین هەردوو هەر جە شەخسیٚوەن
جەریمە و خەلاٚت شیٚوەی کەسیٚوەن[٤٦٨]

**یاخود دەلیٚ:**

ئاریٚ تاپەی ئەو من ڕۆمەن چون شەو
شەوقەن پەی خەندەی سوبحی جەبهەی ئەو[٤٦٩]

**واتە: تا من بۆ ئەو ڕۆژم وەکوو شەو وابیٚ، ئەوا تاریکی من زیاتر دەبێتە هۆی شەوق و ڕووناکی سپێدەی بەرەبەیانی خەندە و خۆشی ئەو.**

**٧. دەربڕینی مانا و ڕاستییە باڵاکانی عیرفان:**

**گرنگترین هۆی ڕەنگدانەوەی دوالیزمی دژیەك لە هۆنراوەکانی مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزیدا، دەربڕینی مانا و ڕاستییە باڵاکانی عیرفانییە، کە باڵاترە لە عەقلٚ و پێچەوانە دەبێتەوە لەگەلٚ نەریت و سروشتی ژیان، بەتایبەتی باسی عیشق و فەنا و یەکیەتی بوونو... هتد، کە هەموو ئەمانە پێکهێنەری دوالیزمی دژیەکی عیرفانین، کە سیمایەکی دیار و شوناسی شیعری ئەم دوو شاعیرەن. ژمارەیەکی زۆری ئەم جۆرە وێنانە، کە بەردەوام لە هۆنراوەکانی هەردوو شاعیردا چەندبارە دەبنەوە وەکو (گناه بی گناهی، غم شادی، دەردی بیٚ دەردی، گەرمی ساردی... هتد) هەموویان پەیوەستن بەدید**

---

[٤٦٨] دیوانی مەولەوی، ل٢٠٧.

[٤٦٩] سەرچاوەی پێشوو، ل١١٩.

و جیهانبینی عارفانەوە، یاخود بەشێکن لەئەدەبیاتی عیرفانی، چونکە "دیدی عارفانە و باوەڕی سۆفیانە بەگشتی لەزەمینە و پێگەیەکدان بالآترە لەوەی عەقڵ و نەریت پێی ئاشنایە و بەواتایەکی تر خودی ئەم تێڕوانینە پێچەوانەی عەقڵ و داب و نەریتە، هەربۆیە جێگای سەرسوڕمان نییە ئەگەر زۆرترین کار و ڕەنگدانەوەی دوالیزمی دژیەك لەئەدەبدا لەزەمینەی هەمان بیروباوەڕی عارفانەدایە، کە لەودیو عەقڵ و داب و نەریتەوە کاردەکات"[٤٧٠].

مەعریفە و دەرهاویشتە عیرفانییەکان لە جۆری (شهودی) بینراوی ئامادەیی (حضوری) و تاکەکەسین، بەجۆرێك، کە لە ئاستی فیکر و بیرکردنەوە بالآترە و تەنانەت جێگەی ئاماژەپێدان و باسکردن نییە. ئاشکرایە، کە هەر شتێك لە فیکر و لەگەڵ بیرکردنەوەدا نەگونجێ و نەکرێتە ئاماژەی دەربڕین، ئەوا لە توانای زاراوە و دەستەواژەشدا نییە بەئاسانی لەخۆیدا بیگونجێنێ.

یەکێك لە بەڵگە بنەڕەتییەکانی کەمتوانایی لەدەربڕینی مانا و ڕاستیە عیرفانییەکان، تا جیاوازی و نەتوانایی دیاریکردنی ئەو حەقیقەت و مانایانەیە، بەواتایەکی دیکە، زەمینەی کار و کارایی زمان تا ئاستێکە، کە لەسەر بنەمای تایبەتمەندی و جیاوازی شتەکان بەهۆی نیشانە جیاوازەکانیانەوە بتوانێت کەرەسە و تەنەکان لەیەکتری جیابکاتەوە و لێیان بدوێ، ئەمەش لە تایبەتمەندییەکانی فرەیی و جیاوازی جیهانی ماددەیە لەکاتێکدا، کە عارف لە سنووری هەستەکان و جیهانی ڕەنگ و بۆن دەگوزەرێ و بەجیهانی یەکبوون دەگات، کە لەوێ هەموو ڕەنگ و نیشانەکان، تایبەتمەندی خۆیان لەدەست دەدەن.

---

[٤٧٠] سید محمد راستگو، تجلی قرآن وحدیث و شعر فارسی، کیهان فرهنگی، سال هفتم، شماره ١٢، ١٣٦٩ هـ.ش. ل٢٩.

# ئەنجام

دوالیزمی دژیەك بنەما و بنەڕەتێکی هەیە لە ڕەوانبێژی کلاسیکدا، کە بە (طباق) دژیەك ناسراوە و ئەمجۆرەش تەنها کار لەسەر ئەو دوو وشەیە دەکات، کە لە بەیتێکدا دێن و لەڕووی واتاییەوە دژن، کە ئەمەش تەنها قەتیسکردنی وشەیە لە چوارچێوەیەکی سنووردار و بێ مەودادا، کە ئەو ڕێژەنو فەڕەی واتای لێ ناکەوێتەوە، کە دەقە نەمرەکانی شیعری پێ نووسراون.

لە ئەدەبی هاوچەرخ و ڕەخنەی ئەدەبی هاوچەرخدا دوالیزمی دژیەك بە هەموو جۆرەکانیەوە (دژیەك – تضاد، دوانەی ناکۆك – متناقض، پارادۆکس...هتد) جگە لەوەی ستایلێکی دەربڕینە، ڕەوش و میتۆدێکی ڕاڤە و لێکۆڵینەوەیشە بۆ دەق.

دوالیزمی دژیەك تایبەتمەندیەکی بنەڕەتی بوونە و بنەمایەکی سەرەکی جیهانبینی ئایینی و ڕێچکە و ڕێبازی لێکۆڵینەوەی فەلسەفەی کلاسیك و مۆدێرن و عیرفانە. لە ئەدەب و شیعردا تەنها هونەرێکی ڕووکەش نییە، بەڵکو بزواو و بزوێنەری داهێنانی فیکر و خەیاڵی شیعری و هونەری دەربڕینی مانا گران و قووڵەکانی ئەدەبیاتی پڕ لە شکۆی عیرفانی و ئەدەبیاتی مۆدێرنە.

هەروەها لە لێکۆڵینەوەکانی ڕەخنە و توێژینەوەدا بە زمانی عەرەبی و بەتایبەتی فارسی و جیهانی ڕۆژئاوادا دوالیزمی دژیەك میتۆدێکە نەك تەنها لە

بواری ئەدەبناسیدا، بەڵکو لە بوارەکانی دیکەی زانست و مەعریفەشدا برەو و بایەخی تایبەتی هەیە.

ئێمە وەك سەرەتا و چوونە ناوەوەیەکی کۆنکرێت و پوخت بۆ دانانی بناغەیەکی تیۆری ڕانانێکی سەرجەمی و کورتی "دوالیزمی دژیەك"مان کردووە و دوای ئەوە لە هەردوو بەشی دووەم و سێهەمی پراکتیکیی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا (٢٢٣) بەیت هۆنراوەی مەولانا و مەولەویمان لەڕوانگەی دوالیزمی دژیەکەوە ڕاڤە کردووە، کە لەسەر بنەمای چەند جۆرێکی هونەرەکانی ڕەوانبێژی خستومانەتەڕوو، کە بێگومان لە چوارچێوەی پۆلێنبەندیی دوالیزمی دژیەکدا بووە بۆ جۆرەکانی (واتایی و ڕۆنانی) و پاشان (ئاشکرا و نادیار) و دواتر (ناوەڕۆکی و ئیستاتیکیی).

ئەم هەوڵە پراکتیکییانە لەسەر هۆنراوە پڕ شکۆ و چێژدار و لێوانلێو لە بەها ئیستاتیکییەکانی شیعری مەولانا و مەولەوی ئەنجامدراون، کە هەر لەم ڕوانگەیەوە ڕاستی و ئەو ئەنجامەمان بۆ دەردەکەوێت، کە مەولەوی تاوەگۆزی پایەیەکی بەرزی ئەدەبی عیرفانییە و لە هونەری دەربڕین و ئەفراندندا، خامەی ڕەنگینە.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا هۆنراوەکانی مەولەوی نەك تەنها بوونە بەڵگەی پراکتیکی بۆ هەموو جۆرەکانی دوالیزمی دژیەك وەك جۆرێکی دەربڕین و قووڵایی دەقی عیرفانی، بەڵکو بەپێکەوەهێنان و بەراوردکردنێکی لەگەڵ هۆنراوەکانی مەولانای ڕۆمیدا، ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە: شیعری مەولەوی ئاستێکی جیهانیی هەیە و دەتوانرێت دەقی هۆنراوەکانی بە سەرجەم پێوەر و بەها کلاسیك و مۆدێرنەکان خوێندنەوەی بۆ بکرێت و وەك نموونەیەك لە ئەدەبی باڵای ناوچەکە و جیهان ئەژمار بکرێت. بێگومان ئەمەش بەردەوام

پێویستی بە خوێندنەوەی جیاواز و فرەچەشنی بەرهەمی شیعری مەولەوی هەیە، ئێمە هەوڵمانداوە لەم گۆشەنیگایەوە لیریکی ئەو بخوێنینەوە.

خوێندنەوەی دەقە شیعرییەکانی مەولەوی لەڕوانگەی دوالیزمی دژیەك و بە هەناسە و میتۆدێکی بونیادگەری کراوەوە، زیندوویەتی و بزواوی و زمان و چۆنییەتی دەربڕینی مەولەویمان بۆدەردەخات، چونکە ئاشکرایە بونیادگەری و پاش بونیادگەریش، بۆنموونە لای یۆری لۆتمان، کارکردنە لەسەر زمانی دەق. لە ڕوانگەی (بارت)یشەوە ئیشکردن لەسەر دەق کارکردنە لە زمانی دەقدا و ڕەخنەی ئەدەبیش زمانە و زمانیش پێکهاتەیەکی تا ئاستێك هەمەلایەن و بەرفراوان و سەربەخۆیە...

لێرەوەیە، کە لە چۆنییەتی زمانی دەربڕینی مەولەویدا پەیوەندییەکی زیندووی واتابەخش لەنێوان کەرەستەکاندا بەدی دەکەین و دوالیزمی دژیەکیش وەك وشە و چەمکە جیاوازەکانی، یاخود دژبەیەکەکانی نێو دەق، دەربڕی واتا و چەمکە قووڵەکانی جیهانبینی ئەم شاعیرەن.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا لەبەر ڕۆشنایی ئیستاتیکیی دوالیزمی دژیەکدا مامەڵەمان لەگەڵ دەقە شیعرییەکانی هەردوو شاعیردا کردووە، کە بێگومان بەشێکە لە ڕەهەندەکانی ئیستاتیکیی شیعریی بەگشتی و لای مەولانا و مەولەوی بەتایبەتی، ئەمە جگە لەوەی بیری ڕەنگدانەوەی یەزدانیمان وەك تایبەتمەندیی ئیستاتیکیی هەردوو شاعیر خستۆتەڕوو، کە دواجار کاریگەری هەیە بۆ خەیاڵ وەك کەرەسەیەکی ئیستاتیکیی و میوزیکی شیعریی و وەك دوو دەرهاویشتەی دیکەی ئیستاتیکیی دوالیزمی دژیەك.

## سەرچاوەکان

أ- **کتێب:**

- **بە کوردی:**


١. قورئانی پیرۆز.

٢. ئینجیلی پیرۆز، چاپخانە زانکۆی صلاح الدین- هەولێر ١٩٩٨ ز.

٣. ئابادانی، عەبدوڵڵا موبلغی، مێژووی ئایینی زەردەشت. وەرگێڕانی بۆ کوردی: وریا قانیع خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی قانیع، چاپی دووەم.

٤. د.حسێن هیمداد. ڕێبازە ئەدەبییەکان، چاپخانەی دەزگای ئاراس، چاپی یەکەم، ٢٠٠٧ز.

٥. رزا، هاشم، زەردەشت و ئامۆژگارییەکانی. وەرگێڕانی: م. گۆمەیی، چاپخانەی تیشك، سلێمانی ٢٠٠٠ ز.

٦. پرۆفیسۆر، ر.س.زێهنەر، پوختەیەك لە بیروباوەڕی زەردەشتی، وەرگێڕانی: ئازاد حمە شریف، چاپخانەی ماردین- هەولێر ٢٠٠٠ ز.

٧. سەقزی بابان، زەردەشت هیوای ڕزگاری، بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی ٢٠٠٦ ز.

٨. سەواح، فیراس، خواوەند و شەیتان، وەرگێڕانی: بەختیار عەزیز، چاپخانەی ڕۆژهەڵات- هەولێر، چاپی یەکەم ٢٠١١ ز.

٩. سەید حسێنی، ڕەزا. قوتابخانە ئەدەبییەکان. و: حەمە کەریم عارف، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چاپی یەکەم، ٢٠٠٦ز.

١٠. د.عەبدوڵڵا مستەفا، ئیدریس. لایەنە ڕەوانبێژییەکان لە شیعری کلاسیکی کوردییدا، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، ژمارە ١٠٧. چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠١ز.

١١. پ.ی.د.عبدالقادر حمەامین محمد، ئەدەب و ڕێبازەکانی ئەورووپی–کوردی، سلێمانی ٢٠١١ز.

١٢. د.قادر محەمەد. ئەنوەر. لیریکای شاعیری گەورەی کورد (مەولەوی). دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی سێهەم، سلێمانی، ٢٠٠٧ز.

١٣. قەرەداغی، عەبدوڵڵا، زەردەشت، چاپخانەی تیشك، چاپی دووەم، سلێمانی ٢٠٠٧ ز.

١٤. مەولەوی تاوەگۆزی، دیوانی مەولەوی. کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی و لەسەر نووسینی: مەلا عەبدولکەریمی مودەریس. انتشارات کردستان – سنە، چاپی یەکەم، ١٣٨٩ هـ.ش.

١٥. مەولەوی تاوەگۆزی، دیوانی مەولەوی، لەسەر بناغەی تێکۆشانی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، پێداچوونەوە و ڕێك و پێك کردن و زیادکردنی شیعرە چاپ نەکراوەکان: حەسەن گۆران و محەمەد حیجازی، دەزگای ڕۆشنبیریی گۆران، چاپی یەکەم، ٢٧٠٤ی کوردی.

١٦. کەرەسەی کۆرسی دووەمی دکتۆرا بۆ خوێندکارانی ئەدەب (٢٠١١ – ٢٠١٢ز) بەشی کوردی، کۆلیژی زمان، زانکۆی سلێمانی، کە بەشێکە لە کتێبی (ئیستاتیکا)ی (یوری بۆریڤ)، کە بەزمانی ڕووسی نووسراوە و لە مۆسکۆ ساڵی ١٩٨١ چاپی سێهەمی بۆکراوە و لەلایەن (د.ئەنوەر قادر محەمەد)ەوە وەرگێڕدراوە و ئامادەکراوە وەك کەرەسە و بابەتی کۆرس.

- به عه‌ره‌بی:

١٧. د.ابواليل، أمين. علوم البلاغة (المعاني والبيان والبديع)، دار البركة للنشر والتوزيع، عمان – الأردن، ٢٠٠٦م.

١٨. د.ابوسالم، أيناس محمود عبدالله. نقد النقد، عالم الكتب الحديث، الأردن، الطبعة الأولى، ٢٠١٢م.

١٩. أدونيس. الصوفية والسوريالية، دارالساقي، بيروت – لبنان، الطبعة الرابعة، ٢٠١٠م.

٢٠. ابو يعقوب سكاكى، مفتاح العلوم، مطبعة مصطفى البابي الحلبي، القاهرة، ١٩٧٣.

٢١. د.امام، عبدالفتاح امام. المنهج الجدلي عند هيجل، دار المعارف بمصر – القاهرة، الطبعة الأولى، ١٩٨٧م.

٢٢. د.امام، عبدالفتاح امام. معجم ديانات واساطير العالم. ج١، مكتبة المدبولي، ٢٠٠٨م.

٢٣. د.امام، عبدالفتاح امام. معجم ديانات واساطير العالم. ج٢، مكتبة المدبولي، ٢٠٠٨م.

٢٤. د.امام، عبدالفتاح امام. معجم ديانات واساطير العالم. ج٣، مكتبة المدبولي، ٢٠٠٨م.

٢٥. بارت، رولان. قراءة جديدة للبلاغة القديمة، ترجمة: عمر أوكان، رؤية للنشر والتوزيع، ٢٠١١م.

٢٦. البخاري، ابي عبدالله البخاري. مختصر صحيح البخاري، دار نوبليس، بيروت، ٢٠٠٨م.

٢٧. د.بشير، كمال. التفكير اللغوي بين القديم والحديث، دار غريب – القاهرة، ٢٠٠٥م.

٢٨. د.التونجي، محمد. اليزيديون واقعهم وتأريخهم ومعتقداتهم، المكتبة الثقافية، بيروت، الطبعة الأولى، ١٩٩٥م.

٢٩. جاكسون، ليونارد. بؤس البنيوية، ترجمة: ثائر ديب، الطبعة الثانية، دار الغرقد، ٢٠٠٨م.

٣٠. جوف، فانسان. الأدب عند رولان بارط، ترجمة وتقديم: د.عبدالرحمن بوعلى، دارالحوار، الطبعة الأولى، ٢٠٠٤م.

٣١. حسين، عبدالحميد. الأصول الفنية للأدب، عالم الكتب الحديث للنشر والتوزيع، ٢٠٠٨م.

٣٢. الدّملوجي، صديق. اليزيدية، مطبعة الأتحاد، موصل – العراق، ١٩٤٩م.

٣٣. ريجاردز. مبادئ النقد الأدبي، ترجمة وتقديم: د.محمد مصطفى البدوي، مراجعة: لويس عوض، المؤسسة العامة للتأليف والترجمة والنشر – القاهرة، ١٩٦٣م.

٣٤. زيدان، محمود. نظرية المعرفة عند مفكري الأسلام، مؤسسة الرسالة، الطبعة الأولى، ٢٠٠١م.

٣٥. د.سعدالله، محمد سالم. ماوراء النص، عالم الكتب الحديث للنشر والتوزيع، الطبعة الأولى، ٢٠٠٨م.

٣٦. سلامة، بولس. الصراع في الوجود، دارالكتب اللبناني، بيروت – لبنان، الطبعة الثالثة، ١٩٧٣م.

٣٧. السواح، فراس. الرحمن والشيطان، دار علاءالدين للنشر – سورية، دمشق، الطبعة الثالثة، ٢٠٠٤م.

٣٨. السواح، فراس. الوجه الآخر للمسيح. منشورات دار علاءالدين، سورية – دمشق. الطبعة الأولى، ٢٠٠٤م.

٣٩. السواح، فراس. دين الانسان، منشورات دار علاءالدين، دمشق – سوريا، الطبعة الرابعة، ٢٠٠٢م.

٤٠. السواح، فراس. طريق اخوان الصفا، منشورات دار علاءالدين، دمشق – سوريا، الطبعة الأولى، ٢٠٠٨م.

٤١. السواح، فراس. مغامرة العقل الأولى، منشورات دار علاءالدين، دمشق – سوريا، الطبعة الثالثة عشر، ٢٠٠٢م.

٤٢. الشهرزوري، يادگار لطيف. المفاتيح الشعرية (قراءة اسلوبية في شعر بشار بن برد)، دار الزمان للطباعة والنشر والتوزيع، سوريا، الطبعة الأولى، ٢٠١٢م.

٤٣. د.صليبا، جميل. المعجم الفلسفي. دار الكتب اللبناني، بيروت، الطبعة الأولى، ١٩٧١م.

٤٤. د.عباس، فضل حسن. البلاغة فنونها وأفنانها (علم البيان والبديع) دار الفرقان للنشر والتوزيع، عمان – الأردن، الطبعة الأولى، ١٩٨٧م.

٤٥. عزام، محمد. النص الغائب، عالم الكتب الحديث – الأردن، ٢٠١١م.

٤٦. د.عوض، يوسف. نظرية النقد الأدب الحديث، ط١، الأمين – القاهرة، ١٤١٤ هـ.ق.

٤٧. غالب، مصطفى. في سبيل موسوعة فلسفية. من منشورات دار و مكتبة الهلال، بيروت، ١٩٧٩م.

٤٨. الغزالي، ابوحامد. فضائح الباطنية، تحقيق وتقديم: عبدالرحمن بدوي، إصدار مؤسسة دار الكتب الثقافية — الكويت.

٤٩. د.كامل ومجموعة من المؤلفين. الموسوعة الفلسفية المختصرة، مكتبة النهضة — بغداد.

٥٠. د.مداس، احمد. لسانيات النص، عالم الكتب الحديث للنشر والتوزيع، ٢٠٠٧م.

٥١. مجموعة من المؤلفين، موسوعة العراق الحديث، مكتبة النهضة، ج٢، الطبعة الأولى، ١٩٨٩م.

٥٢. هارلند، ريتشرد. مافوق البنيوية، ترجمة: حسن حمامة، دار الحوار، سورية، الطبعة الثانية، ٢٠٠٩م.

٥٣. د.هلال، محمد غنيمي. نقد الأدب الحديث، دار النهضة — مصر، ١٩٧٣م.

٥٤. د.الوكيلى، محمد عزيز. المدارس الباطنية، دار الحوار للنشر والتوزيع، الطبعة الأولى، ٢٠٠٧م.

- به فارسى:

٥٥. احمدى، بابك. حقيقت و زيبايى (مدارس هاى فلسفه هنر)، نشر مركز — تهران، چاپ بيستم، ١٣٩٠ هـ.ش.

٥٦. احمدى، بابك. ساختار هرمنوتيك، گام نو، چاپ سوم، ١٣٨٣ هـ.ش.

٥٧. استيس، والترت. عرفان و فلسفه، ترجمة: بهاءالدين خرمشاهى سروش — تهران، چاپ هفتم، ١٣٨٨ هـ.ش.

٥٨. ايزد پناه، مهرداد. آشنايى با اديان قديم هند، انتشارات محور، چاپ اول، ١٣٨١ هـ.ش.

٥٩. بارت، رولان. نقد و حقيقت، ترجمة: شيرين دخت دقيقيان، نشر مركز – تهران، چاپ پنجم، ١٣٩٠ هـ.ش.

٦٠. برتلس، يوگنى ادوارد ويچ. ترجمة: سيروس ايزدى، مؤسسهٔ انتشارات امير كبير – تهران، ١٣٨٧ هـ.ش.

٦١. بنى صدر، ابوالحسن. تضاد و تناقض، نوفل لوشاتو، چاپ دوم، كتابخانه جمهورى اسلامى.

٦٢. التفتازاني، سعدالدين. شرح المختصر، انتشارات دار الحكمة، چاپ أمير، چاپ سوم، ١٣٦٠ هـ.ش.

٦٣. جلال الدين محمد بلخى، مولانا. غزليات شمس تبريزى، مقدمه گزينش و تفسير: محمد رضا شفيعى كدكنى، جلد اول. انتشارات سخن – تهران، چاپ سوم، ١٣٨٧ هـ.ش.

٦٤. جلال الدين محمد بلخى، مولانا. غزليات شمس تبريزى، مقدمه گزينش و تفسير: محمد رضا شفيعى كدكنى، جلد دوم. انتشارات سخن – تهران، چاپ سوم، ١٣٨٧ هـ.ش.

٦٥. جلال الدين محمد بلخى، مولانا. كليات شمس تبريزى، انتشارات اشارات طلايى، چاپ اول، ١٣٩٠ هـ.ش.

٦٦. چامسكى، نوام. زبان و ذهن، ترجمه: كورش صفوى، انتشارات هرمى – تهران، چاپ پنجم، ١٣٩٠ هـ.ش.

٦٧. راسل، برتراند. عرفان و منطق، ترجمهٔ نجف دريا بندرى، انتشارات ناهيد چاپ گلشن، چاپ سوم، ١٣٨٤ هـ.ش.

٦٨. زرين كوب. پله پله تا ملاقات خدا، انتشارات علمى – تهران، چاپ ششم، ١٣٧٣هـ.ش.

٦٩. زرين كوب، عبدالحسين. ارزش ميراث و صوفيه، انتشارات سخن، چاپ چهارم، ١٣٨٩هـ.ش.

٧٠. زمانى، كريم. ميانگر عشق (شرح موضوعى مثنوى معنوى مولانا جلال الدين محمد بلخى) نشر نى – تهران، ١٣٨٢ هـ.ش.

٧١. سارتر، ژان پل. ادبيات چيست، ترجمه ابوالحسن نجفى و مصطفى رحيمى، انتشارات نى – تهران، ١٣٥٢ هـ.ش.

٧٢. سبزيان مراد آبادى، سعيد. فرهنگ نظريه و نقد ادبى، واژگان ادبيات و حوزه‌هاى وابسته، انتشارات مُرواريد، چاپ اول، ١٣٨٨، هـ.ش.

٧٣. د.سروش، عبدالكريم. بسط تجربه نبوى، مؤسسه‌ٔ فرهنگى صراط، تهران، ١٣٧٨هـ.ش

٧٤. د.سروش، عبدالكريم. ذكر جميل سعدى، انتشارات حكمت، چاپ اول، ١٣٥٧ هـ.ش.

٧٥. د.سروش، عبدالكريم. نقدى و در آمدى بر تضاد ديالكتيكى، انتشارات حكمت، چاپ اول، خرداد، ١٣٥٧ هـ.ش.

٧٦. سلدن، رامان و ويدسون پيتر. راهنمايى نظريه اى ادبى معاصر، ترجمة: عباس مخبر، چاپخانه طرح نو، چاپ سوم، ١٣٨٤ هـ.ش.

٧٧. سهروردى، شهاب الدين يحيى. مجموعه مصنفات شيخ الأشراق، تصحيح سيد حسين نصر أنجمن، فلسفه ايران و انستيتوى ايران و فرانسه، چاپ دوم، ١٣٥٥، هـ.ش.

٧٨. د.شريعتى، على. تأريخ و شناخت اديان، ج٢، انتشارات قلم، ١٣٨٣ هـ.ش.

٧٩. د.شريعتى، على. فرهنگ لغات، شركت انتشارات قلم، چاپ چهارم، ١٣٨٣ هـ.ش.

٨٠. د.شفيعى كدكنى، محمد رضا. در عشق زنده بودن (گزيدهٔ غزليات شمس)، انتشارات سخن – تهران، چاپ اول، ١٣٨٨ هـ.ش.

٨١. شفيعى كدكنى، محمد رضا. دستور زبان عرفانى و عرفان دستور زبان، طرح نو – تهران، چاپ اول، ١٣٧٤ هـ.ش.

٨٢. شفيعى كدكنى، محمد رضا. دفتر روشنايى (از ميراث عرفان بايزيد بسطامى) سخن – تهران، چاپ دوم، ١٣٨٤ هـ.ش.

٨٣. شفيعى كدكنى، محمد رضا. صور خيال در شعر فارسى، مركز پخش، كتاب گزيدهٔ، چاپ چهارم، ١٣٩٠ هـ.ش.

٨٤. شفيعى كدكنى، محمد رضا. موسيقى شعر، مركز پخش، كتاب گزيدهٔ، چاپ دوازدهم، ١٣٨٩ هـ.ش.

٨٥. شفيعى كدكنى، محمد رضا، شاعير آينه‌ها (بررسى سبك هنرى و شعر بيدل)، كتاب گزيده، چاپ ششم، ١٣٦٦ هـ.ش.

٨٦. د.شميسا، سيروس. نگاهى تازه به بديع، نشر ميترا، چاپ چهارم، ١٣٩٠ هـ.ش.

٨٧. طوسى، نصيرالدين. اساس الأقتباس، به تصحيح مدرس رضوى، دانشگاه تهران، ١٣٢٦ هـ.ش.

٨٨. عميد، حسن. فرهنگ فارسى عميد، مؤسسهٔ انتشارات امير كبير، تهران، ١٣٧٩ هـ.ش.

٨٩. غزالی، احمد وباخرزی، سيف الدين. دو رسالەی عرفان در عشق، به كوشش ايرج افشار، بی چا – تهران، ١٣٥٩ هـ.ش.

٩٠. غزالی، احمد. سوانح، تصحيح: نصرالله پورجوادی، بنياد فرهنگ ايران – تهران، ١٣٥٩هـ.ش.

٩١. د.فاطمی، سيد حسين. تصويرگری در غزليات شمس، مؤسسهٔ انتشارات امير كبير – تهران، ١٣٧٨ هـ.ش.

٩٢. د.فشاركی، محمد. نقد بديع – سازمان مطالعه وتدوين كتب علوم انسانی دانشگاهها، مركز تحقيق و توسعهٔ انسانی، چاپ چهارم، ١٣٧٩، هـ.ش.

٩٣. فلوطين. دوره آثار، برگردان م.ح.لطفی، انتشارات مركز – تهران، ١٣٦٦ هـ.ش.

٩٤. د.فولادی، عليرضا. زبان عرفان، انتشارات سخن باهمكاری انتشارات فراگفت، ١٣٨٩هـ.ش.

٩٥. فيضی، كريم. شعاع شمس (غزليات شمس تبريزی به روايت دكتر دينانی)، جلد اول، انتشارات اطلاعات، چاپ اول، ١٣٨٩ هـ.ش.

٩٦. فيضی، كريم. شعاع شمس (غزليات شمس تبريزی به روايت دكتر دينانی)، جلد دوم، انتشارات اطلاعات، چاپ اول، ١٣٨٩ هـ.ش.

٩٧. د.كاميار، تقی الدين وحيديان. بديع از ديدگاه زيبايی شناسی، چاپ چهارم، ١٣٨٨هـ.ش.

٩٨. لائودزو دائو. راهی برای تفكر، برگردان وتحقيق، دائوده جينگ، ترجمة: ع.پاشايی، نشر چشمه، چاپ پنجم، ١٣٩٠ هـ.ش.

٩٩. د.محبتی، مهدی. بدیع نو هنر ساخت و آرایش سخن، انتشارات سخن، چاپ دوم، ١٣٨٦ هـ.ش.

١٠٠. د.مهر، فرهنگ. فلسفه زردشت، چاپ دیبا، چاپ هشتم، ١٣٨٤ هـ.ش.

١٠١. مولا صدرا، محمد ابراهیم (صدرالدین شیرازی). اسفار اربعة، مؤسسهٔ انتشارات حکمت، چاپ اول، ١٣٨٣ هـ.ش.

١٠٢. مولانا رومی، جلال الدین محمد بلخی. مثنوی معنوی، انتشارات الهام – تهران، چاپ اول، ١٣٨٦هـ.ش.

١٠٣. د.ناتل خانلری، پرویز. وزن شعر فارسی، انتشارات سخن تهران، ١٣٥٣ هـ.ش.

١٠٤. د.ناتل خانلری، پروین، شعر و هنر، انتشارات سخن – تهران، ١٣٥٣ هـ.ش.

١٠٥. نیوتن، اریك. معنی زیبایی، ترجمهٔ پرویز مرزبان، بنگاه ترجمه ونشر كتاب – تهران ١٣٤٢ هـ.ش.

١٠٦. هارلند، ریچارد. درآمدی تأریخی بر نظریه ادبی – از افلاطون تا بارت. ترجمة: علی معصومی و شاپور جوکش، چشمه، چاپ دوم، ١٣٨٥ هـ.ش.

١٠٧. الهاشمی، احمد. جواهر البلاغة، مرکز انتشارات دفتر تبلیغات اسلامي – حوزهٔ قوم، چاپ سوم، ١٣٧٠ هـ.ق.

١٠٨. همایی، جلال الدین. فنون بلاغه و صناعات ادبی، ناشر اهوار، چاپ اول، ١٣٨٩ هـ.ش.

١٠٩. ویستر، راجر. پیش درآمدی بر مطالعهی نظریهی ادبی، ترجمة: الهه دهنوی، روزگار. چاپ اول، ١٣٨٢ هـ.ش.

١١٠. د.یثربی، سیّید یحیی. عرفان نظری، مرکز انتشارات دفتر تبلیغات اسلامی، حوزه علمیهٔ قم، چاپ ششم، ١٣٨٧ هـ.ش.

١١١. د.یثربی، سیّید یحیی. فلسفه عرفان، مرکز انتشارات دفتر تبلیغات اسلامی، حوزه علمیهٔ قم، چاپ چهارم، ١٣٧٧ هـ.ش.

- به ئینگلیزی:

112. CHRIS BALDIK, Oxford Concise Dictionary of Literary Terms. London, 2004

113. J.A.Cuddon., The penguin dictionary of literary terms and literary theory, penguin books – London, six.

ب-گۆڤار و بلاوکراوە:

١١٤. افرمجانی، علی اکبر احمدی. تعبیرهای ارسطو از اصل تناقض، فصلنامه دانشکدهٔ ادبیات، دانشگاه قم، شمارهٔ سوم و چهارم، ١٣٨١ هـ.ش.

١١٥. د.ایمانپور، منصور. کاملیت جهان و مسئلهٔ شَرّ در اندیشه ابن سینا و ملا صدرا، نشریهٔ دانشگاه تبریز، شمارهٔ ١٩٩ سال ١٣٨٥ هـ.ش.

١١٦. راستگو، سید محمد (خلاف آمد). کیهان فرهنگی، تهران، سال ششم، شماره ٩، ١٣٦٥ هـ.ش.

١١٧. راستگو، سید محمد. تجلی قرآن و حدیث در شعر فارسی، کیهان فرهنگی، سال هفتم، شماره ١٢، ١٣٦٩ هـ.ش.

١١٨. صالحی، مهدی. تضاد یا متناقض نما، مجلهٔ فارسی، دورهٔ ٢٣، شمارهٔ ٤٦. www.ensani.ir

١١٩. صیادی نژاد، روح الله. متناقض نما در شعر معاصر عربی، مجلهٔ زبان و ادبیات عربی، دانشگاه کاشان، شمارهٔ دوم، تابستان ١٣٨٩ هـ.ش.

١٢٠. د.فرخ نیا، مهین دخت. شطح جلوهٔ هنر در زبان تصوف، نشریهٔ دانشکدهٔ ادبیات وعلوم انسانی، شماره ١٠، ١٣٨١ هـ.ش.

١٢١. د.گلی، احمد. متناقض نمایی (پارادوکس) در شعر صائب، فصلنامه پژوهشهای ادبی سال ٥، شمارهٔ ٢٠، تابستان ١٣٨٧ هـ.ش.

١٢٢. مرتضایی، جواد. نقد و تحلیل پارادوکس، مجلهء دانشکدهٔ ادبیات وعلوم انسانی، دانشگاه اصفهان، شمارهٔ ٤٧، ١٣٨١ هـ.ش.

١٢٣. د.مکی نومان مظلوم و د.گۆران صلاح الدین شکر. ثنائیات الاضداد في شعر المتنبي، گۆڤاری زانکۆی کۆیه، ژماره (١١).

١٢٤. هروی، مژده احمد زاده. تحلیل تجربهٔ زیبانگری در مولوی، فصلنامه پژوهشهای ادبی، شماره ٤، تابستان ١٣٨٣ هـ.ش.

١٢٥. وحیدیان کامیار، تقی. متناقض نما (paradox) در ادبیات، نشریهٔ دانشکدهٔ ادبیات وعلوم انسانی دانشگاه فردوسی مشهد، سال بیست و هشتم ١٣٧٦ هـ.ش، شمارهٔ ٤ و٣.

١٢٦. د.یوسفی، غلامحسین یوسفی. تصویر شاعرانه اشیاء در نظر صائب، مجلهٔ ادبیات دانشگاه فردوسی شمارهٔ ٤، سال یکم، ١٣٨٣ هـ.ش.

### ج- ئەنتەرنێت:

١٢٧. اشرافیان مهرآباد، هوشنگ. زبان پارادوکس، سایتی: www.literature-dept.talif.ir

١٢٨. ئەنسایکلۆپیدیا، ئەنتەرنێت.

١٢٩. دیویه دیچز، شیوەهای نقد ادبی.

١٣٠. رشیدی رضا، سایتی هم اندیشی زبان و ادبیات فارسی.

١٣١. سراته البشیر، الخطاب الشعري والثنائیات الضدیة، ینایر ٢٠١١. ئەنتەرنێت.

١٣٢. علی اصغر محمودی. بررسی اندیشه و ذهن در موسیقی شعر باتوجه به غزلیات شمس. سایتی: www.sid.ir

١٣٣. علی محمود آسیابادی، تحلیل ساختاری غزلی از مولوی سایتی: www.sid.ir

١٣٤. د.غلامرضا کریمی فرد، پارادوکس خاستگاه و پیشینهٔ آن در بلاغت عربی.

١٣٥. د.وزبله، فریشته. متناقض نما در غزلیات حافظ، سایتی (تحلیلی خبری عصر ایران)

١٣٦. ویکیبیدیا، الموسوعة الحرة. ئەنتەرنێت.

### د- نامەی ئەکادیمی:

١٣٧. پریسا رضایی، بر رسی تضاد و متناقض نما در اشعار احمد شاملو، پایان نامه کارشناسی ارشد رشته زبان و ادبیات فارسی، دانشگاه کردستان، سال ١٣٨٧ هـ.ش.

# ملخص البحث


يتناول هذا البحث "التضاد الثنائي فى الشعر الغنائي للشاعرين الكبيرين: مولانا جلال الدين الرومي (١٢٠٧-١٢٧٣) و مولوي التاوجوزي (١٨٠٦-١٨٨٢) محاولا اظهار انعكاس هذا المفهوم فى شعرهما".

يتكون البحث من مقدمة و ثلاثة فصول و استنتاج لما توصل له الباحث من خلال دراسته هذه و ثم قائمة باسماء المراجع والمصادر.

ان ظهور هذا المفهوم "التضاد الثنائي" قديم كقدم ظهور الوعي لدى الانسان و تفكيره حول الكون و ماهيات الوجود الانساني، وانعكس في كل المجالات الدينية والفكرية و العلمية و الفنية بمعناها الشامل... ولكن وفي العصر الحديث و في بداية القرن العشرين بالذات، يعود تطوير وتنظير هذا المفهوم الى الاستكشافات اللغوية للعالم اللغوي السويسري فرديناند دى سوسير الذي اكتشف بان المعنى ينبع من الاختلاف و التضاد، وثم قام المفكران الفرنسيان كلاود ليفي شتراوس و رولاند بارث بتطوير افكار سوسير و استنباط نظرية منها سميت بالبنيوية. والتي صارت فيما بعد نظرية و منهجا للبحث الادبي، كما وان الركيزة الرئيسية للبنيوية ما هي الا "التضاد الثنائي".

نشير في مقدمة دراستنا الى اهمية هذا المفهوم السائد في الادب العالمي والاوروبي و باللغة الفارسية و عكس مانراه، اى قلته او حتى عدم وجوده في دراساتنا الادبية باللغة الكردية. و نبين اهمية البحث من الناحيتين النظرية و

العملية. ومن الطبيعى ان منهج البحث بنيوى تكاملي بحكم المفهوم و طبيعة المادة.

كما و قمنا في الفصل الاول باستقراء و عرض سريع لهذا المفهوم في الاديان القديمة و السماوية بفروعها و مذاهبها و فعلنا بالمثل مايخص الفكر و الفن والفلسفة... للتهيئة الى تطبيق هذا المفهوم النقدي في شعر الشاعرين.

طبقنا فى الفصل الثاني ومن منظور الفنون البلاغية منهجنا على مائتين و ثلاثةٍ وعشرين بيتاً من شعر الشاعرين اي وفقا "للتضاد الثنائي" حيث استنتجنا تصنيفا من ثمانية و اربعين نوعا من الاستعمال وفق هذا المبدا.

يتضمن الفصل الثالث من البحث القاء الضوء من الناحية الجمالية و مطابقا لمفهوم "التضاد الثنائي" على مجموعة كثيرة من ابيات الشاعرين و ذلك بعد عرض مسهب لمفاهيم و و مقولات استيتيكية حيث كانت نتائج التطبيق خير دليل على غنى وعمق نتاج الشاعرين الكبيرين. ومن دواعى الفخر لادبنا الكردي بانه قد انجب شاعرا بعبقرية عبدالرحيم التاوجوزى حيث يقف شعره في مستوى شعرمولانا الرومي والذي يعتبر بحق من قمم الادب العالمي.

و نختتم بحثنا بالاستنتاجات التى توصلنا اليها من خلال دراستنا و ثم نقدم اسماء المصادر و المراجع المستعملة من قبلنا.

